حكومەتی هەرێمی كوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوكردنەوە
زنجیرە (٣٤٢)

# بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی

ئامادەكردنی

پەخیزە ڕەفیق حیلمی

پێداچوونەوەو دارشتنەوەی

كەژاڵ ئەحمەد

سلێمانی ٢٠٠٥

# بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی

ئامادەکردنی: ناهیدە ڕەفیق حیلمی

بابەت: بیرەوەری

پێداچوونەوەو داڕشتنەوەی: کەژاڵ ئەحمەد

تایپ: نەرزە خالید

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی ڕوون

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٤٢١)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

www.roshnbiri . org

# پێشەکی

## سوودی نوسینەوەی یاداشت

یـەکێك لـەو سەرچـاوانەی مێـژوونووس کـەڵکی لێ وەرئـەگرێت یاداشـتی بیرەوەرییـە. مێژوونووســی کــورد زۆر ســودیان لــە یاداشــت وەرگرتــووەو بیرەوەریــی گــەلێك لەوبیانیانـەی کـە بـەناو کوردسـتاندا گەشـتیان کـردووە وەك مسـتەر ریـچ، مالیبـارد، جیمس برانـت، سـۆن، ئـەدمۆنز، جیمس پـەکنگهام، کـاپتن نۆئێل و .. مسـتەفا کـەمال ئـەتاتورکیش لـە یاداشـتەکانیاندا گـەلێ زانیارییـان سـەبارەت بـە کـورد نوسـیووە.گـەلێ لەسیاسـەتمەدارە عیراقیـەکانیش یاداشـتیان نووسـیوەتەوە وەك مـزاحم پاچەچـی،کامل چادرچی،ناجی شەوکەت، جەعفەر العسکری‌و هتد.. هەروەها ناظم الطبقچی (کە باسی رەفیق حیلمیشی کردووە).

لــەناو خۆشمانــدا مامۆستامســتەفا نــەریمان وتویــەتی: مامۆسـتا رەفیـق حیلمــی (١٨٩٨-١٩٦٠) یەکـەم کـەس بـووە کـە یاداشـتی خـۆی دەربارەی کـورد و شۆڕشـەکانی شێخ مـەحمودی نـەمر لـە سـاڵانی (١٩٥٦-١٩٥٨) [1] دا نووسـیوەتەوەو لـە پێنج بەرگـدا لەچـاپدراوە. ئـەم زاتـە شـێخی نـەمری کردۆتـە پاڵـەوانی یاداشـتەکانی و ڕووداوەکـانی لەسایەی ئەودا هۆنیوەتەوە و بەکوردییەکی ڕەوان داڕشتووە، بەهەشتیی رەفیـق حیلمـی لەچـلەکاندا سـەرۆکی بـاڵای هیـوا بـووە. تاسـەری ناوەتـەوە.کوردایـەتی کـردووە بـەڵام

[1] -یاداشتەکانی رەفیـق حیلمـی ئەوکاتـەپێنج بـەرگی بڵاوکرابـۆوە، ئـەوەتا مامۆسـتا نـەریمان خـۆی لـە لاپـەڕە(١٠)ی کتێبی(بیرەوەرییـەکانی ژیـانم) دا لـە پـەراوێزەکانی بەشـی یەکەمیدا نووسـیویەتی(٦) بـەرگی یاداشتی رەفیـق حیلمـی پاش کۆچـی دوایـی لەچاپدراونەتەوە دیـارە زانیویـەتی کـە خـۆی شـەش بـەرگی بڵاوکردۆتەوە لە ژیانیدا نەك پێنج . هـەروەها وتویـەتی کـە بـەرگی(٧) ی پاش خـۆی لەچاپدراوە.ئەمـەیان رەفیق حیلمی خۆی ئامادەی بۆکردبوو بەڵام پێ رانەگەیشت لەچاپیبدا دوایی لەچاپدرا.

**تائەمڕۆ یاداشتی ڕەفیق حیلمی دەربارەی ساڵانی دیکەی تێکۆشانی بڵاونەکراوەتەوە، وەك هیچیکەی دەربارەی خۆی نەنوسیبێت وەهایە[٢].**

[٢]ڕەفیق حیلمی خۆی نووسیویەتی بەتەمایە یاداشتەکانی بگەنە(١٨) بەش (بەرگ) بەڵام بەداخەوە فریانەکەوت ئەوبەشانە لەچاپبدات، هیچ دەستنوسێکی نیە بۆ ئەوانە، وەك دەرئەکەوێت لەوەڵامی کاك جەمال بابانـدا بۆ پرسیارەکانی د.موکەڕەم تاڵەبانی بەناوی فایەق هۆشیارەوە وتوویەتی( هەرچی سەبارەت بەپارتی هیوا لای ڕەفیق حیلمیی بووە لە٣ سندوقی تەختەدابوون لەماڵی خەزوری ڕەفیق حیلمی،پاش هیوا فایەق هۆشیارو مەحمود خەفاف بردویانەتە ماڵی فایەق هۆشیار و چیان تیابووە سوتاندویانە دوورنیە ئەو بەشانەی یاداشتەکانی کە بڵاونەکراونەتەوە لەوێدابووبن ئەوانیش سووتابن بۆیە نەمانتوانیوە یاداشتەکانی بۆ تەواوبکەین هەرچەندە لاپەڕە دەستخەتی تری کە دۆزیومانەتەوە لێرەدا بڵاویاندەکەینەوە، بەڵکو لەگەڵ ئەو باسانەی لەدایکمان و پورمان‌و کەسوکاروهاوڕێیانمان دەسکەوتووە یارمەتیمانبدەن تاهەندێك لەو کەلێنەی کەوتۆتە زنجیرەی ژیانیەوە پڕبکەینەوە. بەپێی توانا چیم دەستکەوتووە دەیخەمە ئەم کتێبەوە بەئومێدی ئەوەی ئەو زنجیرە پچڕپچڕە زیاتربهێنمەوەیەك سەبارەت بەژیانی تایبەتیی وژیانی سیاسیی ڕەفیق حیلمی.

# ڕەفیق حیلمی .. ئەستێرە گەشەی ئاسۆی وێژەوخەبات

ئەوەی بیەوێت دەستبکات بەنووسین سەبارەت بەخوالێخۆشبوو ڕەفیق حیلمی سەری لێدەشێوێت بەرامبەر بەم لافاوە لە بابەت ونوسین کەدەربارەی نووسراون، بەشیعرو پەخشان و بەزمانی عەرەبیی وکوردیی.. دەبینێت کە هەرچەندە مەلەوانی باشیش بێت هەر ئەوەندەی خۆی هاویشتە ناو باوەشی نووسین هەست دەکات شەپۆلە هەڵچووەکان دەیهێنن ودەیبەن و ڕەشەبا و گێژەڵوکە پەلاماری دەدەن، لولی دەدەن، تا لە خۆی ون دەکەن.. کەنزیك بۆوە لەقەراغ دەریاکە.. بەرتاشەبەردەکانی دەکەوێت.

ئەگەر بپرسن کێن ئەوانەی لەسەریاننووسیوە؟!پێتان دەڵێم (زۆرن) بەڵێ زۆرن.. ئەوانەی ئەم ڕێگەیەیان گرتۆتە بەر، هەرچەند زانیویانە بەکۆسپ وچەڵەمەیە چونکە ئەم ڕێگەیە هەمیشە گران ودڕکاوی بووە! هەرئەوەندەی پێیەکان هەڵخلیسکێن.. خاوەنەکەی دەفەوتێت.. یان دەکەوێتە ناو بیرێکەوە ، چونکە باسی ڕەفیق حیلمی واتا باسی خەباتی گەلان بۆ وەرگرتنی مافیان.

ئەوانەی دەربارەی ڕەفیق حیلمی نووسیویانە جۆراوجۆربوون لەڕووناکبیریی و لە بیروباوەڕو لەتەمەن و لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لەناو ئەمانەدا مێژونووسن، شوێنەوارناس، خاوەنی پلەی بەرز هەن لە ئیش وکاری میریدا وەك ڕووناکبیرانی نەمر مامۆستا ئەمین زەکی بەگ وتۆفیق وەهبی بەگ و دانەرانی کتێبی مێژوویی و ئەدەبیی بەنرخ، خاوەن بڕوانامەی بەرزومامۆستایانی زانکۆکانمان، هاوڕێ و هاوکارو هاوخەبات و ئەندامانی ئەو پارتانەی کە دایمەزراندون یائەندامی سەرەکیی بووە تیایاندا، یاخۆی سەرۆکیان بووە هەروەها ئەو بیانیانەی لەوڵاتانی ترەوە هاتوون لەوبیانیانە کە لەعیراقدا کاریانکردووە لەسەردەمی عوسمانیی و ئینگلیزدا لەوانەی بەدوای مێژوی سیاسیی و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی و پێشکەوتن و مافی نەتەوەکاندا گەڕاون و لەشاعیرو ئەدیبەکانمان وەك لەم کتێبەدا دەیبینین هەندێکیان شیعریان

بەسەرداهەڵداوە پێش‌وپاش کۆچی دوایی لە ڕۆژنامە نووسان کە زۆربەیان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی خۆیدا لاوانی گەنجی پێگەیشتووبوون لەوانەی بەردەوام بوون لە هەوڵ و تەقەلاو تێکۆشان‌و خەبات‌و باوەڕیان بەمافی گەل‌و نەتەوەکەیان و بەزمانی گەلانی تریش هەبووە وەك ڕەفیق حیلمی خۆی. ئەوانەی ئامادە بوون لەڕێی نیشتماندا ماڵ‌وسامانیان بۆ ژیانی میللەتەکەیان بەختبکەن و یان ژیانی سەربەرزانە بژین یامردنی سەربەرزانە بمرن، تامێژوو ناویان تۆماربکات بەپیتی درەوشەدار و بۆئەوەی وەك ئەستێرەی گەش لاپەڕەکانی مێژوو ڕووناکبکەنەوە... شیرینیی ژیان جارێك وتاڵ‌و ترشییەکەشی چەندین جار بچێژن.. بەرزبونەوەی سەردەمێك بەرەو ئاسۆ وخزانە خوارەوەی لەپڕیش لەڕێیانداوبووە، وەستانی وەك شاخی سەخت بەرامبەر ڕەشەبا و گێژەلووکەی بێئامان، بەرامبەر سەرماوسۆڵەو بەفرو تەرزەی زستانی سەخت و تەقینەوەی گردە ئاگرینەی بە قوڵپ و بەجۆشی و وێرانی‌و فەوتانی سەرو سامانیان...ڕەنج وتێکۆشانیان‌و هەوڵ‌و تەقەلای ساڵانیان‌و دامرکانەوەیان بەجەوری زەمان و بەغەدری ئینسان... تاسەر لەنوێ درزێکی تر، یان دەرگایەکی تر، لەلایەکەوە پەیدادەبێت و دیسان لەسەرەوە وەك گردە ئاگرینە دەتەقێتەوە و هەرچی لەناواخنیا قوڵپی دەدا بە جارێ دەریدەپەڕێنێت‌و هەڵیدەدات بەرەو ئاسمان بە هەڵم‌وهالاّ و بەکڵپەی ئاگرین و لافاوی ئاگرین دێتەخوارێ بەسەرو پۆپی گردە ئاگرینەکەدا و بێ پەروا پەرش‌و بڵاودەبێتەوە بەم لاو ئەولادا هەرچی لەبەر دەمیدایە و بەسەریدا دەڕوا،دارو درەخت‌و دارستان لەبنی هەڵدەکشێت،دەیسوتێنێت ، دەیکات بەخۆڵەمێش لافاوی خۆڵەمێش دێتەخوارێ، ڕەشەبای خاکە خەڵوز هەڵدەکات و بەری ئاسمان دەگرێت، ڕۆژی ڕووناك دەکاتە شەوی دەیجور، نەك هەر دارو درەخت هەرچی تاشەبەردیش هەیە بەسەرگردەکانەوە، هەرچی بینا و خانوبەرەو قەڵاوقوللە هەیە.. هەرچی زەوی و زارو کشتوکاڵ‌و گیانەوەرو ئاژەڵ هەیە.. هەرچی مرۆڤی وردوگەورە هەیە بەیەکجار لولی ئەدا بەلافاوی ئاگرینی و لەگەڵ خاك‌وخۆڵدا دێتەخوارێ بەشان‌وشەپیلکی گردەکەدا بۆ ناو دوڵ‌و چەم‌و ڕووبار...

دیسان دادەمرکێتەوەو دەمەێت، ڕەق دەبێت چین لەسەر چین، هەرچینەی مێژوی سەدەیەك دەگێڕێتەوە... هەرچینەی ئاسۆری سەردەمێکی ژیانی گەل و نەتەوەو

نیشتمانەکەمان تۆمار دەکات، ئەوەی مرۆۋ خۆی ناتوانێت یا ناوێرێت یان ئەگەر بیشی نووسێت دەسڕڕێتەوە، هەروەها بەمجۆرە ژیان دەوران دەور دەکات و کاروانی هەر بەڕێوەیە، بێباك پێ لە ئەودەنێ ودەڕوات هەروەك هیچی نەکردبێت وایە بەلام ئاوازی کەوو قەتیەو جریوەی چۆلەکەکان بەسەر لقوپۆپی تازەی درەختە تازەکانەوە.. نالەوئاهی بەستەزمانان و گریان و شینی دایکی سك سوتاو و باوکی ڕەنجەڕۆ...سیمفۆنیای ئەو ناسۆرانە دەگێڕنەوە و ئاوات و ئامانجی نەمردویان دەلێنەوە و چیرۆکی پالەوان و نەبەزو خۆبەختکارەکان دەگێڕنەوە، بێگومان هەموولایەك دەزانن کە ئەگەر (ڕەفیق حیلمی) ڕۆلی سەرەکیشی نەدرێتێ لە ناو ئەمانەدا جێگەی خۆی هەیە لەدلی گشت دلسۆزێکی گەل و هەموو نیشتمانپەروەرێکدا.

لەدلی ئەوانەدا کە هەمیشە یادیدەکەنەوە، ستایشی دەکەن چالاکی و ڕەوشتی جوان و هەولْ و تەقەلای و یارمەتیدان و پالپشتی کردنی هەژارودااماو و لێقەوماوو ئازایی و نەترسیی و سەربەرزیی و وەستانی مەردانەی لەگشت بوارێکی مرۆڤایەتیی، کۆمەلایەتیی، ڕووناکبیریی، ئیش وکارو یارمەتیی، و خەباتی دلسۆزانەی بێوچانی لەپێناوی نەتەوەو نیشتمانەکەیدا باسدەکەن.(ڕەفیق حیلمی) هێندەی کە بەڕێزو بەرز بوو هێندەش بێ فیز وخاکیی بوو هێندەی خۆی و خێزانی دەستکورت بوون هێندەش بەهەموو جۆرێك یارمەتی خزم و کەس و کاروبێگانەو قوتابی و هاورێ وفەرمانبەری فەرمانگەکەی داوە . لەدەمی خۆی و مالومندالی گرتۆتەوە تاهەژارێك لەبرسا نەمرێت... خەووخۆراك و پشودان و خۆشیی خۆی خستۆتەلاوە تافریای لێقەوماوێ بکەوێت. ئەگەر چاوبگێڕین بەناو گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێب و نامیلکەی عەرەبی و کوردیشدا سەرمانسوڕدەمێنێت لەوەی چی بخوێنینەوە و چی بنووسینەوە سەبارەت بەم کوردە دلسۆزە، لێرەدا هەولدەدەین هەر هێندە هەلبژێرین لەوسامان و گەنجینە فراوانەی کە نووسراوە، لەو تۆمارە تایبەتیانە، کە گەلێك لە گۆڤارو ڕۆژنامە بەتایبەتی تەرخانیانکردووە،بەمەش گولبەندێك دروستدەکەین تا بیخەینە سەر گۆڕە پیرۆزەکەی بەبۆنەی تێپەڕبوونی (٤٤)سالْ بەسەر کۆچی دوایدا کە لە ١٩٦٠/٨/٤ دا کۆچی دوایکردووە بەلام ئێستا کەمن سەرقالی دانانی ئەم کتێبەم، کە لە (٢٠) سالْ زیاترە پێوەی خەریکم، چی هەبووە لەبارەی باوکمەوەو ئەوەی نووسراوە کۆمکردۆتەوە

تابیانکەم بە کتێبێك، چەندە ساکار بێت هەر لەوە باشترە بە پەرش وبلاوی بمێنێتەوە.
ئێستا ئاواتەخوازم ئەم کتێبە لە یادی تێپەڕبوونی (چل و چوار) ساڵ بەسەر کۆچی دوایدا بلاوبکرێتەوەو خۆم بەچاوی خۆم ببینم،ئەوەیش لە ٤/٨/٢٠٠٤ .

لەکۆتایدا ئەوەندە بەسە وتەی یەکێك لە روناکبیرەکانی خۆمان بلێمەوە کەوتویەتی ((لتلد کل الامهات مثلك یا رەفیق حیلمی و نعم ماولدت أم)) واتا ( هەموودایکێ کوڕی وەك تۆی ببێ رەفیق حیلمی ودایك دانیشێت و کوڕی وەهای ببێت) [٥]

---

[٥] بڕوانە تۆماری تایبەتی کۆڕی رەفیق حیلمی ساڵی ١٩٨٥ لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا هەروەها تۆماری تایبەتی لە گۆڤاری (الفجر الجدید).دا

## بابزانین ڕەفیق حیلمی کێیە؟

ئاواتەخوازم بتوانم لێرەدا ئەوە بۆ خوێنەرانی بەڕێز ڕوونبکەمەوە.

زیاتر هەوڵمداوە چی لەبارەی ڕەفیق حیلمی بە کوردیی و عەرەبیی نوسراوە و چی خۆی نووسیویەتی و دەستمانکەوتوون، ئەوانە وەك خۆیان بڵاودەکەمەوە، هەرچەند ئەمە دەبێتە هۆی دووپاتکردنەوەی گەلێك باس بەڵام مەبەستم ئەوەیە.زۆر کەس بەهۆی ئەوەی من کچی ڕەفیق حیلمیم ڕەنگە وابزانن لەبەرهەستی خۆم زیاد لەپێویست ستایشی باوکم دەکەم یاخود خۆم زیادی دەخەمەسەر، بۆیە وتەی خەڵکی تر بەنموونە دەهێنمەوە.

جگەلەوە دەشمەوێت ئەوانەی ئەم باسانەیان نووسیوەتەوە،دڵشادبن بەبینینی نوسینەکەیان لەم کتێبەدا کە باسی کەسێتیەکی واتێکۆشەردەکات. هەروەها چونکە هەریەکەیان، خاوەنی کەسایەتی خۆیانن لە نووسیندا و هەموویان کەڵەپیاوی ئەدەب ومێژوون، لاوەگەنجەکانمان دەتوانن سوود لەنوسینەکانیان وەربگرن.

## بەشی یەکەم
## ژیانی تایبەتیی
## ڕەفیق حیلمی

درەختی هەمزە ئاغای مەسرەف و
ڕەفیق حیلمی و خێزانەکەی

# رەفیق حیلمی و خێزانەکەی بە پێی درەختی خێزانیی

وەك لەدرەختەکەدا دیارە رەفیق حیلمیی کوڕی محەمەد سالّح ئەفەندییە نازناوی (ئامان)ە وەك براکانی تری کوڕی عەبدوللا ئەفەندیی کوڕی حاجی غەفور کوڕی پیرۆزخان کچی قادرئاغا کوڕی حەمەئاغا (برای هەمزەئاغای مەسرەفە)ە. واتە لەباوکی باوکییەوە لەهەمزە ئاغای مەسرەفە دایکی حەلاوەخان کچی مارف ئاغای کوڕی عەزیز ئاغا کوڕی بابەکر ئاغابرای (هەمزەئاغای مەسرەفە). هاوسەری رەفیق حیلمی جەمیلە خان کچی مستەفا ئەفەندی کوڕی عەبدوللا ئەفەندی کوڕی عەزیز ئاغا کوڕی (هەمزەئاغای مەسرەف)ە. دایکی ژنەکەی رەفیق حیلمی عیسمەت خان کچی حاجی بابەکرئاغا کوڕی محەمەد ئاغا کوڕی (هەمزەئاغای مەسرەفە). واتە رەفیق حیلمی خۆشی و خێزانەکەی لەباوکیشەوە و لەدایکیشەوە لە خێزان و خێلّی هەمزە ئاغای مەسرەفن.

لەلایەکی تریشەوە باوکی باپیری لە خێلّی دزەین و ئەمانەش کوردن واتە لە هەردوو سەرەوە رەفیق حیلمی کوردە و تورك نیە وەك هەندێك وتویانە. چونکە لەپێشدا نازناوی کەرکوکیی هەلّبژادووەو کەسوکاری باوکی لە کەرکوك ژیاون و ئەمەش واتای تورك بوونی نیە هەرکەسێك لەکەرکووك لەدایك بووبێ یان ژیابێ پێی وتراوە کەرکووکی. هەمزە ئاغای مەسرەف کورد بووەو لە دانیشتوانی شارەزووربووە لەسلێمانی کوڕ و کچی هەبووە، لەمانە گەلێکیان پیاوو ژنی ناسراوی شاری سلێمانی بوون کە یەکێکیان(پیرەمێرد)ی شاعیروفەیلەسوفی کوردە و ژنەکەشی کەپووری خێزانی رەفیق حیلمی بووە ناوی غەزالە خان بووە و کچەکەی رەحمەخانی دایکی فایەق هۆشیارو ئەحمەد زرنگە ئەویش بێگومان لەخێزانی هەمزەئاغا بووە. چونکە خوشکی باوکی ژنی رەفیق حیلمی بووە کە لەو خێزانەبووە، بابزانین چۆن رەفیق محەمەد سالّح کەلەسەرەتادا لەرۆژنامەکاندا خۆی ناونابوو رەفیق کەرکووکی بووبە رەفیق حیلمی و ئیتر هەر بەم ناوە ناسراو ناوەکەشی هەربەرەفیق حیلمی مایەوە تاکۆتایی ژیانی‌س؟

پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کاتێ رەفیق حیلمی دەچێت بۆ ئەستەمبوڵ، بۆ خوێندن لە ئەنقەرە لە کۆلێژی حەربییە دەخوێنێت، مامۆستایەکی ناوی(عەبدوڵلاحیلمی

پاشا) دەبێت، ئەم مامۆستایە رەفیق حیلمی زۆر خۆشدەوێت لەبەر زیرەکیو چالاکیو رەوشتی جوانی بۆیە نازناوی خۆی(حیلمی) دەداتێ و ئیتر لەوکاتەوە رەفیق حیلمی واز لەنازناوی کەرکووکی دەهێنێت و تەنانەت ناوی باوکیشی بەکارناهێنێتو هەربەناوی رەفیق حیلمی دەناسرێت هەروەها منداڵەکانیشی ئیتر هەر بەم ناوەوە ناسراون و کەس داوای ناوی سیانییان لێناکات هەرچەند سەردەمی جەنگی جیهانیی نازناوی خێزان پێویست بوو بۆ ئەمەش (مەصرەف)و(مەصرەفیمان) بەکاردەهێنا بەڵام پاش ئەوەی ئەمە پێویست نەما گەڕاینەوە بۆلای نازناوەکەی (رەفیق حیلمی)·

# کەسوکاری ڕەفیق حیلمی

وەك چەند جار دووپاتمان کردۆتەوە، باوکم خۆی نەبەزارو نەبەنووسین هەرگیز باسی ژیانی تایبەتی خۆیو کەسوکاری نەکردووە تەنانەت لەیاداشتەکانیشیدا وەك خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان وتویەتی هەر ئەوەندە باسی خۆیکردووە کە پەیوەندیی هەبووە بەخەباتی سیاسیی نەتەوەکەیەوە. ئەوەی لێرەداباسی دەکەم سەبارەت بەژیانی تایبەتی خۆی و کەسوکاری زۆربەیانم لەدایکمانو پورمان کە لەخۆشەویستیدا پێمان دەوت (بجی)(*)و لەخزمو کەسو ناسیاو و هاوڕێو لەنوسینی نووسەراندا و چی وردە باسێکی لاوەکی خۆی نووسیویەتی لە یاداشتەکانیدا وەرمگرتووە.

لەبەرئەوەی هیچی بەدەستخەتیش بەجێ نەهێشتووە لەم لایەنەوە ئەوەی لێرەدا دەینووسمەوە ڕەنگە هەندێك پاشو پێش و کەموکورتی تیابیبنن(تکایە ببورن) زۆرم هەوڵدا تابتوانم کەلێنەکانی پڕبکەمەوە بەڵام هێندە ژیانی ڕەفیق حیلمی سەخت بووە نووسینەوەی مێژووی ژیانی هەر بێ کەلێن نابێت.

باوکی ڕەفیق حیلمی: وەك وتمان ناوی محەمەد ساڵح ئامانە کوڕی عەبدوڵڵا ئەفەندی —لەدایك بوونەکەی بەپێی ئەو بەڵگەیەی کە پیشانمانداوە(١٢٨٠)یە (کەئەشێت ئەم مێژووە هیجریی بێت). ساڵح ئەفەندی باوکی ڕەفیق حیلمی وەك بیستومانە باڵابەرز بووە و وەك لەوتاقە وێنەیەدا کەلەلای باوکمان بووە دیارە باریکەلە بووە. لەسوپای عوسمانیدابووەو هەمیشە چووە بۆ دەرەوە بۆناوجەنگ وبۆسەرسنورو دووربووە لە خێزانەکەی، بۆیە بەتایبەتی پاش مردنی ئەو کوڕەی کەناوی (جەمیل) بووە بەپێنج ساڵیی کۆچی دوایی کردووە لە کاتێکدا خۆی لایان نەبووە ڕەفیق حیلمیودایکیوپورێکیو ئەوبرایەی وئەو کچەی لەکفریی بوون بۆیە دەرودراوسێ کوڕەکەیان ناشتووە دیارە دایکی ڕەفیق حیلمی ئیتر لەگەڵی نەڕۆیشتووە بۆ دەرەوە بۆیە ناچار کەچۆتە دەرەوە ژنێکی تری بەسەر دایکی ڕەفیق حیلمیدا هێناوە. دایکی ڕەفیق حیلمی یەکەم ژنی بووە و ناوی حەلاوەخانە و لەم (٣) کوڕی هەبووە ئەوانیش (ڕەفیق

حیلمی و شەفیق و جەمیل)بوون هەروەها یەك كچی هەبووە بەناوی(عیسمەت). لەمانە هەرعیسمەتمان بینیووە كە ناومان نابوو(بجی).

(شەفیق) هەربەگەنجی ڕۆیشتووە بۆ توركیا ولەوێ لەسوپای عوسمانیدا كوژراوە. كاتێ شەفیقی برای ڕەفیق حیلمی لە ئەستەمبوڵەوە بۆ سەردانیان دەگەڕێتەوە ئەم، لەبەندیخانەی كۆیە بووە، پاش حوكمدارێتی شێخ مەحمود نەیانهێشتووە براكەی ببینێت .ڕەفیق حیلمی پاش بەربوونی لە بەندیخانە لەتوركیا زۆربەدوای براكەیدا گەڕاوە. دوایی پێیان وتووە نەماوە، ڕەفیق حیلمی بەهیچ جۆرێك ناوی ئەم برایەی لای كەس نەبردووە تەنانەت لەلای ئێمەیش. تەنها یەك وێنەی هەیە لەگەڵ ئەم برایەی ئەویش كاتێ كە قوتابیی بوون، دیارە لەئامادەیی عەسكەریی بەجلی عەسكەرییەوە، یەك دوو پسوڵەی پارە كە بەناویەوەن و، یەك نامەبەتوركی لەوەوە بۆ ڕەفیق حیلمی،كارتێكیش لەڕەفیق حیلمییەوە بەتوركی بۆ ئەو، بەداخەوە كەس نەبوو بۆم وەرگێڕێتە سەرزمانی كوردیی. ڕەفیق حیلمی لە خۆشەویستیدا باوكی پێی دەوت (كوڕی لاو)و بەعیسمەتیش دەوت(كچان) ژنی دووهەمی ساڵح ئەفەندی باوكی ڕەفیق حیلمی ناوی ماهیە خان بووە لەناو دەفتەرێكی ڕۆژانەیدا نووسیویەتی ئەمڕۆ ماهیەخانی دایكم كۆچی دوایی كرد، بەمەشدا دەردەكەوێت كە وەك دایكی سەیریكردووە، ئەم ژنە كەركووكیی بووە لەمیش كوڕێك بەناوی (ئیبراهیم) و كچێك بەناوی بەهیەی هەبووە.ئیبراهیمیش بەگەنجیی كۆچی دواییكردووە ئێمە بینیوومانە هەردووكیان زۆر جوان بوون. پورە بەهیە لەساڵانی دوایدا كۆچی دواییكرد ئەممان زوو زوو دەبینی. ساڵح ئەفەندی دیاربوو هەرزوو لەماهیەخان جیابووبووەوەو هەمیشەلای حەلاوەخانی دایكی ڕەفیق حیلمی بوو ساڵح ئەفەندیش هەر زوو كۆچی دواییكرد هەروەها حەلاوەخانی دایكی ڕەفیق حیلمیش.

## حەلاوەخانی دایکی ڕەفیق حیلمی :

یەکەم خێزانی سالّح ئامان باوکی ڕەفیق حیلمی، خۆی و کەسوکاری دانیشتوی سلێمانی بوون. ژنێکی وەك دایکمان ئەیوت، شۆخ و شەنگ و بالاّبەرز و لەسەرخۆو هێمن ونویژ وڕۆژوکەربووە، ئەوەتا کەباسی کۆچی ئەو کوڕە بچووکەیانی کردووە لە کفریی وەك لەیاداشتەکانی ڕەفیق حیلمیدا هاتووە ڕایسپاردووە لای (ئیمام شاسوار) لەسەر ئەو گردە بنێژرێت. هەروەها کەیبانوویەکی دەست ڕەنگین و پاك وخاوێن وئیشکەر بووەو تەنها کەس بووە لە سلێمانی کە مەکینەی خەیاتیی بەکارهێناوەو زۆر جل ومتیل وبەرگەسەرین و شتی جوانیشی پێ چنیووە. ڕەفیق حیلمی وێنەی ئەم مەکینەیەو وێنەی چاو سەماوەرێکی لە دەفتەرێکی سەرەتایدا دروستکردووە. باوکم تەنها دووجار ناوی دایکی وباوکی لەیاداشتەکانیدا هێناوە ئەویش زۆر بەکورتی و هەر لەباسی خەباتی سیاسیی خۆیدا.

کاتێ ئیبراهیمی برای ڕەفیق حیلمی کۆچی دواییکردووە لە کەرکووك، ڕەفیق حیلمی لە ڕومادی بووە بۆ (تفتیش) بەهەڵەداوان بەچۆڵی قوڵفەدا ڕۆشتووە تا بگات بەناشتنی تەرمەکەی و لەرێگە ئۆتۆمبێلەکەیان بەنزینی تەواوبووە و ڕێگەشی ونکردووە تاسێ ڕۆژ بەنزینیان دەست نەکەوتووە بۆیە بەپرسەکەی رانەگەیشتووە ئەمەیش ناسۆرێکی تری دووریی ڕەفیق حیلمی بووە لە کەسوکاری و خێزانەکەی.

بەهێی خوشکی ڕەفیق حیلمی زۆر جوان بووە قژەردو چاوکاڵ و سوروسپی و ئێجگار زیرەك بووە هەرچی ناوی وڵاتان و پایتەختیان و سەرك کۆمارو وەزیرو سەرۆکەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانە زانیویەتی و هەمووی لەبەر بوو.گوێی لە هەواڵ دەگرت لەڕادیۆدا. ئەم یەك کچ و سێ کوڕی هەبوو هەموویان ژنیانهێناوە و منداڵیان هەیە هەروەها کچەکەی براژنی (د.ناجی عەباس) بوو هەشت کوڕی هەیە هەموویان لەکەرکووك و موسڵن. باوکی ڕەفیق حیلمی خۆی دوو براو دوو خوشکی هەبوو

**برایەکی‌وخوشکێکی لەباوك‌ودایکی بوون. واتە باوکم دوو مام‌ودوو پووری هەبووە و هەموو بەئامان [*] ناسراون.**

## ( مامەکانی )

**١-تۆفیق ئامان، یەك کوڕی هەبووە بەناوی یونس‌و دووکچی هەبووە بەناوی عەتییەوزولەیخا**

**٢-شەوکەت، ئەمیش دووکچی هەبووە بەناوی نەزیهەو نەجیبە**

## ( پورەکانی )

**١- یەکێکیان ناوی (جەمیلە) یە، ئەمیان لەگەڵ شەوکەت لەیەك دایکن‌و پێمان دەوت (عەتەم جەمیلە) وەك باوکم.**

**٢-پوری دووەمی ناوی (مریەم)ە، ئەمەیان خوشکی باوکی رەفیق حیلمی یە لەدایك‌وباوکیەوە هەروەها خوشکی تۆفیق ئامان بووە جەمیلەخان(عەتەم جەمیلە) شوویکردووە بەیەکێك لەخێزانی یاوەرەکان‌و کچێکی شوویکردووە بە یەکێك لە خێزانی قیسییەکان**

**واتە خێزانی باوکی گەلێك تێکەڵبوونیان هەیە لەگەڵ عەشایەری عەرەبی بەناوبانگ بۆ نموونە وەك (بەهیە)ی خوشکی کەشووی بەسامەڕائییەك کردووە.**

**رەفیق حیلمی لەلایەن دایکییەوە پورێکی هەبووە کە زوو بێوەژن بووە و هەر لەگەڵ دایکی رەفیق حیلمی ژیاوە باوکم تەنها باسی ئەم پورەی کردووە لە دەفتەری رۆژنامەی قوتابخانەی سەرەتاییدا ئەویش گوایە ئەمە زۆر ناوبانگی بە نۆشداریی و دەرمانسازیی دەرکردووە، لەو دەفتەرەدا باسی ئەو دەرمانانەی نووسیوە کە دروستیکردوون، لەچی دروستی کردوون و بۆچی باشبوون ؟ خۆشی لێی بەکارهێناون و باش بوون، بۆیە**

---

[*].وشەی (ئامان ) نازناوی باوك‌ومام‌وپوری رەفیق حیلمی‌یە وەك لەخۆیانم بیستووە لەبەرئەوەی نەنکیان زۆر ئازاو چالاك‌و ناسراو بووە پێیان وتووە (ئامان) بۆیە ئەمە بۆتە نازناویان هەرچەندە لەمێژودا ناوی ئامان و ئامان ئەڵلا خانم دەخوێندەوە لەخۆمم دەپرسی ئایا ئەم ئامانەش لەوان بووە؟

زووزوو بەدایکمی وتووە: توخوا فلان کەس توشی فلان دەردبووە، لەفلان دەرمانی پورە ڕەحمـەی بـۆ بگـرەوە، دیـاربوو دایکمـان ئەمانـە لـەوەوە فێربووبـوو . هـەروەها لەیاداشتەکانیدا باسی ئەم پورەی کردووە لە باسی نەخۆشی وکۆچی دوایی جەمیلی برایدا.

## (کەسوکاری هاوسەرەکەی)

جەمیلـەخانی کچـی مسـتەفا ئەفەنـدی وەك لـەدرەختی خێزانـی ڕەفیـق حیلمیـدا دەرکـەوت دایـك و باوکیشـی لـە خێزانـی هـەمزە ئاغـای مەسـرەف بـوون و دانیشـتوی سلێمانین. واتە باوکم خزمی دایکم بووە و هەر ئەو ژنەی هێناوە، زۆری خۆشویستووە و بەگران پێی گەیشتووە چونکە ویستویانە بیدەن بە یەکێکی تر بەلام ئەم نەیهێشتووە.

جەمیلەخان زۆربەی کەسوکارو خوشكوبراو دایکی بەگەنجی کۆچی دواییانکردووە بەهۆی نەخۆشییەوە کە پاش جەنگی جیهانی بلاوبۆتەوە و زۆربەی خەلکی سلێمانی و کوردستانیپێ لەناوچووە، وەك چۆن گشت دنیای گیرۆدەکردووە.

ئەوانـەی ئێمـە بینیومـانن لـە کەسـوکاری سـێ پـوری (خوشـکی بـاوکی) بـوون کـە یـەکێکیان (غەزالـەخان) خێزانـی پیرەمێردوئـەویتریان (پیرۆزەخـان) نـەنکی د.سـیروان عەبـدولقادر و ژنـی حـاجی مەلاسـەعیدبوو کـە نوێنـەری عـیراق بـووە لـە تورکیـا. سێیەمیشیان دایکی عەبدوللا حیلمی پاشا (خەدیجە خان) بووە لە خێزانی سەعید لاو شویکردووە و هەر لەزووەوە چوون بۆ تورکیا و ئەو نازناوی (حیلمی)یەی ڕەفیق حیلمی پاداشتی ئەم عەبدوللا حلیمییەیە. (*)

---

(*) عەبدوللا حیلمی پاشا ئێستا دوو کوڕی هەیە لە تورکیا یەکێکیان نۆژدارە ئەوی تریان ئەندازیارە و ژنومندالیان هەیە، لەبرایەکی عەبدوللا حیلمی(بچوکەکەیان) واتە لەپورەی دایکم کە ناوی خەدیجەخان بووە برایـەکی تـا پـاروپێزار مـابوو... ئـەم دووسـالە ئاگاداری مانونـەمانی نـین بـەلام ئـەویش (٣)کچو کوڕێکی هەیە لە تورکیا.

# ژیانی تایبەتی ڕەفیق حیلمی بە پێی ساڵوتەمەن

وەك لەپێشەوە وتمان نەبەزارو نەبەنووسین باسی ژیانی تایبەتی خۆی و کەسوکاری نەکردووە. ئێمەیش کەنزیکترین کەس بووین لێیەوە، هەمیشە دووربووە لێمان و هێندە بەتەواوی وەك باوکی خەڵك لەگەڵیدا نەژیاوین، بەهۆی سەفەرکردنی لەم شار بۆ ئەوشار و زووزوو و لەپریشدا،بۆیە زۆر بەگرانی دەزانیین کە وێنەیەکی تەواوی ڕۆژ بەرۆژو ساڵ بەساڵی بنەخشێنین، بەشبەحاڵی خۆم هەر چەند ساڵێك بەتەواوی لەگەڵیدابووم، یەك دووساڵی سەرەتایی و ناوەندیی و چەند ساڵی کۆتایی نێوان ١٩٥٢-١٩٥٨و دووساڵیش لەعەمارە بوو لەگەڵ دایکمومنداڵەکان، پاش گەڕانەوەم لە ئەمەریکا و کە لە تورکیا گەڕایەوە پاش دووساڵ (١٩٥٩-١٩٦٠) هێندەی پێنەچوو کۆچی دوایی کرد.

کە بەمنداڵیی لەموسڵ بووین ئەوکاتە من لە ڕەوزە بووم بەحاڵ شتێکم بەبیردا دێت. بۆیە ناتوانم پەنا بەرمەبەر بیرەوەریی خۆشم بۆ باسی سەرەتای ژیانی باوکم . ئەوەی بەبیرمدا دێت بەمنداڵی هەر وەك خەیاڵە. ئەوەی گەنجێتیشم بەداخەوە هێندە نەبوو چونکە هیچی نەدەوت تامابوو، لەوەزیاتر کە لەخەڵکمان گوێ لێدە بوو، کە زۆر بەڕێزبووەو زۆر جێگەی لەناوخەڵکدا بەرزبووەو خەڵك زۆریان خۆشویستووە ئێجگار ڕێزیان لێ گرتووە چونکە خاوەنی کەسێتییەکی چەسپاو وبەهێزوناياب بووە، زۆر ئازاو چالاك و نەترس بووە تەنانەت پیاوەگەورەکانیش لێی دەسڵەمینەوە و گفتی زۆر ڕەوابووە. ناوبانگی زۆر بەربڵاوبووە لە ناو خۆشمان و بیانیەکانیشدا، زۆر ناسیاوی هەبووە، هەمەجۆربوون وهەموو خۆشیانویستووەوڕێزیان لێ گرتووە. تەنانەت لێپرسراوانی میریش بڕوانن بەچ شێوەیەك نامەیان بۆناردووە؟ گەورەو بچووك لەبەری هەڵساون خۆشمان لەماڵەوە کەدەهاتە ژووریێ هەموومان بەمیوانەکانیشمانەوە وەك قوتابی قوتابخانە لەبەری هەڵدەستاین. هەروەها دراوسێکانیشمان ئێواران لەبەر دەرگای ماڵەکانیان دادەنیشتنوباوکم بە بەردەمیاندا دەڕۆیشت، ڕادەوەستاو یەك بەیەك گفتوگۆی لەگەڵ دەکردنو لەگەڵ منداڵەکانیشیان جارجار نوقڵوشیرینیی دەدانێو ئەوانیش زۆر خۆشیان دەویست.ئێمە ئەوکاتە نەماندەزانی باوکمان چ پیاوێکیمەزن

بوو! نەماندەزانی خاوەنی چ کەسێتییەکی دیاربوو. خەباتکارو نەتەوەپەروەری نەتەوەو نیشتمانەکەی بوو! سەردەمی شێخی نەمر چیبووە و ساڵانی ١٩٣٧-١٩٤٥ سەرۆکی باڵای بەهێزترین و گەورەترین پارت بووەکە (پارتی هیوا) یە و ناوبانگی گەیشتۆتە سەرانسەری وڵات و ناوی (سەرۆکی باڵای پارتی هیوا) بووەو تا ئەوکاتەی د.موکەڕەم تاڵەبانی کەوتە نووسینەوەو بڵاوکردنەوە سەبارەت بەپارتی هیوا نەماندەزانی چۆن ڕۆڵێکی هەبووە لە خەباتی نەتەوایەتیدا، بۆ ئەمەش گەڵ چین و توێژی نەتەوەکەی لەپشتی بوون. چەند بە هێزبووە و چۆن ئەم ڕۆڵ و هێزەی بۆتە مەترسیی بۆ سەر ئیستعمار و کەوتونەتە پیلانگێڕان بۆ دورخستنەوەی لەو پارتەو تواندنەوەی پارتەکەی، بڕوانە باسی رەفیق حیلمی سەرۆکی هیوا لەسەرزمانی کاك فوئاد عارفەوە. وەك وتمان رەفیق حیلمی بەهیچ جۆرێك باسی خۆی بۆکەس و بۆ ئێمەش نەدەکرد، تەنانەت ماوەی ئەوەشمان نەبوو یاداشتەکانیشی بخوێنینەوە تاهیچ نەبێت ئەوەی لەوێدا نوسیبووی لێی تێبگەین.

لەبەر ئەوە هەرچی باسی ژیانی تایبەتیی رەفیق حیلمییەو لێرەدا دەیبینن، یان لەدایکمان یان پورمان یان کەسوکاری زۆرنزیك و هاوڕێی دڵسۆز و ئاگادارەوە وەرگیراون یان لەبیرەوەریی خۆم کەکاتی خۆی وەرمگرتووە ،کاتێ کەوتمەسەر بیری دانانی ئەم کتێبە ئیتر کەوتمە پشکنین و پرسین و خوێندنەوەی هەرچییەك کە دەستم کەوت لەناونەوانەدا کەلەدوای بەجێ ماوەو ئەوانەش کەلەلای ناسیاوەکانمان بوون بەوانەشەوە کەلەگۆڤارو رۆژنامەو کتێبدا دەربارەی نووسراون. لەئەنجامدا وا ئەم کتێبە دەخەمە بەرچاوتان بەئومێدی ئەوەی لە کەموکوڕییەکانی ببورن، بەتایبەتی چونکە لەماوەی نوسینەوەی ئەم باسانەدا گەلێك کۆسپی گەورە هاتنە ڕێم کەپەکی نووسینەوەی دەخستم بۆ ماوەیەکی زۆر کە گەڕانەوە بۆ نووسین شتێکی ئاسان نەبوو. بۆیە وا دواکەوت و رەنگە بەوجۆرە نەبێت کە ئومێدم دەکرد. بەڵام هەر شتێك لەهیچ باشترە بۆیە بەهەرجۆرێك بێت هەر هەوڵی لەچاپدانیمدا. چونکە ئەمە رەنجی( ٣٠) ساڵ زیاترمە لە پشکنین و خوێندنەوەو نووسینەوەی هەرچی دەستمکەوتووە کەس تائێستا هەموو ئەوەی لێرەدایە بەیەکەوە بەردەستی نەکەوتووە یان نەیزانیوە و زانینی سودی هەیە نەك بۆ رەفیق حیلمی خۆی بەڵکو زیاتر بۆ مێژووی نەتەوەکەی و خەباتی رۆڵە

دڵسۆزەكانی و هەوڵ و تەقەلایان بۆ گەیشتنیان بە ئامانجی نەتەوەكەیان.لەسەرەتاشدا باسی ژیانی تایبەتی خۆی دەكەین، باسی رەوشت و هەڵسوكەوتی، خوێندنی، كێشەوئەندێشەو ئەشكەنجەی، ئینجا باسی خەباتی سیاسی لەو سەردەمەدا وەك نوێنەری شێخ مەحمود بۆ داوای مافی كورد. دواتر دێینە سەرباسی ڕۆڵی وەك سەرۆكی (پارتی هیوا) و نووسینو بەرهەمەكانیو ئەو كۆمەڵانەی كەئەندامی دامەزرێنەریان بووەو ئیشوكاری میریی و زۆرشتی تر.

**ناهیدە رەفیق حیلمی**

# ژیانی ڕەفیق حیلمی

ڕەفیـق حیلمـی محەمـەد سـاڵح ئامـان سـاڵی ١٨٩٨ لـە کـەرکوك لـەدایك بـووە، سـاڵی ١٩٦٠ ڕۆژی (٤)ی‌ئابی ١٩٦٠ لەبەغدا لەنەخۆشخانەی سەلام لەئەنجامی نەخۆشییەکی کوشندەدا کۆچی دوایی کردووە، ئەویش لەماوەی یەك هەفتەدا. ڕۆژی ٨/٥ تەرمەکەی بەڕێخرا بۆ سلێمانی‌ولەگردی سەیوان بەخاکی کوردستان سپێردراوە.

ئەو سەردەمی منداڵیی لە کەرکوك‌و کفری‌و سلێمانی بەسەربردووە، چونکە باوکی ئەوکاتـە عەسـکەری هـەبووەو زووزوو گوێزراوەتـەوە لەشـارێکەوە بـۆ شـارێکی تـر، خوێندنیشـی لـەم سێ شارەبووە. لەسەرەتادا لـەحوجرە لەکەرکوك خوێندویـەتی خۆی ئەمـەی لەیاداشـتەکانیدا باسـکردووە، کاتـێ خـەڵك چـون بـەپیر شـێخی نـەمر شـێخ مـەحمودەوە، کە لـە موسڵ گەڕاوەتـەوە، بەبۆنـەی کوشـتنی شێخ سەعیدی باوکییـەوە، ڕەفیق حیلمی وتویەتی کە(١٠)ساڵ بووەو لـەحوجرەی (مەلاتـەقی) خوێندویـەتی و ئەم مەلایە شیعرێکی (مرثیە)لاواندنەوەی دووروو درێژی بەتورکی فێرکردووە تا لەبەردەمی عەشاماتەکەدا بیخوێنێتەوە و ئەمەی چەند جار پێش ئەوە بۆ خەڵکەکە خوێندۆتـەوە. ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا بەمجۆرە باسی خوێندنی خۆی کردووە:-

# خوێندنی (*)

باوکم پێشەکی هەواڵی خوێندنو قوتابخانەکانی سلێمانیمان بۆ ڕووندەکاتەوە دەڵێ:
لەدەوری عوسمانیدا لە سلێمانی زانست لە چاو هەندێ لە پارێزگاکانی تردا پێشکەوتوتر بووە. جگە لە قوتابخانەو حوجرە تایبەتییەکان چەند قوتابخانەیەکی باشی حکومیشی تێداهەبووە لەئامادەیی عەسکەریی سلێمانیی گەلێ قوتابیی پێگەیشتوونو چوونەتە بەغداو دوای یەك ساڵ خوێندن چوونەتە قوتابخانەی حەربییە لە (ئەستەمبووڵ)و بوون بە ئەفسەری پلەدار، گەلێکیشیان لەقوتابخانەی حەربییە ڕاستەوخۆ بوون بە یوزباشیی ئەرکان. ئینجا باسی خوێندنی خۆی دەکاتو دەڵێ:-

-ساڵی ٣٢٥ی ڕۆمی لە ڕوشدییەی مولکیەی کفری بڕوانامەی (سەرتایی) وەرگرتووە و لەسەر ئارەزووی باوکی کە ئەوکاتە تابوری-فەوجی گوێزراوەتەوە (پەسوێ) کە دەکەوێتە نێوان ڕواندوزو سابلاخ لەسەر سنوری عیراق-ئێران، چۆتەسلێمانی.

- دوایتاقیکردنەوە خراوەتە پۆلی دووەمی ئامادەی عەسکەریی کەپێنج پۆل بووە.

کەچۆتە پۆلی سێیەمیئەم قوتابخانەیە پۆلی چوارەم و پێنجەمی گوێزراوەتەوە بۆ بەغدا و قوتابخانەکەیان بەناوی ڕوشدییەی عەسکەرییەوە کراوە بەقوتابخانەیەکی سێ پۆلیی سەربەخۆ.

-کەلە ڕوشدییەی سلێمانی بەڵگەنامەی خوێندنی وەرگرتووە چووە بۆ بەغداو پۆلەکانی ئامادەیی لەوێ تەواوکردووە (پێش جەنگی گەورە بەیەك دووساڵ ئامادەیی موڵکیش کراوەتەوە) ئینجا ویستویەتی بچێت بۆ ئەستەمبووڵ بۆ حەربییە. پێش ڕۆیشتنی بۆ ئەستەمبوڵ دەڵێ : لەگەڵ یەکێك لە (موعەلیمەکانی) مامۆستاکانی ئامادەیی بەغدا کەمێك دەمەقاڵێی بووە.

خۆیکردووە بەنەخۆش، ناردویانە بۆ نەخۆشخانەی مەجیدییە لەوێ لەگەڵ دکتۆر (سەفوەت) ی چاویش دەچن بەگژ یەکداو دوژمنەکانی دەبن بەدوو. بەرەکانی شەڕ دژی باوکم قوتابخانەو نەخۆشخانە بەڕاپۆرتی هەیئەتی نوژداران دەڵێن گوایە نەخۆشیی دڵی

---

(*) بەرگی حەوتەمی (یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی) ل ١٥٧-١٥٩

هەیە بۆ ئەفسەریی دەستناداتو لە (٣٢٩)ی رومیدا دەریدەکەن. خۆی وتویەتی لەو قوتابخانەیە نەلەرووی خوێندنو لەڕووی هەڵسوکەوتەوە تائەو ڕۆژە هیچ شتێکی نەکردووە کە کەس لێی بەگلەیی بووبێ. لەبەر ئەوە بەو ڕەنگە لە بەری خوێندنی ئەو چەند ساڵەی لەئامادەیی عەسکەریی بێ بەشدەکرێ. هاوڕێکانی دەکەونە مشتومڕی سەفەری ئەستەمبووڵ دەڵێ وەك شتێکیان لێ ون بووبێ زۆر دڵتەنگ بوون، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە (عەبدوڵلا لەتیف بەگی ئاگا پاشا) و گەلێك لە مامۆستاکانیش، بەتایبەتی نۆژداری قوتابخانەکەیان (سامی سلێمان قول ئاغاسی) و (عەبدولمەجید بەگی خواجە) مامۆستای بیرکاریی کە بەتەمابوون بچێتە قوتابخانەی ئەرکان زۆریان پێ ناخۆش دەبێت، هەوڵدەدەن ئەو ڕاپۆرتە بگۆڕن، بۆ خۆیشی زۆر کاریتێکردووەو زانیویەتی ڕاپۆرتەکە ڕاست نیە و ئاشکرابووە ویستویانە ملی بشکێنن بەلام دەست بەجێ بڕیاریداوە ڕێگەیەکی تازە بۆ خۆی دابنێت، لە (بیرکاریی)دا باش بووە. کەبۆ دەرچوانی ئامادەیی موڵکی پێویست بووە بۆیە بڕیاریداوە بچێتەوە سلێمانی ئەمەش بخوێنێت تا (هەندەسەی عالی) لە ئەستەمبوڵ تەواو بکات، واتا جارێکی تر ئامادەیی بەلام ئەمجارە ئامادەیی موڵکی بخوێنێت.

–پاش ئەو هاوینە دەچێتە ئاخر پۆلی ئامادەیی موڵکی و هەر ئەوساڵە ئەم قوتابخانەیەش تەواو ئەکاتو لە٣٣٠ی ڕۆمیدا دەچێت بۆ ئەستەمبولْ.

لێرەدا بۆ یەکەمجار باسی (شەفیق)ی برای دەکاتو دەڵێ کە چۆتە ئەستەموڵ (شەفیق) ی برای گەیشتۆتە پۆلی پێنجەمی ئامادەییو بووە بەگەورەی ماڵو کراوە بە (بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئامادەیی موڵکیی سلێمانیی ئەوکاتە باوکیان لەسلێمانی زابت قرملی یوزباشی بووە و نێردراوە بۆ (بانە) لەئێران، بۆیە هەرشەفیقی برای لەماڵبووە.)

– باوکم لە ئەستەمبوڵ هەندەسەی عالی تەواوکردووە. بۆیە کەبووە بەمامۆستای یەکەم، وانەی بیرکاریی وتۆتەوەو دواتریش بووەبە موفەتیش بەپشکنەری تایبەتی وانەی بیرکاریی.

# مامۆستایانی قوتابخانەی
# ( نموونەیی سەعادەت بەشی سەرەتایی )
# سلێمانی ساڵی ١٩٢١

لەڕاستەوە بۆ چەپ: خوالێخۆشبوو مامۆستا زێوەر، مامۆستا سەعید کابان، خوالێخۆشبوو خواجە ئەفەندی، خوالێخۆشبوو مامۆستا رەشید کابان، مامۆستا عەبدوڵلا صبری، مامۆستا عەبدولرەحمان نەسیب، مامۆستا ئەحمەدی عەزیز ئاغا.

لەمانە مامۆستا زیوەر مامۆستای رەفیق حیلمی بووە کاتێ لە قوتابخانەی سەرەتایی لە سلێمانی خوێندویەتی، بڕوانە کتێبی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیی رەفیق حیلمی بۆ باسی ئەم مامۆستایەی بەدرێژیی و پەیوەندیی تری بەرەفیق حیلمیەوە.

صورة الكتاب

الى
حضرة الاستاذ محمود بابان المحترم
معتمد نادي الارتقاء الكردي

تحية واحتراماً وبعد ان ترشيحي لعضوية هيئة الادارة لنادي الارتقاء لم يكن برغبة مني لذلك يؤسفني ان اخبر حضرتكم بانني مضطر لطلب اعفائي من هذه العضوية التي انتخبت لها لمجرد حسن نوايا اخواني الكرام الذين تفضلوا وشاركوا بعطفهم وتقديرهم ولا يسعني الا تقديم الشكر لهذه الثقة الكريمة مع تمنياتي الخالصة بالتوفيق لخدمة الوطن وتفضلوا بقبول فائق احتراماتي الخالص.

رفيق حلمي

٢١/١/٩٥٦

## لەماموستاکانی ناوی ئەمانەی بردووە:

کەلە ئامادەیی عەسکەریی خوێندویەتی زۆریان کوردی سلێمانی بوون لەعەسکەریەکان (ئەحمەدبەگی رەشیدپاشا یوزباشی سواری عەلی یاوەری حاجی حەمەئاغا مولازمی تۆپچی، نوری وەیس و فەتحی و رەشیدکابان).

## لەماموستا مەدەنیەکانی

مەلامحەمەد ئەفەندی ماموستای فارسی و شێخ محەمەد ئەفەندی عەلی ماموستای وانەی عەرەبیی وعەزیز ئەفەندی وەسمان ئاغا ماموستای خەت ، پێیان وتووە خواجە ئەفەندی مەلا رەشید بەگ و عەبدوڵڵا ئەفەندی یاوەر حاجی قەلەندەری بەناوبانگیش (موبەسر) بووە و ساڵح چاوەش بۆری زەن بووە.

پاشان باسی عوسمان نوری دەکات کە وانەی عەرەبیی پێوتوون و لەکوردەکانی دیاربەکر بووە لەمەلایەتییەوە پێگەیشتووە دوایی قوتابخانەشی تەواوکردووە، مێژەری سپی و جوبەی لەبەرکردووە وشەی (کبی) تورکی بە(کپی) لەفزکردووە بۆیە ناویان ناوە (کپی)، رەفیق حیلمی کە لە سەفەرەکەیدا بۆئەنقەرە بەنوێنەری شێخ مەحمود دەگاتە دیاربەکر لەوێ ئەم ماموستایە دەبینێت. هەروەها لەو سەفەرەیدا مەلامحەمەد ئەفەندیش دەبینێت.

لەهاوپۆلەکانی و هاورێکانی باسی خلوسی(تەبلیسیی)* دەکات دەڵێت بەیەکەوە شیعریان نوسیووە و ناردویانە بۆ رۆژنامەی (حوادث) و گۆڤاری (کەوکەبی مەعاریف) کە لەکەرکوك دەردەچوون، رەفیق حیلمی لەسەفەرەکەیدا بۆ ئەنقەرە لەدیاربەکر بینویەتی و زۆر هاتووچۆی یەکتریانکردووە لەوێ و میوانداریيان بۆ کردووە بەتایبەتی ماموستا عوسمان نوری. دەربارەی ئەمە دەڵێ تا ئەو رۆژەی دیاربەکرم بەجێهێشت لێم جیانەبۆوە زۆر دڵنەوایی و خزمەتی کردووم، هەروەها (عەونی )کوری شاعیر (عرفی بەگ)لەوێ کاتب بووە.

-بەهۆی خلوسیی بەگەوە لەدیاریەکر دکتۆر فوئاد[*] دەناسێ بۆ زیاتر باسکردنی ئەم دکتۆرە بڕوانە ل١٦٠-١٦١ بەرگی حەوتەمی یاداشتی رەفیق حیلمی

هەروەها لەوان-یش مەجید ئەمین دەبینێتو دەڵێ ئەمە کەرکووکی بووە لەوێ زۆر ئاشنایەتی هەبووە لەگەڵیدا ئەویش لەوێ فریای دەکەوێ لەهیچ شوێنێك ئوتێل یاژوورێکی دەستناکەوێت، نازانێ بچێتە کوێ بۆیە ئەم پیاوە هەرچەندە خۆی لەفەرمانگەی ژەندرمە نوستووە ئەویشی بردۆتە ئەوێو زۆر خزمەتیکردووە. ئەم مەجیدە ناوە کوڕی ئەمین ئەفەندیە کە لەسەردەمی عوسمانیدا لە کفریی بەڕێوەبەری ئەملاکی سەنیەبووە.

کە باوکم لەکەرکوك مامۆستابووە مەجید ئەفەندی ،موغازەی هەبووەوکاسپی کردووە. دوایی لەکەرکووك رایکردووە بۆ لای ئۆزدەمیر کەباوکم لە ئەنقەرە دەبێ و ئینگلیزەکان ئۆزدەمیر دەردەکەن سەربازەکان بڵاودەبنەوە بە (شەمدینان)و(پاش قەڵا)دا هەندێکیان دەچنە وان، مەجید ئەفەندی یەکێ بووە لەوانەو ئەسعەد نیازی لەوێ کردویەتی بەژەندرمە،ئەم پیاوە لە وان رەفیق حیلمی دەعوەتکردووەو ،کوماندانی ژەندرمەی وان پێی وتووە ئەم فەرمانگەیە لەژێرفەرمانی تۆدا دەبێت.

## -رەشید جەودەت و مەحمود جەودەت

مەحمود جەودەت هاوڕێی کۆنو لاوێتی باوکم بووەو زۆر جار لە یاداشتەکانیدا باسی ئەمەی کردووە، لەگەل ماجید مستەفا پێکەوە لەماڵی تۆفیق وەهبی خەباتیانکردووە دژی ئینگلیزو کۆمەڵەیان دامەزراندووە وەك سەربەخۆیی کورد بەهیوای ئەوەی حەمدی بەگی بابان بێتە جێی شێخ مەحمود.لەو کاتەدا کەرەفیق حیلمی گەشتۆتە وان لە سەفەرەکەیدا ( وەك نوێنەری شێخ بۆ ئەنقەرە) زۆر نامەی رەشید جەودەتی پێگەیشتووە، لەیەکێك لەونامانەدا داوای لێبوردنی لێ دەکاتو دەڵێ زۆر لەپرو بەپەلە سەفەری کردووەو نەیتوانیووە بچێتە ماڵیان بۆزانینی ئەحواڵیان، بەڵام دەزانێت چاکنو لەبۆردومان رزگاریان بووە.

---

[*] د. فوئاد ل١٦٠-١٦١ یاداشتی رەفیق حیلمی

تێبینی بۆ درێژەی ئەم باسانە بڕوانە یاداشتی (٧)ی رەفیق حیلمی

ئەم نامەیە لەلایەن سمکۆوە لەگەڵ چەندین نامەی دیکەدا بۆی نێردراون و بە تورکین ئەمە دوا لاپەڕەی یاداشتی حەوتەمی باوکمە و بۆ ئاگاداریشتان نامەکە تائێستاش ماوە لەناو ئەرشیفەکەیدا.

## -ئیبراهیم ئەفەندی

گودرون یوزباشی خەڵکی سلێمانی و برای عەونی ئەفەندی بووە ئەم پیاوە بێجگە لە خۆی ژنەکەشی کەکچی مەلا ئەمینی دەلاڵە وتوویەتی هەر لەمنداڵیەوە لە کەرکووك رەفیق حیلمی ناسیووەو لەگەڵ دایکی زۆر جار چوونەتەماڵیان و ئەوانیش هاتوونەتەوە بۆلایان ،ئەمە کچێکی زۆر قسەخۆش بووەو لە(ئەخلات) لەرێگەی ئەنقەرە باوکمی بینیووە و قاوەڵتی بۆ کردووە لەماڵی خۆی، خورشیدخان وێنەیەکی خۆی بە شەبقەو بەرگی فەرەنگییەوە داوە بەرەفیق حیلمی بۆ خزمەکانی لەسلێمانی.

ئەم ئیبراهیم ئەفەندیە لە (ئەخلات) رەئیس تەجنیدبووە.

لە ل١٠٩ دا باسی مەجید ئیسماعیل دەکات کە هاوپۆلی بووە، لەروسیا دیلبووەو رزگاری بووە، گەڕاوەتەوە عیراق پێیان وتووە (تەوارش -رەفیق) ئەمەی کاتێ بیرکەوتۆتەوە کە لە تفلیس بووە و ژەنەراڵێك هاوریکردووە وتویەتی (دۆست) ئەمیش وشەی (تەوارش)ی وتووەو دەستی کردووە بەقسەکردن بەروسیی، رەفیق حیلمی بەتورکی و فەرەنسی و ئینگلیزیی وەڵامیداوەتەوە .

مامۆستا نەجمەدین کەرکووکی برای مامۆستاعەبدولخالق (ئەثیری) یەکەم کەس بووە کەچووە بۆلای رەفیق حیلمی کاتێ لەمنداڵیدا بۆیەکەمجار چووە بۆ خوێندن لە ئەستەمبووڵ، بەنامەی کەریم بەگی برای ئەحمەد ئاغا کەرکووکی ئەم بەکۆمەڵەی (هێڤی- هیوای) ناساندووە وەك لەدەفتەرێکیدا نوسیویەتی .

## کێ فێری کوردایەتی کردوم؟

– ڕەفیق حیلمی وتویەتی ئەم نەجمەدین کەرکووکی یە فێری کوردایەتی کردووم بەو پێناسینەی بە کۆمەڵەی هیڤی، لێرەشدا وتویەتی: (*) ئەم لاوەکوردە (بلیمەتی زەمانی خۆی بووە) بەهۆی ئەمەوە گەلێ کوردی ناسیووەو دوای ماوەیەکی زۆر کەم چۆتەڕیزی ئەو قوتابیە کوردانەوە کە بەخوێن پاکی و جێی باوەڕ ناسراوبوون (*)

### -مامۆستا نەجمەدین

لە لقی ئیلاهیاتی دار الفنون دەرچووە مامۆستای مەکتەبی سوڵتانیی بووە لە حقوقیش خوێندویەتی. لەهەموو هەلێك وجێگەیەکدا باسی کوردایەتی کردووە، لاوانی کوردی وریاکردۆتەوە، کچی والییەکی تورکی هێناوەکە خەڵکی (بۆسنە) بووە پێش بڕانەوەی شەڕی گەورە چووە بۆ بۆسنەو دوای ئەوە دەنگی نەماوەو نازانرێت چی لێهاتووە.

ڕەفیق حیلمی کەلەسەفەرەکەی ئەنقەرەدا گەیشتۆتە ئەستەمبووڵ ڕاستەوخۆ چووە بۆ ئەوجێگایانەی کە قوتابیبووە لەوێ و هۆگریان بووە.(*)

### - جەمیل عەلی ئەفەندی

جەمیل عەلی ئەفەندی خەڵکی سلێمانی و برای مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیس بووەو ئەندازیار سدیق ئەفەندی باوکی نوری شاوەیس زابتێکی کوردی نیشتمانپەروەربووە. کە والی موسڵ سوپای ناردۆتە سەرشێخ عەبدولسەلام بارزانی ئەم زابتی تۆپچی بووە، لەسوپای تورکان یاخی بووەو شەڕی نەکردووە لەگەڵ کوردەکان، لەسەر ئەوە گرتوویانە دادگاییان کردووە بەڵام دوایی بەریانداوە، ئیتر بەخائینیان داناوە و هەربە (ڕەئیس) یوزباش ماوەتەوە. لەئەستەمبووڵ ڕەفیق حیلمی بیستویەتییەوە

---

(*)ل١٢٠ هەمان سەرچاوە درێژەی باسی هیڤی

(*) ل١٢٠ یاداشتی( ٧)

(*)بڕوانە ل ١٢٠–١٢١یاداشتی (٧)

ئەوشەوەپێکەوە کاتێکی خۆشیان بردۆتە سەرو گەڕاون و چوونەتە ئۆرزدی عومەر ئەفەندی و لەوێ رەفیق حیلمی جلی هاوینەوپێڵاووباستۆنی کڕیووە. نزیکی نیوەی شەو لە جەمیل جیابۆتەوە.

## -عەبدوڵڵا حیلمی پاشا

کاتێ باوکم لەئەستەمبووڵ ئەخوێنێ عەبدوڵڵا حیلمی پاشا لەوێ مامۆستادەبێ کە کوڕی عەبدوڵڵا عەزیزی لاوە و دایکی ئەو پوری خێزانی رەفیق حیلمی یە. کە لەئەنقەرە دەبێت نامە دەنێرێت لە (قۆنیە)وە دەعوەتی دەکات بۆلای خۆی.

عەبدوڵڵا زابتێکی زۆر سەر ڕاست و بەئەمەکی تورك بووە، دوایی بووە بەئامیرلیوا لە مەکتەبی عەسکەریی و مامۆستای هەبووە، حسێن رەئووفی سەرەك وەزیران لەئەنقەرە ئەم نامەیە دەبینێت و دەڵێ باشە بچۆ چەند رۆژ لەلای بمێنەرەوە. رەفیق حیلمی دەچێ بۆلای و لەوێ چەند خزمێکی تری دەبینێ وەك مێردی خوشکی عەبدوڵڵا حیلمی ئەویش هەرخزمی رەفیق حیلمی و خێزانەکەی بووە و چەندکەسی تری ناسیاوی خەڵکی سلێمانی دەبینێت. ئەمانە هەر رۆژەو یەکێکیان میوانداریيان کردووە لە قۆنیە.

## -مستەفا بەهجەت

باوکم لەئۆرفە دەبێت و بەنیازە ئەورۆژەی گەیشتن لە ئورفە نانبخوات و بڕوات، بەڵام لەدوکانێکی سەرتاشیی مستەفا بەهجەت- ی یوزباشی سواریی دەبینێت. کە لەمەکتەبی ئامادەیی عەسکەریی بەغدا بەیەکەوە بوون و هاوڕێ بوون. حیلمی دەڵێت کەبینیویەتی لەخۆشیاندا نەیزانیوە چی بکات؟ پێی وتووە هەرگیز ناکرێ ئەمڕۆ بڕۆی، دەنێرێت بەشوێن مەحمود سامی یوزباشی‌دا ئەمیش هاو پۆلی بەغدای بووە بەمناڵیی پێیان وتووە(پاشا سامی). لەگەڵ کوڕی قۆزعەزیزی سەلیم ئاغا ئێوارە دەچنە چایخانە هاوینییەکەی سەر دەریاچە کەوتویانە ئاوەکەی ئیبراهیم بووە شەو لەماڵی مستەفا بەهجەت دەبن و بۆبەیانی رەفیق حیلمی دەڕوات بۆ دیاربەکر.

## -مولازم ئەحمەد فەخری

مولازم ئەحمەد فەخری کچەزای سلێمان ئاغای کەرکووکی، لەمەکتەبی روشدییەی عەسکەریی لەسلێمانی پێکەوە لەگەڵ باوکم خوێندویانە لەنادی زابتان لەزیافەتی نورەدینی قائمقامی ئزمید دا دەیبینێت. دەچێتە ئیستگە لەگەڵیان و سواری شەمەندەفەردەبن .

## -عەلی کوندکتۆز

عەلی کوندکتۆز هاورێی منداڵیی باوکم بووە لە مەرعەش، نامەیەکی بەیەکێك لەهاورێیانی رێگەی دیاربەکریدا بۆ دەنێرێت کە دەچێ بۆ مەرعەش . لەگەڵ عەلی کوری حەسەن ئەفەندی برای حسێن نازم لەکەرکوك لەمەکتەبی سەرەتایی پێکەوە بوون بۆیە زۆر حەزدەکات بچێتە لای لە مەرعەش بەڵام کاروانەکەیان بەوێدا ناڕوات، شایەنی باسیشە کە ئەوکاتە باوکی فایەق بەگ -یش لەمەرعەش بووە.

# هاوپۆلەکانی لەزاری خوالێخۆشبوو

## ئەحمەد فەخری یەوە

ئەحمەد فەخری لەسلێمانی ناوبانگی بە (حەمەکۆڵە) دەرکردووە، ئەویش گوایە لەبەرئێسك سووکی، کەسوروسپیو چاوشین بووە وەك د. نەسرین فەخری کچی. کاتێ من چەند جار لەسالانی پێش کۆچی دوایدا بینیم لەماڵی د.نەسرین بەساڵدا چووبوو سەری سپیبوو بوو دیاریش بوو بیری وەك خۆی تیژ نەمابوو، لەبەرئەوەی کە باسی هاوپۆلیو هاورێیەتی خۆیم لەگەڵباوکمدا لێپرسی نەیتوانی زۆر بەوردیو بەتەواوی رووداوەکانی بەبیربێتەوە. وەك دەریشکەوت دووساڵ لە باوکم بچوکتربووە و زیاتر هاو پۆلی شەفیقی برای رەفیق حیلمیبووە، پێکەوە ئامادەییان تەواو کردووە، باوکم پۆلێك لەپێشیانەوە بووە. بەلام لەهەمان قوتابخانە خوێندویانە بۆیە مامۆستاکانیان هەر هەمان مامۆستابوون بەلام پۆلەکانیان جیاواز بووەو هاوقوتابخانە بوون. کاك محەمەد فەخری وتی رەفیق حیلمی لەرۆشدییەی عەسکەریی سەرەتایی لەسلێمانی دوو پۆل لەپێش منەوە بووە ئەو لەپۆلی شەش بووە محەمەد فەخری و مامم لە چوار بوون. هەندێ لەهاورێکانیان جولەکە بوون. ئەوسەردەمە سلێمانیی وەك شارەکانی تری عیراق زۆری جولەکە تێدابووە. لەهاورێ جولەکانیشیان (سیمانەو ئەورام شالۆم )ی بیرکەوتەوە هاورێکانی تری بیرنەبوو بەتایبەتی هاورێکانی باوکم بەڵکو هاورێکانی شەفیقی لەبیربوو چونکە هاوپۆلی خۆشی بوون لەوانە (فوئاد مەستی، عەلی کەمال، کامل حەسەن، یونس عەبدولقادر، عەزیزی حاجی سالح، جەلال صائیب و ئەحمەد عەزیز ئاغا) کە ئەم سیانەی دوایی بەخزمایەتیش دەگەنەوە بەباوکم هەروەها(ئەحەی یاسین، کەریمی سورە ئەورەحمانەسیس، هادی مەلا، ئەحمەد مستەفا گوروون، عەزیز حیکمەت، سالح کورەزەن ، ئەمین رەواندزی، سەیحەسەن) کە ئەم دووانەی دوایی هاوپۆلی رەفیق حیلمی بوون بێگومان ئەوانەی سەرەوە هەربەتەنیا هاوپۆلی رەفیق حیلمی نەبوون بەڵکو ناسیاوو دۆستیشی بوون. پاش ئەمە رەفیق حیلمی رۆیشتووە بۆ بەغدا لەساڵی ١٩١٢ دا بۆ ئامادەیی مەلیکیی فەیسەڵییە.

لەقوتابخانــەی ســەرەتایی ئــەوەی بــەبیر خوالێخۆشــبوو محەمــەد فــەخری هاتــەوە بەڕێوەبەرەکەیان رەشیدمارف کابان بوو لەمامۆستاکانیانیش (زێوەر ئەفەندی شاعیر) کەمامۆستای قەواعید بووەو ڕێزمانی فارسیی پێ وتوون. مەلا محەمەد ئەفەندی عەرەبیی پێ‌وتوون، وەختی خۆی رەفیق حیلمی لەتورکیا بینیویەتیەوە. هەروەها شێخ ئەورەحمان عەرەبیی پێ وتوون‌و عەبدوڵلا پاشا فەرەنسی‌و نوری وەیس داخلی‌و زابت عەلی یاوەر [*] ئەمەیش داخلی‌و حاجی قەلەندەر چاودێری قوتابخانە بووەو (تۆفیق وەهبی) مامۆستای زمانی فەرەنسی بووە.

ئەوەی لەرەفیق حیلمی خۆیمان بیستووە ئەوەیە کە (ماجید مستەفاو سەعید فیراز) هاوڕێی قوتابخانەی بوون‌و ماجید مستەفا هاوڕێی کاتی لاوێتیی و خەباتی سیاسیشی بووە لە سلێمانی لە سەردەمی ئینگلیزدا ئەمانەی لە یاداشتەکانیدا بەدرێژیی باسکردووە بەتایبەتی کاتی مێجەر سۆن وئەو کاتەی کە کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردیان بۆ حەمدی بەگی بابان دامەزراندووە.

تادوا رۆژی ژیانی پەیوەندیی مابوو بە خوالێخۆشبوو ماجید مستەفاوە لەگەڵ کاک (فوئاد عارف) لای بوون لە نەخۆشخانەی سەلام کاک فوئادخۆیشی ژووری گرتبوو لە نەخۆشخانەکەداو تاکۆچی دوایی رەفیق حیلمی لەوێمایەوە و هەواڵی دەپرسی و یارمەتیداین پەساپۆرتی بۆ وەرگرتین تابیبەین بۆدەرەوەی ولات.

خوالێخۆشبوو محەمەد فەخری ئەوەشی وت کە باوکم لە قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوکی مولکی بووە و لەوێ وتاری بەفەرەنسی پێشکەشکردووەو لەپاداشتی ئەوەدا سەعاتێکی ئاڵتونی پێ بەخشراوە. کەپاش قۆناغی ئامادەیی دووجار رۆیشتووە بۆ ئەستەمبووڵ بۆ خوێندنی بالا یەکێ لەهاوڕێ نزیکەکانی کە خۆشمان ناسیومانە:

محەمەد عەلی مستەفابوو کە کورد بوو لەوەزارەتی پەروەردە بوو تاکۆچی دوایی باوکم ، زۆر دڵسۆزی بوو زۆریشی یارمەتیداوە لەئیشوکاری میریدا سەبارەت بەگوێزاوەکانی

---

[*] عەلی یاوەر وابزانم مێردی(عەتەم جەمیلە)ی پوری باوکم بووە و باوکی سەبیحەخانی کچی ئەم پورەی بووە کە دایکی فەخری ئەلقەیسی لە قەسیەکانی موسڵ بووە و فەخری ئەلقەیسی ماوەیەکی زۆر لەدەرەوە سەفیربوو.

لەم لابۆئەولا. پاش کۆچی دوایی باوکمان محەمەد عەلی مستەفا هات بۆلامان زۆر یەکی کەوتبوو وتی بیرم لاتانە هاتووم بۆ هەواڵتان ئیتر پاش ئەمە نەمانبینیەوە.

هاوڕێکانی تری ئەمانە بوون (قادر قەزاز، قادربەگی عیزەت بەگ عەزیز قادر، رەشید جەودەت و پێشتریش مەحمود جەودەت لەخزمان و نزیکەکانی و یاریدەری بوو هەر لەکاتی لاوێتیەوە ئەحمەد ئاغا کەرکوکی زادە و براکانیشی) یادی ئەمانەی لەیاداشتەکانیدا بەرێزەوەباسکردووە ئەحمەد ئاغا لەبەتاوینماڵیان نزیك ماڵی ئێمەبووە زووزوو سەریداوە تاکۆچی دوایی کردووە.

لەبەشیرخانە(دوکانی بەشیر موشیری جلدروو) رەفیق حیلمی گەلێك هاوڕێی تری هەبووە لە خزمان لە ئەدیب و شاعیران و دانەران وەك (ئەنوەر صائیب) و ئەوانەی لەگۆڤاری ڕەنگین دا لە (بەشیرخانە)دا باسکراون. وەك زانرابوو باوکم زۆر ناسیاوی هەبوو هەمیشە پەیوەندی باش بوو لەگەڵیانداو خۆشیاندەویست و ڕێزیاندەگرت. وەك دەردەکەوێت رەفیق حیلمی قوتابخانەی سەرەتایی لەکفریی تەواو کردووە، ناوەندیی لەسلێمانی و ئامادەیی لە سلێمانی و بەغداو خوێندنی باڵای لە ئەستەمبووڵ خوێندووە لەچەند دەفتەرێکی بچوکدا چەند وێنە و نووسینێکی هەیە وا پیشاندە دەن کە رەفیق حیلمی هەر لەمنداڵییەوە، بیری لەنوسین کردۆتەوە، بڕواننە ئەم چەند لاپەڕەیە دوای ئەمە چی لەودەفتەرە بچووکانەدا نووسیوە وەك موفەکەرە. هەروەها ئەو نەخشانەی کە کێشاونی لەمانەدا ئارەزووی هونەریی دەردەکەوێت، زۆر بەوردیی نەخشەی ئەو شتومەکانەی لەبەرچاوی بوون کێشاونی وەك وێنەی مەکینەی خەیاتی و سەماوەرو قۆریو هتد لەمانەشدا پلەی زیرەکیی خۆی پیشانداوە لەدەفتەری خوێندنیدا چەند جار نوسیویەتی(رەفیق برنجی) بەتورکی واتە یەکەم لەلایەکی تر ناوی چەند دەرمان و کەرەستەو چۆنێتی دروستکردن و بەکارهێنانیانی نوسیووە دیارە ئەمانە لەودەرمانانە بوون کە باجی ڕەحمەی پوری (خوشکی دایکی) کە ناوبانگی بەدەرمانساز دەرکردووە دروستیکردوون، لێرەدا ناوی دووان لە کەسوکاری نوسیووە یەك دووجار ناوی (شەفیقی) برای (مەحمود شەفیق) و ناوی (باجی ڕەحمە)ی پوری و ناوی ئەو پورەشی لەیاداشتەکانیدا نووسیوە کاتێ باسی نەخۆشیی (جەمیل) ی برایی کردووە بڕوانن لەوکاتەشەوە کەوتۆتە دانانی شیعر. ئەو شیعرەی بە تورکی دایناوە باسی جوانی چاوی شینە و لەسەرەتادا ناوی پاکیزەی لەسەر داناوە کە ناوی کچە گەورەکەیەتی.

# لەدەفتەری یادنامەکانی منداڵیدا

**یەکەم/**

دەفتەرێکی بچووك کە لەوە دەچێت دەفتەری کاتی خوێندکاریی رەفیق حیلمی بووبێت لە قۆناغی سەرەتایدا کۆمەڵێ زانیاریی و بابەتی تێدایە، بەمەشدا دەردەکەوێت لەوکاتەوە بیری لە یاداشت نووسینەوە کردۆتەوە. دەفتەرەکەش ئەمانەی تێدا نووسراوە:

١- ناوی چەند دەرمانێك و چۆنێتی دروستکرنیان و بۆچی باشن و کەرەستەکانیانی تۆمارکردووە ئەمە لەوانەیە ئەو دەرمانانەبێ کە (باجی رەحمە)ی پوری دروستیکردوون، باجی رەحمە لەگەڵ دایکی رەفیق حیلمی‌دا ژیاوە، چونکە بێوەژن بووە ودیارەمنداڵی نەبووە. خێزانەکەی بەکارهێنانی ئەم دەرمانانەی لێوە فێر بووە باوکم هەندێجار داوای لەدایکمان دەکرد بەڵکو فلان دەرمانی باجی رەحمە بۆ فلان کەس ئامادەبکات. دەرمانەکانیشی ئەمانەبوون: سمل وزاخ و خاسە رەنگ و مرداسەنگ وگۆگرد وعارەقی (واتە پالاوتەی) نەعنا ئیتر فنجانێ لەم و فنجانێك لەو و رۆنی بادەم و هتد..منداڵەکانیشی هەمیشە گوێیان لە ناوی ئەم دەرمانانە ئەبوو، تەنانەت بەکاریشیان دەهێنا.

٢-خشتەی وانەکانی

٣-خشتە یان لیستەی نمرەکانی ونووسیویەتی رەفیق برنجی( واتە یەکەم)

٤-ئەونیگارانەی بەدەستی خۆی کێشاونی وەك مەکینەی خەیاتی، وەك بیستوومانە دایکی یەکەم ژن بووە کە لەسلێمانیدا جلی خۆیانی بە مەکینەی خەیاتی دووریوە. گەلێك نیگاریشی دروستکردووە لەسەر ئەوقوشانەی بەکاریهێناون .

٥-وێنەی سەماوەرو قۆری کە دیارە ئەم وێنانە بەرهەمی سەردەمی منداڵیی ئەون چونکە دەفتەری وێنەی هەیە وێنەی وایتێدا دروستکردووە بەوردی و پێوانەی هونەرمەندانە، هێندە جوانن دەڵێی بەکامێرا گیراون، ئەوەی لەم دەفتەرەدایە بۆ تەمەنی خوێندکارێکی سەرەتایی زۆرە، بەڵام بەبەراوردکردن لەگەڵ ئەو کارانەی دوایی بەساکار

دادەنرێتو بڕواناکەم لەئێستادا لەناوسەد خوێندکاری قۆناغی سەرەتایدا یەکێکیان بتوانێ وابەوردیی ئەو(وێنانە) بکێشێت وەك وێنەی فانۆس ومێزەکەی ژێری.

٦-شیعرێکی تورکیی کە باسی جوانیی چاوی شین دەکاتو لەسەرەتادا ناوی پاکیزەی لەسەرداناوە.

٧-چەند هەوڵێك، وەك گشت منداڵێك دەستی کردووە بە نەخشکردنی ئیمزای خۆی، چەندجار ئیمزای خۆی کردۆتەوە وبۆ یەکەمجار لەناوگشت ئەو دەفتەرو یادنامانەیدا ناوی (شەفیق) واتە (محەمەد شەفیق)ی برای بە پێنووسی (رصاص)ڕەش چەندجارێك نوسیووەو بەسەریدا ڕۆیشتۆتەوە ئینجا بە جۆرێکی کاڵتر لە تەنیشتیەوە نووسیویەتییەوە، برایەکیشی بە پێنج ساڵیی کۆچی دوایی کردووە لەیاداشتەکانیدا باسیکردووە. بۆیە لەدایك و باوکی ئەم برایەی بۆماوەتەوە کە لەقوتابخانەی سەرەتایی پێکەوە خوێندویانەو یەك پۆلیان نێوان بووە. لەوە دەچێت لە ئەستەمبووڵ- یش پێکەوە بووبن لە ئاکادیمیای حەربی، چونکە وێنەیەکیان بەیەکەوە هەیە لە تەمەنی لاوێتیدا بەجلی عەسکەریی‌و فینەی عوسمانلییەوە.

ئەم برایەشی هەر زوو کۆچی دوایی کردووە کاتێ کە (ضابط مدفعیە) بووە لە سوپای عوسمانلیدا لە ئەستەمبووڵ، تەنانەت یەك کارت پۆستاڵ و وەسڵێك بەناوی ئەم برایەیەوە بە تورکی لەناوشتەکانی ڕەفیق حیلمی‌دا هەیە ئەوەی من توانیومە سور بم لەسەر ئەوەی کارتو وەسڵی ئەم برایەیەتی، چونکە ناوی(محەمەدشەفیق) یان لەسەرە. زۆر نامەی بۆهاتووە بەتورکی وابزانم لەمانەشدا نامەی ئەوبرایەی تێدایە بەڵام ئیمزاکە روون نییە. هەندێك نامەش هەن‌و پاسپۆرتێکی عوسمانی بەناوی (محەمەد ساڵح)ەوە کە دیارە پەساپۆرتی باوکێتی هەر لەم دەفتەرەدا ناوی (محەمەدساڵح-سەرشەقام) نووسراوەو لەباسی مردنی ئەو برا بچووکەیدا کەناوی (جەمیل)بووە ڕەفیق حیلمی باسی باوکی کردووە کە ئەوکاتەی چۆتە سەر گۆڕی ئەم برایەی و گریاوە ئینجا زانیویەتی کە عەسکەریش دەگری! لەوباسەشدا وتویەتی: دایکم ژنێکی ئیمانداربووە بۆیە داوایکردووە (جەمیل)ی کوڕی نزیك گۆڕی ئیمام شاسوار لەکفریی بنێژێ.

ئەمە هەموو باسی خێزانەکەی بووە کە کردویەتی ئەمانەش ئێمە وەك خێزانەکەی خۆی وەك هەرخوێنەرێکی تر لە یاداشتەکانیدا خوێندومانەتەوە چونکە هەرگیز بەزمانی خۆی ناوی کەسیانی نەبردووە، پورم و دایکم جاروبار ناویان بردون.

دووەم/

لەسەر بەرگی دەفتەری یادنامەکەی خشتەی وانەکانی نووسیوەو لەژێریدا بە مەرەکەبی سور نووسیویەتی رەفیق حیلمی ١٩٢٩، کە ئەمە خشتەی مانگی رەمەزانی ئەو ساڵەیە. لێرەدا بابەتی بیرکاریی نووسیوەتەوە و هەر لێرەشەوە بەهرەی (خۆشنوسیی) دەستپێکردووە. ئینجا بەزمانی عەرەبی باسی کارەبای کردوە دواتر (لافوازیە) و چۆن لە شۆڕشی فەرەنسادا لەسێدارە دراوە. هەرچەندە زانیار و زانا بووە و ڕاژگەی هەبووە کەچی لەژێر ئەم بابەتەدا نووسیویەتی: عن مقتطف (سێپتەمبەر) سنە ١٨٨٩ من كتاب (اعلام المقتطف) القسم الاول (صفحه٦٣) ٦شباط ١٩٣٠ هذه من مطالعاته ودليل على حبه للعلوم وكان في كركوك يدرس الرياضيات والفيزياء كماتبين من كتاب رسمي موجه اليه تسليم ادوات هذين الموضوعين الى الاستاذ الذى حل محله.

واتە ئەمەی لە خوێندنەوە واتە لە (مطالعات)ەوە وەرگرتووە و خۆشی وانەی بیرکاری و فیزیاشی وتۆتەوە لەکەرکوك. ئەمە لەنامەیەکی میریدا دیارە کەداوای دەوروتەسلیمی پێداویستییەکانی فیزیاو تاقیگەی لێ کراوە.

ئەگەر لەوسەری ئەم دەفتەرەوە واتە لەچەپەوە دەست پێبکەین دەبینین نامەی بەئینگلیزیی وبەمێژووی(jun)،(حوزەیرانی ١٩٥٥) نوسیووە و بەناونیشانی ناوەندیی مەنسور و بەناوی ئەو خانوەوە کە لە بەتاوین تیایدا ژیاوە پێش کۆچی دوایی لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٥ بەڵام بە دەستنوسی رەفیق حیلمی نیە ئەمە وادیارە دەستنوسی یەکێك لەمنداڵەکانیەتی دواتر نوسیوویانە.

# وێنەیەکی ساکار لەژیانی تایبەتی لە سلێمانی

لەو خوشکەی باوکمانەوە(بجی) پچڕپچڕ کە جاروبار بەشەو دەمبینی بەدیار قۆری‌وسەماوەرەوە دادەنیشت، چاوەڕێی باوکمی دەکرد ،هێندێك باسی ژیانی خۆی وباوکمم بیستووە، ئەو دەیوت:

لەسلێمانی لە (حەوشی گەورە) ژیاون. حەوشی گەورەیش گەورەترین خانوو بووە لەناوەڕاستی شاری سلێمانیدا حەوشێکی ئێجگار گەورە بووە، چەند کەسێکی دایکیشی لەهەمان حەوشەدا ژیاون وەك پورو پورزاو خاڵۆزاکانی.

دایکی حەلاوەخان خەڵکی سلێمانی بووە،وەك پێشتر وتمان لەدایك ولەباوکیشییەوە لەهۆزی هەمزە ئاغای مەصرەف بووە، حەوشەکە چواردەوری ژوورو لەجۆریماڵی کۆنی سلێمانیدا دابەشکراوە بەسەر چەند ژوورو مەرافیقێکدا هەریەکەیان بۆ یەکێك بووە لەو خێزانانەی تیایدا ژیاون.

بێگومان کەیەکێك لە خێزانەکان منداڵێکیان شوویکردووە یان ژنیهێناوە لەهەمان حەوشەدا ژیاوە، هەریەکە ژوورێك‌و دووانی هەبووە بۆ خۆی‌و ئەویتر گشتی بووە، واتە وەك دەیانگێڕایەوە چێشت‌و نان هەرلەماڵی باوکەوە لێنراوە و بەسینیی دابەشکراوە بەسەر ئەوانی تردا ولە هەندێ کاتی تایبەتیشدا هەموویان پێکەوە نانیانخواردووە.

وەك (بجی) دەیگێڕایەوە لەو حەوشەیەدا دارێکی ئێجگار گەورە هەبووە، پێیان وتووە(دارە ڕەشەکە) دیارە لەبەر گەورەیی سێبەری کە زۆر پانوپۆڕ و فراوانبووە بۆیە بەدارە ڕەشەکەیان داناوە و گەڵاولقوپۆپی زۆریشی هەبووە.

پاش نیوەڕۆو دەمەو ئێوارە حەوشە ئاوپڕشێن کراوەو سەماوەری وەرشاوی گەورە بەقۆری عەجەمی گەورەوە لەژێر ئەو دارەدا دانراوە و فەرش داخراوە و دۆشەك‌و سەرین یان کورسی دانراوە. من نازانم بەڵام ئەو پورەمان دەیوت زۆریان دەستوپێوەن واتە بەردەست هەبووەو زۆربەیان جولەکە بوون، یەکێك لەمانە سایسی تایبەتی باوکم بووە. ڕەفیق حیلمی وڵاخی تایبەتی خۆی هەبووە، هەر لەمنداڵییەوە سوار چاك بووەو جلوبەرگی پۆشتەوپەرداخ و پاکو خاوێنی لەبەرکردووە و بەسواری وڵاخەکەی چۆتە دەرەوە. یەکێك لەو بەردەستانە جۆلانەی بۆ(کچان) واتە ئەم خوشکەی باوکم هەڵخستووە

بە دارە رەشەکەوە کەرایژەندوە گۆرانیی جوولەکەکانی بۆ وتووە ئینجا ئەو پوورەمان لەبەرئەوەی واتای وشەکانی نەزانیوە بەگوێیدا چون وای لەبەرکردبوون کاتی خۆی جۆلانەی بۆ ئێمە لە درەختەکانمان دەبەست و بۆی دەوتین (هەیالۆخ و مەیالۆخ، دیلمودیلانی شالۆخ) ئینجا خوائەزانێ ئەمە مانای چی بووە؟

وەك وتمان ئەو سەردەمە لەسلێمانی وەك گشت شارەکانی تری عیراق زۆر جولەکە هەبوون گەڕەکێك هەبووە بەتایبەتی ناوی جولەکان بووە. تەنانەت کە جولەکەش لە عیراق چوونەتە دەرەوە ئەو گەڕەکە هەر بەو ناوەوەماوەتەوە، لاوانی سلێمانیی ئێواران بۆ کات بەسەربردن چوونەتە ئەو گەڕەکە و زۆر لە پیاوانی سلێمانیی ژنیانلێهێناون، ئەوژنانە بوونەتە موسڵمان و خۆم چەند دانەیەکیانم بینیووە، ئەوانە نوێژیان دەکردو ڕۆژو وتەزبیحات و دوعا و خێروزەکات و تەنانەت حەجیشیان دەکرد. ئەوەتا لەباسی خوێندنیشدا دیارە لەهەمان قوتابخانەکانی خۆمان خوێندوویانە، وەك ئەو هاوڕێیانەی باوکم کە کاك محەمەد فەخری باسیکردون.

وەك باسمانکرد لەماڵی باوکی رەفیق حیلمی زۆریەی بەردەستەکانیان جولەکە بوون، لەوانەی پورم باسیدەکردن (رەفاییل)بوو کەدوایی بوو بە زەڕەنگەرێکی زۆر بەناوبانگ لەسلێمانی، ڕیش درێژو بەقەڵافەت بوو، ئەوکاتەی زەڕەنگەر بوو بینیوومە. هەروەها چەند جولەکەیەك بەماڵانەوە دەگەڕان وەك (سیمانە) کە قوماشی دەفرۆشت وبازن و متوموروو شوشەو فەخفوریی چاکدەکردەوە بەسیم و گەچ.

مەبەستم لەباسی جولەکە لەم کتێبەدا شتێکە کە زۆر کاریکردۆتە سەر باوەڕو هێندێك داب و نەریت کە لەوکاتەوە لەناو خێزانی ئێمەدا بڵاوبۆتەوە . بەڕای خۆم وادەزانم ئەمە بەپیلانی ئەو بەردەستە جولەکانەبووە، ئەوانەی خێزانی رەفیق حیلمی و کەسوکاریی دەناسن دەزانن کە هیچیان لەوسەردەمەوە، گەورەو بچووك، ڕۆژانی شەممە نەسەردەشۆن و نەجل، هەر لەبانگی مەغریبی ڕۆژی هەینییەوە تا بانگی ڕۆژئاوای شەممە. زۆریشیان تابەیانی یەکشەممەش درێژیاندەکردەوە ئینجا ئەمە بۆچی؟ وەك بزانم ئەم بەردەستانە لەماڵی رەفیق حیلمی و ماڵی باوکی و کەسوکاری لەبەرئەوەی جولەکەبوون، ڕۆژانی شەممە هیچ شتێکیان نەدەکرد، ئاگریان نەدەکردەوەو سەروجلیان نەدەشت، بۆئەوەی ئەم دابونەریتەی خۆیان بپارێزن لەو ماڵانەی ئیش و

کاریان تێداکردووه نەیانشکاندووه. دیاره شتێکیان کردووه کە ئەو خاوەن ماڵانە بخاتە مەترسییەوە هەرچەندجلیان بۆ شتبن یان سەرشۆریان بۆ گەرم کردبن، بۆیە خێزانی ئێمە وازیان لەجل شتن و سەرشتن هێناوە لە ڕۆژی شەممەاندا و ئەوەی سەیرە و ڕەنگە بەڕێکەوت بووبێت هەرچەند یەکێکیان ئەم عادەتەی تێکداوە و بێزاربووە لێی یاخود بەناچاریی لەم ڕۆژەدا سەروجلی شتووە، شتێکی خراپ و ناخۆشی بەسەردا هاتووە، بۆ وێنە هێشتامنداڵ بووم سەرم دەشت، لەپڕهاتن وتیان باوکی‌دایکم کۆچی دوایی کردووە. هەر زراوم چوو، خۆ تاباوکیشم کۆچی دوایی کرد کەس نەیدەوێرا ئەم عادەتەی ماڵەوەمان بگۆڕێت، باشبوو دایکم نەیزانی سەرم شتووە لەبەر پرسەکە، ئێستاش هەمووومان لەسەر هەمان داب و نەریتین.لەحەمامیشدابین دێینەدەرەوە و جل تەڕیش بێت وازی لێدەهێنین تارۆژی یەك شەممە.

لەمەیش سەیرتر ئەوەیە کاتێ چوومە ئەمریکا، وەك دەزانن نزیکەی ڕۆژێك جیاوازیی هەیە لە نێوان ئێمەوئەواندا. لەوێ سەرم لێ تێکچووبوو کام ڕۆژ سەر نەشۆم و جل نەشۆم، شەممەی خۆمان لەعیراق یان شەممەی ئەمەریکا. جاروبار گزیم دەکرد بەم بەهانەیەوە لەبەر ناچاریی لە شەممەدا کاری خۆمم دەکرد.

دیارە باسی حەوشی گەورە پاش باسی کفریی بووە چونکە ئەگەر ئەم باسانە پێکەوە بنێین لەگەڵ مردنی جەمیلی برای باوکمدا لەکفریی، بۆماندەردەکەوێ باسی ئەوەی ڕەفیق حیلمی لەکفری بووە کاتێ بووە کە باوکی هێشتاماوە بەلام بۆ کاری میریی چۆتە هەولێرو چۆتە سەر سنوور، ئەوکاتەی جەمیل کۆچی دوایی کردووە ئەم منداڵ بووەو لە قوتابخانەی سەرەتایی بووە، چونکە خۆی دەیگێڕێتەوە کە منداڵ بووە لەگەڵ پووری براکەی بردووە بۆلای دەرمانسازو برینپێچەکە،هەروەها دەڵێ کە ئەو برایەی مردووە باوکی لەوێ نەبووە بۆیە دراوسێیەکی پیاوچاکی هاوڕێی باوکی پێویستی ناشتنی جێبەجێ کردووە، هەر لەوێشدا باسی دایکی کردووە دەڵێ ژنێکی زۆر دینداربووە کە (جەمیل) مردووە تکایکردووە لەپەناگردی (ئیمام شاسوار) بینێژن و هەرلەوێشدا ڕەفیق حیلمی باسی باوکی کردووە کە گەڕاوەتەوە بۆ لایان بۆ کفری ئەمی لەگەڵ خۆی بردووە بۆسەر گۆڕی جەمیل و لەوێدا باوکی بینیوە کەفرمێسك بەچاویدا هاتۆتە خوارێ (ئیتر وتویەتی تا ئەو کاتە نەمزانیوە عەسکەریش دەگری!).

دەشێت پاش ئەم ڕووداوە ئیتر حەلاوەخانی دایکی جێگەنشین بووبێ لە سلێمانی و لەگەڵ مێردەکەیدا نەڕۆیشتبێت بۆیە باوکی ڕەفیق حیلمی لە کەرکوك ژنێکی تر دەهێنێت کە ئەم ژنەیانی خەڵکی کەرکوك دەبێت و لەوێش کوڕوکچێکی دەبێت، وەك باسمانکردون، بەڵام حەلاوەخان هەر خۆی و منداڵەکانی خۆی لەسلێمانی دەمێننەوە و ساڵح ئەفەندی باوکی ڕەفیق حیلمی زووزوو دەچێتەوە لایان وهەمیشە لەگەڵ سوپادا لەسەر سنوور دەبێت یا لەجەنگدا وەك جەنگی عوسمانلی و روسیی کە لە سلێمانی پێیان وتون (عروسەکان).

ڕەفیق حیلمی بەپێی ساڵانی ئیشوکاری و ئەو ڕۆژنامانەی کاری تێداکردوون، کە لەتورکیا دەگەڕێتەوە دەست دەداتە خەباتی سیاسی، بەڵام هەر واز لەشیعرونوسین ناهێنێت، بەپێی ئەورۆژنامە سەرەتاییانەی لەکاتی حوکمدارێتی شێخ مەحمودی نەمردا لە ١٩٢٠-١٩٢١دەرچوون واتە بەپێی (ڕۆژی کوردستان)، (بانگی کوردستان)، (ئومێدی ئیستیقلال) لەبیستەکاندا ڕەفیق حیلمی لەسلێمانی بووە.

بەپێی ئیشوکاری میریی و (دەفتەری خزمەتی) لەساڵی ٣١ ڕۆمیدا ٩/١تا ٣٣/٥/٣١ی ڕۆمی مەئموری کشتوکاڵیی بووە لەشاری سلێمانی لە ٣٣٢/٦/١-٣٣٣/٦/٣٠کاتب بووە ١٩٢١/٣/١٥ بەپێی یاداشتەکانی لەساڵانی بیستدا لەسلێمانی سەرقاڵی کۆمەڵەو ڕۆژنامە دەرکردن بووە سەرەتا بەتورکی شیعری داناوە وشیعری غەزەلی نوسیووە دوایی وازی لەمەهێناوەو کەوتۆتە دانانی شیعری سیاسیی و نووسینی کۆمەڵایەتیی و گاڵتەوگەپ لەگەڵ هاوڕێکانیدا وەك ماجید مستەفا مەحمود جەودەت و لەماڵی تۆفیق وهبی بەگ لە سەردەمی مێجەر سۆن دا دژی ئینگلیزبوون و سەرقاڵی دامەزراندنی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد و کاری ڕۆژنامەگەریی بوون.

ئەو کاتەیش کەلە ئەستەمبووڵ دەخوێنێت و باوکیشی هەمیشە دوور دەبێت لەماڵ و لەجەنگ دەبێ لەسەر سنور، شەفیقی برای دەبێتە پیاوی ماڵ کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئامادەیی دەبێت وئاگای لە دایکی و پوری و خوشکەکەی دەبێت. کە لە ئەستەمبووڵ دەگەڕێتەوە ژندەهێنێت و هەر لەگەڵ دایك و خوشکەکەی و باوکی دەمێنێتەوە، بەڵام باوکی زوو کۆچی دوایی دەکات لەبەر ئەوە هەر زوو دەبێتە پیاوی ماڵ و باری بەڕێوەبردنی ماڵی دەکەوێتە ئەستۆ. ڕەفیق حیلمی سەردەمی باوکی زۆر

بەخۆشیی رادەبوێرێت وەکو وتمان لە حەوشی گەورە، بەڵام کەباوکی کۆچی دوایی دەکات، بەماوەیەکی کەم دوای ئەویش دایکی کۆچی دوایی دەکات ئیتر ژیانی دەگۆڕێت. بەپێی ئەوەی لەیاداشتەکانیدا نوسیوویەتی لە نێوان (١٩-٢٠ ) ساڵیدا ژنیهێناوە بەڵام تا پێنج ساڵ منداڵیان نەبووە و خۆی و خێزانەکەی زۆر ئارەزووی منداڵیانکردووە، بەڵام کاتێ ئەوخەونەیان هاتۆتە دی، ئەم لە ئەنقەرە بووە وەك نوێنەری شێخ مەحمودو خێزانەکەیشی بەدووگیانیی بەشاخ وکێوانەوە بووە (*)

واتە رەفیق حیلمی لەنێوان ١٩٢٠-١٩٢١دا ژنهێناوە پێش چوونی بۆ ئەنقەرە وەك نوێنەری شێخی نەمر. دایکمان جاروبار باسی خەسوو خەزوری زۆر بەجوانی بۆدەکردین. کەم بووك هەن وا بەباشی باسی خەزوروخەسویان بکەن.

دەیوت (حەلاوەخان)ی دایکی رەفیق حیلمی لە وێنەی کەم بووە لە هێمنیو لەسەر خۆیدا لە خانوومانییو وێڵ و رەوشتی جواندا، لەدەست رەنگینیو ماڵداریدا، نەخش ونیگاری بەمەکینەی خەیاتی کردووەو زۆر بەجوانی ئاگاداری ماڵ ومنداڵ و کەسوکاریشی بووە و چاودێریی دایکمانیشی کردووەو خۆشیویستووە هەروەها ئەویش دیاربووە خەسووی زۆر خۆشویستووە و خزمی یەکیش بوون، کەدایكو باوکی رەفیق حیلمی کۆچی دوایی دەکەن ئەو تەنها خوشکەی ئیتر لێیان جیانابێتەوە ، تامردنیش هەر لەگەڵیاندا دەبێتو هەرلەبەر باوکیشم لەگەڵ براکەی تری (واتە لەگەڵ مامە شەفیقم) ناچێ بۆ تورکیا، کاتێ ئەو مامەم دێتەوە لایان رەفیق حیلمی لەبەندیخانەی کۆیە دەبێت و ناهێڵن بیبینێت. دایکم (١٣)کەسی خۆی بەنەخۆشی جەنگ واتە رشانەوە کۆچی دوایی دەکەن پاش جەنگی جیهانیی یەکەم ئەوانیش دایکیوبرایەکی گەنجیو دوو خوشکیبە (٤) بەمنداڵەوە، تەنها برایەکی و باوکی مابوون کە ئێمە بینیومانن. رەفیق حیلمی هاوسەرەکەی زۆر خۆش دەویستو بەهەوڵو تێکۆشان هێنابووی هەرئەمیش خێزانی بوو تادوا رۆژی ژیانی.رەفیق حیلمی پاش کۆچی دوایی دایكو باوکیو پێش چوونی بۆ ئەنقەرە لەخانووی کرێدا دەبن، کاتێ دەڕوا بۆ ئەنقەرە دایکمو پورم دەباتە ماڵی خەزوری چونکە خزمی یەك دەبن. کاتێ شێخ

---

(*) بڕوانە یاداشتی رەفیق حیلمی بەرگی حەوت

مەحمود لادەبرێت ئینگلیز سلێمانی بۆردومان دەكات هەموو لەگەڵ باپیرمان (باوكی دایكمان) دەچن بۆ سورداش كە زۆرێك لەماڵ وموڵكی خۆیی لێدەبێت و كاتی خۆی (ماڵی مودیر) بووە لەترسا دەچنە شاخەكان و لەشكەوتدا خۆیان دەشارنەوەو لەوێ دایكم كچێكی دەبێت لەكاتێكدا كە باوكم هێشتا لەئەنقەرە دەبێت و هیچ هەواڵی نابێت و ئەویش هەواڵیان نازانێت، ئەمەیش ناسۆرێكی تری ژیانی سیاسیی رەفیق حیلمی‌یە.

لەپڕ ژنێك ئێوارەیەك پێیان دەڵێت ئەمڕۆ لە ئەنقەرە دەگەڕێتەوە، ئەمەڕاست دەبێت، ئەوشەوە خۆی دەكات بەدالانی ماڵی باپیرماندا، دایكم بڕواناكات هەر نایناسێتەوە. هەر ئەوكاتە بەوجلە كوردیانەوەو بەو سەرورپشەوە، وێنەیەك دەگرێت لەگەڵ مەحمود ئاغای خالۆزایدا كە (هاوسەفەری) بووە لەگەشتەكەیدا.

لەپاشاندا دوای هەوڵ وتەقەلایەكی زۆر شێخی نەمر دەیكات بەنوێنەری خۆی ودەبێتە (تەرجومان) وەرگێڕی گفتوگۆی نێوان شێخی نەمرو ئینگلیزەكان بەزمانی فەرەنسی وئیتر شێخ مەحمود دەیكات بەلێپرسراوی (ئومێدی ئیستیقلال) بەنامەی تایبەتی خۆی پاش دامەزراندنی (كۆمەڵەی كوردستان)ی مستەفا موڵكی پاشاو بەڕێوەبردنی كۆمەڵەو ڕۆژنامەكەی پێ دەسپێرێت پاش كۆتایی حوكمدارێتی یەكەمی شێخ مەحمود و گەڕانەوەی مستەفا پاشا باوكم دەڕوات بۆ كەركوك بۆلای مامی (واتە بۆلای تۆفیق ئامان) ئەویش لەبەر دەست كورتی و نەبوونیی.

## لەکەرکوك

١٩٢٠/١٢/١٦-١٩٢١/٨/٢١

دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانەی (ظفر) لەکەرکوك،بڕوانە یاداشتەکانی بۆ درێژەی ئەم باسە و بۆ نووسینەکانی لەرۆژنامەی (حوادث) ی تورکی عوسمانلی یان (النجمە)ی سەردەمیداگیرکردنی ئینگلیز،ئەمەیشی بەدرێژی لە پێشەکی دیوانی پاش تەممووزدا ولەیاداشتەکانیدا نووسیوەتەوە سەبارەت رۆڵی سیاسی لەکەرکوك چۆن تورکەکان ناڕازی دەبن لە شیعرەکانی بەتورکیو لەگەڵ ئۆزدەمیر گفتوگۆ دەکاتو ئەو توڕە دەبێتو دەڵێت ئاگادارم لەشیعرەکانت کاتێ لە کۆبوونەوەیەکدا لە ڕواندز دەیبینێت. [1]
ئینجا چۆن ئینگلیزەکان هەوڵدەدەن وازلە وتارو شیعرەکانی لە (النجمە) دابهێنێت و بچێتە سەرڕێی ئەوان ئیتر یاداشتی بدەنەوە،لێیخۆش بنو بیکەن بەلێپرسراوی رۆژنامەکە.

بەڵام قایل نابێت، لەبەرئەوە دەکرێت بە مامۆستا لە قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت لەسلێمانی لە (١٩٢١/٨/٢١-١٩٢٤/٩/١٤) دواتریش ڕەوانەی کەرکوكو ئینجا هەولێری دەکەنو دەینێرن بۆ (مەجەرالکبیر) لە١٩٢٤/٩/١٤- ١٩٢٦ بۆ ماوەی دووساڵ(٢)

## ١٩٢٨ ژیانی تایبەتی خۆی و خێزانەکەی لەکەرکوك

ساڵی ١٩٢٨ لەکەرکوك باری ئابوریان پەشۆکاوژیانیان تاڵ دەبێت، دایکمو خوشکەکەی باوکم گەلێك کێشەو ئەندێشەی خۆیانیان بۆ گێڕاومەتەوە،لەو سەردەمەدا مامی باوکم لەوێ یارمەتیداون، بەڵام دیارە گەلێك لافاو ئەمدیو ئەو دیوی پێ کردووە.

لەوێ کوڕێکی دەبێت بەناوی (ئەمین زەکی) کەکوڕی نۆبەرەیەتی بەڵام بەساڵونیویی کۆچی دوایی دەکات، دەیانوت گوایە بە بۆن کەوتووە (ئەمەش شتێکی زانستیە)و دەشێت وابووبێت، پاش دووڕۆژ دەمرێت، کچێکیشی تووشی نەخۆشی دەبێت، بەوە

[1] ڕەفیق حیلمی پێش چوونە ئەنقەرە بەئەمری شێخ دەچێتە ڕەواندز بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئۆزدەمیر، درێژەی ئەم باسە لەیاداشتی ژمارە(٧)دا دەبینن.

هێندەی تر خێزانەکەی و خۆشی دڵگراندەبن و ئەم کچەیشی کاتێ کەدەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی کۆچی دوایی دەکات.

کەلەکەرکوك دەبن باوکم بێجگە لە کچە گەورەکەی دوو کچی تری دەبێت یەکێکیان نازانم لە کوێ لەدایك بووە، کاتێ کە دەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی نەخۆش دەبێت و هەر بەپێنج ساڵیی کۆچی دوایی دەکات. پێش مردنی ئەم کچەی، لەکەرکوك کچێکی تری دەبێت، هەر زوو پاش ئەمە ڕەفیق حیلمی دەگوێزرێتەوە بۆ سلێمانی و لەوێ ئیتر، ئەوکچەی دیکەشیان کۆچ دەکات و دەڵێن باوکم تاساڵێکیش هەموو سپێدەیەك ، بەدەستەگوڵەوە چۆتەسەر گۆڕەکەی ئینجا چۆتەسەرکار، کچەکەی تریشی دووچاری هەمان نەخۆشیی بووە کە پێدەچێت ( ذاتا رئە) بووبێ،بەڵام ئەمیان نیۆنمەکیان گرتۆتە سنگی و چاکبۆتەوە، ئەویتر نۆژدارێکی ناشی[*]دەیخاتە پەتۆی تەڕەوە گوایە تای دادەبەزێنێت و بەوە دەمرێت. بۆیە زۆر باوەڕی بەدەرمانەکانی پورە ڕەحمە بووە زیاتر لە چارەسەری پزیشکیی.

---

[*] دەیانووت ئەم نوژدارە هیندیی بووە.

# چیرۆکی لیره ئاڵتونەکە

دایکم بۆیگێڕاینەوە وتی: ئەوکچەمان کە لەکەرکوك بووم پێی بەخێربوو بۆمان، بەڵگەش بۆئەوە ئەو لیره ئاڵتونەبوو کە گشت شەوێك بۆم دەخرایە ژێر سەرینەکەم، گوایە شەوێك خەودەبینێت لەخەویدا پیاوێکی پیرۆزی سەرورپیش سپی، جل سپی دێتە خەوی، دەڵێت: لەمشەوەوە و گشت شەوێك لیرەیەکی ئاڵتون دێتە ژێر سەرینەکەت، دەبێت ئەمە لای کەس نەدرکێنیت. هەرکاتێك بەهەرکەسێك بڵێیت یەکسەر ئەوە دەبڕێت. دایکم وتی شەوێك‌و دووان‌و سیان‌و دە، هەر خۆم گرت و بەیانی لیره ئاڵتونەکەم دەردەهێناو هەڵمدەگرت، تا بووە نزیکەی بیست لیره. ئیتر خۆم پێ نەگیراو بەیانیی لیرەکەم لەژێر سەرم دەرهێناو پیشانی باوکتانم دا، ئیتر لەوشەوەوپیاوە ریش سپییەکە نەهاتەوە! بۆ ئاگاداریی دایکم و باوکم تاکۆچی دوایی باوکم هەردووکیان و پاش دایکم تاکۆچی دوایی خۆی لەسەر هەمان جێگە (چرپا) دەنوستن، ئینجا ئایا باوکم کە پارەی باشی هەبووە، ئەو ئەم لیرەیەی بۆ داناوە و تاقیکردۆتەوە یانا ئەوە نازانین؟ باوکم بەهیچ جۆرێك هیچی بۆ ئێمە وبۆکەس نەگێڕاوەتەوەو کەسیشمان هیچمان لێ نەدەپرسی چونکە وەڵامی نەدەدایەوە. بەپێی دەفتەری خزمەتی ۱۹۲٦/۹/۱و۱۹۲۷/۹/۱و۱۹۲۸/۹/۱ نووسراوە رەفیق حیلمی لە قوتابخانەی (العلمیە) بووە لە کەرکووك ولە ۱۹۲۸/۹/۱ دا گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندیی لەسلێمانی و تا ۱۹۳۰ مامۆستای قوتابخانەی ناوەندیی سلێمانی بووە.[1]

ساڵی ۱۹۳۰ لەسلێمانی دایکم دووەمین کوری بووەو باوکم بەناوی باوکی واتە (شەوقی)یەوە ناوی ناوە، هەروەها بەداکیشمیان دەوت دایکی شەوقی، پورمان بە باوکمانی دەوت (کاکە) خوشکەکەی تری و ئامۆزاکانیشی هەر بەکاکە ناویاندەبرد .

---

[1] بەپێی دەستخەتێکی رەفیق حیلمی، نوسیویەتی لە (٦) ئەیلولی رەشی ساڵی ۱۹۲۹دا لە سلێمانی نزیکەی مانگێك بەندکراوەو دواتر گواستویانەتەوە بۆ هەولێر و لەوێشەوە (دوورخراوەتەوە) بۆ ناسرییەو باسی ئەوەی بەدەستخەتی خۆی نووسیوەتەوە کە لە ناسرییە شێخ مەحمودی بینیوە بەدوورخراوەیی هەر وەك خۆی،

## لەهەولێر

١٩٣٠/١٠/١-١٩٣١/١٠/١ [٢] كراوە بەمامۆستای ئامادەیی لەهەولێر، من ئەو ماوەیەم هیچ لەبیرنیە چونكە زۆر منداڵ بووم . دەڵێن لەوێ لەسەر قەڵا ژیاوین.
پاشان زانیمان كە باپیرمان (باوكی باوكمان) لەهەولێر نێژراوە،چەند هەوڵماندا بزانین لەكوێ‌و لەكام گۆڕستانە نەمانزانی .

## لەناسریيە

بەپێی فەرمانی میریی لە ١٩٣١/١٠/١-١٩٣٢/١٠/١ بەنەفیكراویی چووە بۆ ناسرییە پاش گوێزرانەوەی لەهەولێر. جیاوازیی مێژووی گواستنەوەی بەپێی فەرمانی میریی‌و چوونی بۆ ناسرییە لە ڕاستیدا لەبەر ئەوەبووە زۆر جار بەو فەرمانەی نەكردووە یان بۆیان گۆڕیوە. بڕوانە دەستخەتەكەی كەچووە بۆ بەغداو چاری نەبووە فەرمانەكە بگۆڕێت چووە بۆ ناسرییە، ئەمە بۆتە هۆی پاش وپێشی مێژووی گواستنەوەكەی، من خۆم تائێرەش هیچم بەبیردانایەت.

---

[٢] پاش نوسینی ئەم باسە دەستخەتێكی نزیكەی ٣٠ لاپەڕەیی (ڕەفیق حیلمی) م دەستكەوت بەدرێژیی باسی كارەساتی ٦ی ئەیلولی ١٩٢٩ ی سلێمانیی كردووەوباسی بەندكردنی نیشتمانپەروەرەكان كەخۆی یەكێك لەوانە بووە ئینجا ڕەوانە كراوە بۆ هەولێر و لەوێ بۆ یەكەمجار بەكورتی‌و ئەویش هەر بۆئەوەی باسی ئەو ڕۆژەبكات كە ئەمری (نفی) دەرچووە بۆ ناسرییە، باسی وێنەیەك لەژیانی خێزانیی كردووە. چۆن ئێواران نانی نەخواردووە لەماڵەوە بەڵام ئەو ئێوارەیە چۆتەوەو لەگەڵ خێزانەكەی دانیشتووە و بەگاڵتەكردن‌و بێباكییەوە نانی لەگەڵ خواردون.
دیارە تا (باگراوند) دروست بكات بۆ ئەو هەواڵە ناخۆشە..، ئینجاچۆن چووە بۆ بەغداو چی بینیووە لەوێ‌و چون هەر ناچار بووە بڕوا بۆ ناسرییە و لەوێ شێخی نەفی كراویشی بینیووە.. ئەوباسە بەدرێژی بڵاو دەكەینەوە كە دەشێت ببێت بە بەشێك لەیاداشتەكانی. لەوێدا باسی ناسینی شێخ مەحمود-- ی كردووە بۆ یەكەمجار و پێش حوكمدارێتی، كاتێ ئەویش نفی بووە لە ناسرییە.
تێبینی/ بەبەراوردكردنی مێژوی گواستنەوەی لەشارێكەوە بۆ شارێكی تر لەگەڵ ئەوەی لەم دەستخەتەی سەرەوەدا نووسراوە جیاوازی دەبینرێت. نازانم بۆچی؟ وەك لەدەستخەتەكەدا ئەیلولی رەش ١٩٢٩ لەم ساڵەدا نێرداوە بۆ هەولێر كەچی ئەوەتا نووسراوە هەولێر ١٩٣٠- ١٩٣١و (١٩٣٠ لەدەستخەتەكەدا) دەڵێ ڕۆیشتیووە بۆ ناسرییە ئیتر چۆن لەهەولێربووە؟ رەنگە كۆتایی ١٩٣٠ چووبێت بۆ ناسرییە.

## لەموسڵ

١/١٠/١٩٣٢-١/١٠/١٩٣٤ مامۆستای ناوەندیی موسڵ بووە. وەك بەکتێبەکانیدا دەردەکەوێت. لەوێ نووسیونی و لەچاپیداون ئەو ماوەیە پەیوەندیی هەبووە بەگەلێك لەخەباتکارانی عەرەبەوە لە دژی بێگانەی وەك ئینگلیز، لەوێ (د.مەجید خدوری) ناسیووە، کەمامۆستا بووە لەگەڵیدا.. رەفیق حیلمی لەوێ مامۆستای بیرکاریی و زمانی فەرەنسی بووە و لەجێی مامۆستای ئینگلیزیش لەکاتی نەخۆشیی ئەودا ئینگلیزیشی وتۆتەوە و نامەی سوپاسی بۆ هاتووە لەسەر ئەوە، چونکە پارەی لەسەر وەرنەگرتووە. بەمەدا دەردەکەوێت ئینگلیزیشی زانیوە، لەیاداشتەکانیدا باسی نووسین و خەباتی لەموسڵ کردووە.

لەموسڵیش کچێکی تری دەبێت بەڵام زۆر بەگران مامانێکی روسیی بەناوی (مەدام پروسکی) بۆ دەهێنێت. خۆم وەك خەو ئەم ماوەیەم بەپچڕپچڕیی دێتەوە بیر بەتایبەتی کەلەگەڵ براکەمدا بووم.

## من و شەوقیی برام لەموسڵ ١٩٣٣-١٩٣٤

من و شەوقی برام لە رەوزە بووین، بەیانی پێکەوە بەناو گۆڕستانێکدا دەچووین بۆ رەوزەکە، پاش نیوەڕۆ پێکەوە بەناو هەمان گۆڕستاندا دەگەڕاینەوە. موسڵ وەکو کەرکووك ئەوەیان خراپە گەلێك گوڕستانیان لەناو ماڵەکاندا هەیە، منداڵ بووین بیرمان لەجنۆکەوشتی وا ئەکردەوە، ڕۆژێکیان لەکاتی گەڕانەوەدا لەگەڵ هاوڕێکانمانا بەناو ئەو گۆڕستانەدا ئەڕۆشتین، کاتێك ئاوڕم دایەوە براکەمم نەبینی کە زۆر وردیلە و ئێسك سووك و سوورو سپی و قژی لوول بوو رەنگی قژیشی زێڕین بوو باوکم کە قژە درێژە لولەکەی بڕی لەوێ، خستیە شووشەیەکی گەورەوە تاچەندساڵ پاراستی، ئەی هاوار چی لێهات ؟ ئەم لاگەڕام ئەولا گەڕام نەبوو فرمێسك وەك باران لەچاوم دەرژا، تادرەنگ داهات من وەك شێت بەناو ئەو گۆڕستانەدا گەڕام بۆ براکەم نەمدۆزییەوە، تاریك داهات و ناچار گەڕامەوە ماڵێ لەدەرگای حەوشەوە خزمەتچیەکی خۆمان بینیمی

وتی کوا براکەت؟ بەگریانەوە وتم ون بوو.. تاچەند ساڵیش ئەو خزمەتچیە لاسایی ئەو ڕۆژەی دەکردمەوە بەگاڵتەوە وتی: هەیرۆ چیت لێکرد؟ بەدایکم وپورمی وت وا لەگەڵی دەڕۆم دیارە ئەو منداڵە بەستەزمانە لە پەناقەبرەکانا ماوەتەوە. چوین دیمان لەپەنا کێلێکدا دەگریاو تۆقی بوو لەترسا. لەبیرەوەرییە پچرپچرەکانی ترم لەموسڵ جارێك باوکم بردینی بۆ ماڵێکی گەورە وەك تێگەیشتم ماڵی یەکێکی زۆر مەزن بوو دوای مقۆمقۆ و خۆئامادەکردن و ئامۆژگاریی وابکەن وامەکەن، چوین وەك لەبیرم بێت و پاشان بەپێی خوێندنەوەم ئەوە ماڵی (شێخ ئەحمەدی بەرزانی) بوو هەر ئەوەندەم بیرە، گوێزی هەورامانم خوارد، چیتر ؟ بیرم نیە ئەو گوێزە زۆر چاکوخۆش بوو لەبیرم ناچێت بەگوێنیش لێی دانرابوو، لەژێر خانێکدا.

جگەلەمە ئەو خانووەی تێیدابووین لەموسڵ هەرچەندە بەحاڵ وەك خەو لەبیرمە دوونهۆمیی بوو، ساردایوێکی تێدابوو، ترشیات وزەخیرەیان لێدادەنا شەوی ڕەمەزان لەسەربان کاتی پارشێو منیان دەنارده خواریّ بۆ ئەوساردداوە ترشیات دەربهێنم، نەدەترسام بە تاریکی دەچوومە خواریّ و ئەمەم هەر لەبیرە. جگەلەوە ڕۆژێکم بیرە وتیان یەکێك لەمامۆستاکانم هاتبوو بە میوانمان چونکە خزممان بوو.

لەوەزیاتر دەبێ بڵێم لەپشتی عارفە سووری مەصرەفەوە برای هەمزەئاغای مەصرەف گەلێك کەسوکارمان جێنشینی موسڵ بوون سەریان لێدەداین و یەکێکیان خرین و سوروسپی بوو زوو زوو دەهات و کوبەی (موسڵی) بۆ دەکرین، ئێستا لە لەندەن نێژراوە بەمانەمان دەوت خزمە موسڵاوییەکانمان. دوایی زۆریان دەهاتنەبەغدا و لەوێش سەریان لێدەداین.

دواشت ڕۆژی گواستنەوەی باوکم لە موسڵ لەبیرە، ئەو ڕۆژە هەموو بەردەست و ئەو خزمانەو خۆمان هەر خەریکی کەلوپەل کۆکردنەوە بووین، لۆری لەشەوێوە لەبەردەرگا باردەکرا شت لەسەربانەوە فڕێ دەدرایەخواریّ، ئێمەش شڵەژاو.. خۆشی خۆشی دەچینەوە بۆ سلێمانی کە تائەوکاتە هیچی سلێمانیم بەبیردا نەدەهات و نەمدەزانی چۆنە و نەمدەزانی باوکم بۆچی دوورخراوەتەوە لەوێ.

## لەبەسرە

١/١٠/١٩٣٤-١٢/٨/ ١٩٣٥ کرا بەمامۆستای ناوەندیی بەسرە بەڵام ئەوەی جێگەی گومانە نووسراوە ١/١٠/١٩٣٤-١/٣/١٩٣٥ مامۆستای(غەربییە)بووە لەناوەندیی، چۆن وەك لەسەرەوە کرابووبە مامۆستای ناوەندیی بەسرە لەم مێژووەدا. کەچی لەهەمان مێژوودا مامۆستای غەربییەبووە؟ ئایا ئەمە غەربییەی بەغدایە یان لە بەسرەش قوتابخانە هەبووە بەم ناوەوە؟ لێرەدا تەنانەت فرمان هەیە بەمێژووی ٢٧/٣/١٩٣٥ ژ(٣٢٦٩) کەموچەکەی ١٨ دینار بووە.

تائەوکاتە باوکم خۆی و خێزانەکەی بە (١٨)دینار دەژیان لەوکاتەدا ئێمەی لە سلێمانی بەجێهێشتو هەر خۆی چوو بۆ بەسرە، ئیترلەسلێمانی لەسەرەتادا لە خانووی ئەحمەدی عەزیز ئاغادا نیشتەجێ بووین.

## بەسەرهاتێکی سەیر لەسلێمانی

شەوێك لەسەربان دەنوستین، لەخانووەکەی ئەحمەدی عەزیزئاغادا(*) سەربانەکە گوێسوانەی نەبوو، پشتمان یەکێك لە خێزانی (قەفتان)ەکان بوو. بەیانی هەستاین تاقە براکەمان لە جێگەکەیدا نەمابوو هاوارمان لێ بەرزبۆوە چی لێهات؟ هەموو دەرو دراوسێ ڕاست بوونەوە، ماڵەکەی پشتمان هاواریان کرد مەترسن ئەوەتا لە باخچەکەی ئێمە نوستووە. هەمووسەرسام بووین منداڵێکی وابچووك چی گەیاندیە حەوشەی دراوسێکەمان لەکاتێکدا کە هەر ٣-٤ ساڵان دەبوو، دیاربوو کەوتبووە خوارێ، لەوەیش سەیرتر سەرپۆشێکی سپی لەژێریدابوو تێی ئاڵابوو هیچ کەسێك نەیزانی سەرپۆشی کێ بوو! هیچ ئێشو ئازاری نەبوو تەنانەت خەبەریشی نەبووبۆوە. بەڵام هەر وەك هەمیشە خێرا باجی عاسمی سەکینەی دەرمانسازی سلێمانیو مامان گەیشتنەلامان و لەشی بەکافور هەنوو ئاوی پرتەقاڵی دایە و ئیتر باش بوو.

---

(*) ئەحمەدی عەزیز ئاغا لەلایەك مێردی پورزازای دایکمان بوو لەلایەکی ترەوە هاوڕێی گەنجێتی باوکمان بوو. لە یاداشتەکانیدا رەفیق حیلمی باسی کردووە.

باجی عاسم زۆر بەناوبانگ بوو بۆ دەرمانسازی میللیی و چەند جاری تر لەبەسەرهاتی لەپڕدا هاتووەو باش چارەیکردووە وەك كاتێ خوشكە بچوكەكەمان وەك دەڵێن بەتای گەرم تووشی وڕێنە بوو بوو.

لەو خانوەدا کەمێك بیرەوەریی ترم هەیە وەك خەو بەبیرمدا دێت. هێشتا نەچوبوومە قوتابخانەی سەرەتایی. ئەوەی لەبیریشمە تەنها پەیوەندیی هەیە بە خۆمو دایکم و خوشكو براكانمو ئەو پورەمانەوە، هیچ باسی باوكم لەیادنیە چونكە هەر زوو ئێمەی بەجێهێشتووە چووە بۆ بەسرا.ئەوەی لەبیرم ناچێتەوە ئەوەیە ڕۆژێك لەسەر پلیكانەكانی حەوشەكە دانیشتبووم، چاوم لێبوو دایكمو پورم زۆر سەرقاڵ بوونو مەنجەڵی مسی گەورە قوڵپوهوڕ لەسەر ئاگری دەكوڵا و داری نێڵەنێڵ لەژێردابوو كیسەی سپی گەورەش بە پەتەوە هەڵواسرابوو.... تك تك شتێكی وەك یاقوتی لێدەهاتە خوارێ بۆ ناو مەنجەڵێكی تر..

وتم(بجی) وەرە بمگەرێ قاچم ئازای تیایەو ناتوانم بێمە خوارێ...بجیم ڕایكرد وتی چیتە؟ وتم قاچم ئێجگار دێشێ و ناتوانم هەستمە سەرپێ. كردمیە كۆڵی و بردمییە خوارێ وتی دوشاوی گەزۆ دەگرین هەر لێبینەوە دەتبەین بۆلای نوژدار ئەو ئێشی قاچو پەككەوتنەم هەر لەبیرناچێتەوە بەلام هەر ئەو سەر پلیكانەیەم لەبیرە ئیتر چیان لێكردم نازانم.

پاش ئەمە دیسان پچڕپچڕ بەبیرمادێ لە خانویەكی تربووین چۆنو كەی چووبووینە ئەو خانوەوە نازانم. ئەمە خانوی ساڵحی چایچیان پێدەوت.

# له ناسۆرەکانی گواستنەوەی زووزووی لەم شار بۆ ئەوشار

وەك وتم لەبیرم نییە کەی لەخانووی ئەحمەدی عەزیز ئاغا گواستومانەتەوە بۆخانووی سالّحی چایچی، ئەوەی لەبیرمە ئەم خانووە دوو نهۆم بوو، حەوشەکەی لەپێشەوە بوو، ژێرخانی هەبوو لەخوارەوەو باڵەخانە و بەردەمی هەیوان بوو..

لەبیرمە رۆژێك بەدوای پورما بەسەر پەیژەی داردا سەرکەوتم ویستمان بچین جێگە دابخەین، لەسەربان دەنووستین، لەپڕ پێم لەپەیژەکە ترازا و کەوتمە خوارێ بۆ ناو حەوشەکە کە بەبەردی مەرمەڕ داڕێژرابوو، لەسێ لاوە سەرم شکا بوو..باوکم لەوێ نەبوو، لە باشور بوو وابزانم لەبەسرە بوو.

جگە لەمە لەوماوەیەدا پەنجە توتەی پێم شتی پیاچوبوو ئازارەکەی تەشەنەی کردو پێلاوم بۆ لەپێ نەدەکرا نەمدەتوانی بچمە قوتابخانەو ئەوەساڵی یەکەمی چوونم بوو بۆ قوتابخانەی سەرەتایی. باوکم کەلەوکاتەدا هاتبۆوە برینپێچی هێنایە ماڵەوەو خۆی بەسەریەوە وەستا تا ئامێرەکانی نەشتەرگەرییەکەی خاوێنکردەوەو هەڵیدڕی و برینەکەی پاککردەوە و خاوێنی کردەوەو بەباش بەستی. دوایی زانیم بۆچی هێندە بە پەرۆش بوو هێندە باسی خاوێنیی دەکرد ئەویش کە باسی برینەکەی پێی (جەمیل)ی برایم لەیاداشتەکانیدا خوێندەوە. ئەمانە بەو ناسۆرە نەدەبوو کە دای لەجەرگی هەموومان.

خوشکێکی بچووکمان هەبوو، ناوی گوزیدە بوو، سوروسپی، قژی وەك زێڕ ئێجگار خرپن و جوان بوو، (*) پێنج ساڵان بوو، درەنگ پێی گرت باوکم لەخۆشیدا لەبەسراوە نەعلێکی منداڵانەی زۆر جوانی بۆ نارد. هێندەی پێنەچوو ئەو خۆشییەمان کۆتایهات ، گوزیدە سورێژەی گرتوو باوکم لامان نەبوو، لەبەسرە یان ناسرییە بوو... پیاومان نەبوو براگەورەکەم لەمنیش بچوکتر بوو.. خزم و کەسیش بەباوك نابن. سورێژە مایەوە، ئەو

---

(*) لەم دواییەدا بروسکەیەکم دۆزیەوە لەناوشتەکانی رەفیق حیلمی‌دا کە لەماڵەوە بۆی چووە هەواڵی نەخۆشیی ئەم کچەو پێویستیان بەگەڕانەوەی بۆلایان لەسەر ئەو بروسکەیە بوو، رەفیق حیلمی بەقەڵەمی سور، چەند دێڕێکی نوسیوە ئاگری جەرگ گڕی گرتووە لەدڵیا ئەوکاتەی زانیویەتی کچێکی تری پێنج ساڵی لەساتی مردندایە و خۆی لەوێ نیە. لەسەر هەمان بروسکە رەشنوسی داوای ئیزندەکات کەبچێتەوە بۆ سلێمانی و چەند دێڕ شیعری بەپچڕپچڕی نوسیووە گڕ لە بەرد بەردەدا . بڕوانە دەقی ئەو بروسکەو شیعرە (بەدەستوخەتی من)

بەستەزمانە هەر بۆی کەوت، بەتای گەرمەوە و بێهۆش. ئومێدمان نەما پێی، دیاربوو دایکم نامەی ناردبوو بۆ باوکم ئاگاداریکردبووەوە ئەویش بروسکەی نارد دێتەوە، ئەو رۆژە ئێمە لەقوتابخانە بووین، هاتینەوە وتیان باوکم دێتەوە، دایکم لەخوارەوە خەریکی خواردن ئامادەکردن بوو، کچەکەمان لەسەرەوە بوو وامانزانی نوستووە ئەو شەوە درەنگ چاویکردەوەو داوای ماستی کرد، چەند رۆژ بوو هیچی نەخوارد بوو، لەخۆشیدا هەموو وامانزانی چاکبۆتەوە. کە لە قوتابخانە هاتینەوە چووینە لای بۆسەرێ دەرکەوت گیانی سپاردبوو، وتیان سورێژەکەی دەرنەکرووە بۆیە. باوکم نەگەیشت بیبینێت، کەسوکار ناشتیان.

# (بۆگوزیدە)

-ڕەفیق حیلمی-

بیستم گوزیدە نەخۆشە یاران
گوڵگوڵی بووە لەشی نەرمۆڵەی
ئێستە بەلەنجە ناڕوا وەك جاران
تۆراوە لێمان دیارە بەبۆڵەی
گوزیدەی شیرین بەس بناڵێنە
چاوێ هەڵبڕە بابە هاتەوە
بابە بەخێربێی نوروەپاتەوە
دەرمانی دەردم هاوەلاتەوە
توخوا گوزیدە ئەمجارەش مەمرە
باقی بەخۆشی بگەڕێمەوە
مەڵێ ایطاعت شرطە بەم ئەمرە
ئەڕۆم و ئیتر ناگەڕێمەوە
گوزیدەی نازدار ئەوا دێمەوە
بەتاقە ماچێ لەوچاوەشینەت
لەوزولفە خاوەی زەردو شیرینەت

توخوا ئەی چارەی ئەفسونکاری من
ئەمە مژدەیە بۆ منت هێنا
لەبۆتەی غەمدا قاڵ بوو ڕۆحی من
وەك خەمم کەم بێ تۆش غەمت هێنا
بەم نیوەشەوە بۆچ وادانیشتوون
بەبێ دەنگ وەکو خەیاڵی خێوان
بۆچ وامەلولن کێیە وادیسان
بەفرمێسك ئیمشەو چاوی پێ شتون؟!

ئـەم شـیعرەی دیـارە بەغـەم و پەشـۆکاویی نووسـیوە لەسـەر ئـەو کاغـەزەی کـە رەشنوسـی داوای ئیزنـی سـەفەرکەیەتی پـاش گەیشـتنی بروسـکەکە. بەپێنوسـی سـوور نووسـراوەو هەرچەند دێڕێکی لەسەر دیوێکی کاغەزەکەیە.. بۆیـە رەنگـە پـاش و پێش لێرەدا نووسرابێتەوە، چونکە نازانم کام بەش پاش ئەویترە. هـەروەها لەچـەند جێگـە، چەند وشـەودێڕێکی گۆڕیـووە. هـیچ کاتێك وا پەشـۆکاو نەینووسـیوە. دەبیـنین چـەند پەرێشـان بـووە، دڵـی پڕبـووە، نـەیزانیوە چـۆن دەردەدڵ بکـات. لـەودوورەوە ببیسـتێ کچێکی واناسكو نـازداری گیانـدەدات وەك وتویـەتی چاوشـینو قـژزەرد و سوروسـپی، جوان و عاقڵ و ڕوخۆش پێش ئەو بەیەك دووساڵ کچێکی لـەو گەورەتریشـی بـەڵام ئـەو بـەپێنج سـاڵی نـەخۆش کـەوتووە ومـردووە، بـۆ گوزیـدە پەژارەکـە لـەوەدابووە کـە نـە بەنەخۆشیی نەپێش مردنی نەیبینیووەو هەرزووش مۆڵەتەکەی تەواو بووەو بەناچاریی ڕۆیشتۆتەوە بۆ سەرکارەکەی.

بروسکەکە لەسەری نوسراوە بەغدا واتە نێردراوە بۆ بەغدا بەڵام وەك بیرم بێ ئەوکاتە لەبەسـرە بـوو یاناسـرییە. ئەمـەیش ناسـۆرێکی تـری رەفیـق حیلمـی و خێزانەکـەیبوو بەهۆی دوورییەکەیەوە لێیانەوەوبەهۆی دورخستنەوەیەوە لەسلێمانی و لـە کوردسـتانو لەمەیدانی سیاسیی.

## چۆن خانوومانکرد تا لەکرێچێتی دەربچین؟

ئەوکاتـەی لـەم خـانوو بۆئـەو خـانوو دەڕۆشـتین بـاوکم لـە ١٩٣٦/٤/١-١٩٣٦/١١/١ بەڕێوەبەری قوتابخانـەی ناوەنـدیی بـوو لـە ناسـڕییە. لـە ٩٣٦/١١/١ - ١٩٣٧/٥/١ کرابـە ماموستای ناوەندیی کەرکوك لە ١٩٣٧/٥/١-١٩٣٩/١١/٢١ دووبارە لە بەسرە بوو. ١٩٣٨ لەبەغدا دەژیا خێزانەکەی ئەم ماوەیە بەتەنیا لەسلێمانی بوون تا ئەوکاتەیەش موچەکەی تـەنها (٢١)دینـار بـوو. ئینجا چی بۆ خـۆی هێشـتۆتەوە و چـی بۆ ئـەوان ناردووە؟ ئـەوە مەگەر هەر خۆی بزانێ.

چۆن خۆی و خێزانەکەی لەکاتی دەوروبەری جـەنگی جیهانیوگرانیـدا ژیـاون ئـەوە بـەکتێبیش ناگێردرێتـەوە. تـەنیا نامـە تایبەتییـەکانی کـە لەوکاتـەدا دەینـارد بۆیـان بـەکورتیو پچرپچـڕیی زانیارییـان لێـوەردەگرین سـەبارەت بـەژیانی تایبـەتیی ڕەفیـق حیلمی خۆیو منداڵەکانی لەوسەردەمەدا. خۆی لـەژوورێك یا لەبەشی ناوخۆدا ژیـاوە، ئەو بەردەستەش کەخۆمان گەورەمانکردبوو لەوێ خزمەتی دەکرد.

لەونامـە تایبەتیانـەی لای مـن مـاون و جارێـك بابـەتێکم لـە گۆڤـاری بەیانـدا لەسـەر بڵاوکردنەوە بەناوی (نامەی تایبەتیی ژیاننامـەی ئـەو کەسە ڕووندەکاتـەوە) هەنـدێکیانم بەوێنـە بڵاوکـردەوە بەئومێـدی ئـەوەی ڕۆژێـك بێـت هـەموویان بەیەکـەوەو بەتوێژینـەوەو لێکۆڵینەوەوە بڵاوبکەمەوە.

لەو نامانـەدا خۆی باسـی دەسـتکورتی و تەقەشـوف دەکـاتو دەڵـێ (تەنانـەت چـایش لەماڵـەوە دەخۆمـەوە) وێنەیـەکی هەیـە لەسـەر مێزەکـەی قـۆریو پیاڵـەی چـا دانـراوە. هەروەها دەڵـێ بۆ ئەوەی ئێمـە پەکمان نەکـەوێت چونکە موچـەکەی بەشـی هـیچ ناکـات ناچار وانە بە خوێندکاران دەڵێتەوە لە دەرەوەی پۆلدا، ئەمە لـە کاتێکدا کـە بەڕێوەبەری گشتی بەڕێوەبەرایێتی پەروەردە بووە لەبەسرە نەك هەر کەماموستابووە.

هاوینان جاروبار بۆ چەند هەفتەیەك دەگەڕایەوە سلێمانیی بۆلامـان لـەم ماوەیـەدا دایکم بێزار بوو لە گواستنەوەمان لـەم مـاڵ بـۆ ئـەوماڵ، چـی خشـڵی خـۆیو پـورمو ئێمـە هەبوو کۆیکردنەوە، تەنانەت خشڵی باوەژنیشی کە ئەگەر دایکیشی بمایـە لـەوەزیاترمان

خۆشنەدەویست تەنانەت کەس نەیدەزانی نەنکمان نییە ئەم لەخێزانی شاڵیەکان بوو زۆر بەڕێز وبێدەنگو هێمنو شاژن بوو...

وانەبوایە چۆن خشڵی خۆی لێ دەکردەوەو دەیدا بەئێمە خانووی پێبکەین؟ هەروەك چۆن دایکم لەگەڵ خەسووی ودشیدا زۆر باش بوو ئەوانیش بەهەمان شێوەبوون لەگەڵیدا؟ درۆیە کە دەڵێن خەسوو ،بووك ، منداڵو باوەژن دەبێ رقیان لەیەك بێت. ئەو خشڵانەی دایکم کۆیکردنەوە بردنی بۆ خزمێکمان ناوی (ئەحمەد ئاغا کەرکوکی زادە) بوو باوکم چەند جار لەیاداشتەکانیدا باسیکردووە کەفریای کەوتووە لەکاتی بێ پارەیدا. دوکانی لە قەیسەریی سلێمانی بۆداناوە و هەر کە بیستوشیەتی لەسلێمانی بەتەمابوون بیگرن، ئەوکاتەی شێخ مەحمودی نەمر لێکەوتووە، لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ بەغدا. باوکم باسی ئەمەی بەدرێژیی کردووە لەیاداشتەکانیدا و ئەم (ئەحمەد ئاغایە) بەخزمایەتیش دەگەڕێتەوە سەر رەفیق حیلمی خۆیی وخێزانەکەشی، هەروەها براکەی حاجی مەلاسەعید نوێنەری سلێمانی بوو لەتورکیا، مێردی پوری دایکمانە و کوڕە گەورەی ئەم لەو پورەی دایکم، کچە گەورەی باپیرمان واتە خوشکی دایکم دەهێنێت و کوڕێکی، پورزایەکی تری دایکم دەهێنێت و هتد واتە زۆر تێکەڵن. ئەم ئەحمەد ئاغایە کە ملیۆنێر دەبێتو زۆر موڵكو ماڵی دەبێت، باوکمی زۆر خۆشدەوێت، بۆیە هەر ئەوەندە دایکم دەچێت بۆلای داوای کڕینی پارچە زەوییەکی لێدەکات تابیکەین بەخانوو، گورج پێی دەفرۆشێت و پارچەیەکیشی بەدەمەوە دەبێت ئەویشی بەدیاریی دەداتێ.

ئینجا خانووەکە چۆن بیناکرا؟!

بیرمە بەو منداڵییە خۆمونەو برایەمودایکم هەر لەبەیانی تائێوارە لەخانووی ساڵحی چایچی بەرمیلە ئاو دانرابوو خشتمان تێهەڵدەکێشاو دەچووینە خانووەکە کاتێ خەریکی دروستکردنی بوون و باوکم لە پشوودا هاتەوە، خۆی نەخشەی کێشا وبەسەریەوەبوو.. دەچووینە ئەوێ قامیشمان پاکدەکرد و بەلەکمان ئامادە دەکرد بۆ سەقف، چونکە بەدار کردمانو بەخشتو نیوەی سیاجەکانیشی بەخشتی قوڕ لەبەربێ پارەیی. بەبەر قرچەی گەرماوە باوکم بەقەرزو قوڵەو ئێمەیش وەك کرێکار ئەو خانووەمان دروستکرد، (نەك بە پارەی پارتی هیواوکۆمەڵە.!) هەرگیز ئێستاش دەنگی

وەستاکەم بیرناچێتەوە کە هەرلەبەیانی تائێوارە بەیەك ئاواز هاواری دەکرد (خشت بێنە یاڵلا خشت! گەچ بێنە یاڵلا گەچ! دەی باوکم بێنە دەی یاڵلا دەی)

هەرئەوەنــــدەی خـــانوو تـــەواوبوو چـــووینەناوی، بــــەلاّم بەداخـــەوە هێشــــتا نەحەسابووینەوە تێیدا باوکم بەفەرمانێ گواسترایەوە بۆ بەغدا. ئینجاوەرە لەداخامەمرە! شینوگریانی دایکم؟ چۆن بەو حاڵە تائەو کولانەیەمان پێکەوە نا، دیسان بەشارانەوە و لەم کرێچێتی بۆ ئەو کرێچێتی برۆینو ئەو خانووە خۆشە بدەینە دەست کرێچی؟!

ئەو ماوەیەی کەلەو خانووەدا ماینەوە زۆر خۆشمان ڕابوارد. باوکم لە ساڵی پێش کۆچــی دوایــدا نوســیبووی (ئەمشــەو دوا قــەرزی خانووەکــەی ســلێمانیم دایــەوە)) ،ئینجابزانن لەساڵی ١٩٣٦تا١٩٣٧ تانزیکە١٩٦٠ ئەوسا ئەو(٥) دینارەی کەلەسەری ماوە داویەتییەوە، ئەوەندەی نەبووە پێش ئەوە بیداتەوە! هەمیشە پێش سەری مانگ دەبوو قەرزی بکردایە هێندە موچەکەی کەم بوو وابزانم کاتێ کۆچی دواییکرد هێشتا موچەکەی نەگەیشتبووە(١٠٠)دینارلە مانگێکدا، کە بەڕێوەبەری گشتیو مولحەقی ڕۆشنبیریو پشکنەری تایبەتیش بوو....؟! ڕەفیق حیلمی لەیەکێك لەنامەکانیدا کاتێ لە(مودیری مەعاریفی بەعقوبە)وە کرابوو بە مامۆستای قوتابخانەی (نەهلی)وئەو کاتە من لە دەرەوە لەئەمەریکا دەمخوێندو وتبووم وازلەخوێندن دەهێنمو دێمەوە کاردەکەم، ئەم وەڵامەی بۆ ناردمەوە:

(زۆر سوپاسی حسیاتتان دەکەم بەلاّم بەهیچ جۆرێك ناوی وەستان لە خوێندنتان نابێ بەرن. من قەیدی ناکا هێندە پەککەوتە نیم خواکەریمە دەبێ خوێندنتان تەواو بکەن. من تاسەر فیداکاریتان بۆ دەکەم) لەنامەیەکی تریشیدا نوسیبووی من ئێوە نەبوونایە شتێکی تردەبووم واتە ئەم حاڵەتەم قبوڵ نەدەکرد.

لەبەغــدا ١٩٣٧/١٠/١-١٩٣٨/١٢/١١ موچــەی (٢٥) دینــار بــووە وەك وتم هــەر خانووەکە تەواو بوو فەرمانی گوێزرانەوەی بۆ بەغداهات و غەم هەموومانی داگرت بەلاّم بەزۆریی دایکم. هەموو جارێ دایکم چەند شەوو چەند ڕۆژێ دڵگیروچاو بەفرمێسك دەبووهەر مشتومڕومقۆمقۆی دەبوو لەگەڵ باوکمدا چونکە ئەگەرچی دەشیزانی باوکم پیاوێکی ئاسایی نیەو ئاگاداری هەڵسوکەوتی سەردەمی شێخ بوو زۆریشی چەشتبوو لەو سەردەمانەدا،کەچی هێشتا بڕوای نەدەکرد کە باوکیشم حەزی بەم گوێزانەوەیە

نییەو ناچارە وەك لە نامەیەكیدا روونیكردبۆوە كە لەبەرئێمەو گوزەران ملكەچی فەرمانەكانی كردووە، ئەگینا (شتێكیتر دەبوو). جاروبار دایم پێی دەیوت خۆت ئارەزوو دەكەیت برۆی و دووربیت لێمان،باوكم ئیتر لەپێستی خۆی دەچووە دەرەوەو زۆری لێدەكردین كەبچین لەگەڵی.

سەیر لەوەدابوو تاچەند رۆژێكیش هەر كە دەیان وت دەچین تاكەركووك بە ئۆتۆمبێل لەوێشەوە دەچینە سەر (خەتی) شەمەندوفێر، هێشتا تازە لەیەكی سەرەتایی دەرچووبووم دەمپرسی یەعنی چی (خەتی) شەمەندوفێر؟ چۆن خەتەو دەچینەسەری؟ چۆن ئەو خەتە دەمانباتە بەغدا؟ نەیاندەوت سواری شەمەندوفێر دەبین وپێچكەی هەیەو بەمەكینە دەڕوات. ئەوكاتە هێشتا شەمەندوفێرمان نەدیبوو. بۆیە تابەیانی خەومان لێنەكەوت. بەوخەیاڵەوە شەوی پێش ڕۆیشتنمان لە سلێمانی هەموو كەس وكار كە زۆریان خزمی دایكم بوون هاتن و لە هەیوانی ماڵەكەی خۆمان جێمان لێداخست وتا بەیانی گفتوگۆ و ڕازونیازمان گۆڕیەوە ئینجا كە رۆژبووەوە كەوتینە ڕێ و خانووە بەنازەكەمان بێناز بەجێهێشت، دواتر كرا بەمەكتبەی(مەلیكە عالیە).

لەكەركوك لەماڵی یونس ئامانی مامە تۆفیقی باوكم دابەزین لەوێ نان وچا وماستا ومیوەمان خواردو خزمەتێكی زۆركراین خزمانی باوكم ئامۆزاو ئامۆزازاو پورزاو خوشكەزاكەی ، كۆبوونەوەو ڕێزێكی ئێجگار زۆریان لە باوكم نا. هەروەهاله ئێمەش،

شەوێ چوینە سەر خەت و بۆ یەكەمجارخەتی شەمەندوفێرم بینی، بەمێڵە ئاسنینەكانی ئاشنابووم، بە فارگۆنی چەند دەرەجەیی رۆیشتین بیرم نیە، بەلآم دەزانم تا بەیانیی نەنوستین، چك چك و لارو لەنجەو زریكەی پێچكە و ئەم لا بۆ ئەولاكەیم بیرناچێتەوە، عەزیزیی جەلسەی سپی گوڵ سوورم لەبەردابوو، زۆر جوان بوو، هەنارم خوارد پەڵەی بەركەوت. هەر بەیانیی زوو گەیشتینە بەغدا باوكم نەیهێشت جل بگۆڕین بردینی بۆ قوتابخانە، بەڕێوەبەرەكە وتی بۆ عەزیزییەكەت پەڵاوییە وتم ئەم شەولەشەمەندۆفێردا بووم تابەیانی باوكم چاوەڕێی نەكرد بیگۆڕم، تادوانەكەوم.

# ١٩٣٨لەبەغدا

وەك لەباوكمان دەبیست، كە دەهاتەوە بۆماڵێ لەدەرگاوە بانگی دەكرد جەمیلە(ئەمە ناوی دایكمانە) ئەمڕۆ ئەڵمانیا فلان شاری داگیركرد، گەیشتە سەر هێڵی فلان، فلانی بۆردومان كردو هتد، هەرباس باسی جەنگی جیهانیی بوو لەماڵی ئێمە .لەساڵی ١٩٣٨ ئەو كاتەی لەبەغدابووین گەڵێ رووداو روویانداوە كە ئەمانەن:

## یەكەم رووداو

لەم ساڵەدا یەكەم ڕووداوی خۆش ڕوویدا كە ئەویش لەدایكبوونی دووەم كوڕی رەفیق حیلمی‌یە(بێجگە لەوەیان كە بەمنداڵیی كۆچی دوایی كرد) لە ١٩٣٠-١٩٣٨ هەریەك برامان هەبوو هەموومان چاوەڕوانی برایەكی تربووین، دایكم و باوكم لە ئێمە زیاتر، باوكم ئەم كوڕەیانی ناو نا (فەوزی) ئینجا (فەوزی) لە چیدا؟ وەك دوایی زانیم لەم ساڵانەدابووە، كە پارتی هیوا دامەزراوە و باوكم كراوە بە سەرۆكی، ئایا مەبەستی ئەو فەوزە بووە؟ یان (فەوزی) كاملا لەجەنگدا ئەوەیان نازانم؟

## دومین رووداو:

كەوتنە خوارەوەی (پیرۆت) لەسەربان ومردنی، ئەمە كوڕێكی ١٠-١٢ ساڵ بوو هەتیوێك بوو رامانگرتبو. چووبوو لەسەربانەوە بۆ ماڵی دراوسێیەكمان لە گەڕانەوەدا پێی ترازابوو كەوتبووە كۆڵان مێشكی تەقیبوو. باوكم لە رۆژژمێرێكیدا نووسیویەتی ئەوشەوە خەوی بینووە براگەورەكەمان كەوتۆتە خوارەوەو مردووە. بەهەڵەداوان هاتۆتەوەو لە كۆڵان پێیان وتووە (پیرۆت) مردووە.

## سێهەم رووداو:

كوشتنی مەلیك غازی یەكەم، رووداوێكی ئەو ساڵەبوو لەناكاوهاوار كەوتە بەغداوەو دەیان وت(جیت أسالك نوری‌وین الملك وینە؟) یان دەیان وت (اللە اكبر یاعەرەب غازی انفوگدمن دارە)هەرچی لەبەغدا بوو گەورەو بچوك كەوتە سەر شەقامەكان‌وهەر لەبەیانی

تـائێواره بەشـیوەنەوه دروشمـەکانیان دەوتـەوەو ئێمـەی قوتابیـانیش بـەجلی ڕەشـەوه دەسـتە دەسـتە لەگـەڵ مامۆسـتایان هەرچـی شـەقامی بەغـدا هـەبوو گـەڕاین و لەخۆماندا،تاسێ ڕۆژ بەمجۆره پرسەی بۆ دانرا.

ئەوکاتە جلی خاکیی لەبەرکرا لەلایەن فەرمانبەر و قوتابیانەوه،گوایە لەجەنگداین، باوکیشم و ئێمەیش جلی خاکیمان لەبەر دەکرد. لەپۆلی دووی سەرەتایی بووم تازه فێری عەرەبیی دەبووم. لەڕەوزه لە موسڵ ژماردنی کاتی تۆپ تۆپێن فێربووبووم. وادیاربوو لە گاورەکانەوه، چونکە هەرچەندە دەمـوت (وێ ، پـنێن، پـاپی ، ئـۆبعی) دەیانوت تۆ گاورانە دەیڵێیت. زۆر بیرەوەریی ئەوکاتـەی خۆم هەیە کە قوتـابی بـووم گێڕانەوەی ئەو بیرەوەرییانە ماوەی زۆریان دەوێ، بەڵام من بەکورتی و بەپەلە باسمکردن.

## چوارەمین ڕووداو :

مردنـی مێـردی پـورم واتـە مێـردی خوشـکی بـاوکم (لـەدایکی خـۆی نـا). ئەمـە زۆر کاریکردە سەر باوکم چونکە چوارمنداڵی هەتیو وخوشکەکەشی بەبێ سەرپەرشتیار مانەوه ؟ لەم کاتەدا لەخانوویەك لەنزیك (تپه الكرد) دەژیاین پاش گەڕانەوه لە قوتابخانە من زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ براگەورەکەم دەبردەسەر . نازانم چۆن ئەو ساڵە تێپەڕی، باشـیش بـوو دەرچـووم چـەند هـاوڕێی قوتابخانـەم هـەبوون یـەك دووانێکیـان نزیـك ماڵەکەمان بوون بەڵام زۆربەی ئەوانەی لە کۆڵانەکەمان لەگەڵ براکەم و من یارییان دەکرد کوڕبوون.

بێگومان نەمدەزانی باوکم بەچییەوه سەرقاڵە هەمیشە لەدەرەوه بوو زۆر سەفەریشی دەکرد، هەر دەمبیست چووه بۆ تەفتیش، بەڵام دوایی کە کە دەستمدایە خوێندنەوەی چالاکییەکانی و زانیم سەرۆکایەتی پـارتی هیـوای کـردووەو باسـەکانی د. موکـەرەم تاڵەبانی بەتایبەتی وەڵامی ئەوانەی لەوپارتە بوون ئینجا زانیم باوکم لەچ جموجۆڵێکی سیاسیی گەورەدا بووەو چ پێگەو دەسەلاتێکی هەبووه لەناو کوردو عەرەبدا؟ هەروەها تێگەیشتم لـەوەی چـەند مـەزن و شـکۆداربووەو چالاکی و چاکی و ئـازایی و هـەوڵ و تەقەلاکانی چەند دڵسۆزانەو خۆنەویستانە بۆ نەتەوەونیشتمانەکەمان بووه.

بۆ وردەکاریی باسی ئەم چالاکی و خەباتانەی رەفیق حیلمی ئەمر تکایە یاداشتە (٧) بەشەکەی بخوێننەوە،کە ئەم یاداشتانە دووجار بە رەسمیی لەچاپدراونەتەوەو چەندجار بەدزییەوە ئیستینساخ و فۆتۆ کۆپی کراونەتەوەو فرۆشراوەنەتەوە لەلایەن نەناسراوانەوەو لە کتێبخانەکانی سلێمانی و هەولێردا بەبێ پرسیارکردن بە وەرەسەکەی ورەنگەلای زۆر لەخوێندەواران ورووناکبیران هەبن.

هەروەها کتێب و نووسراوەکانی تری کە گەشتی ئەولەگەڵ قەڵەمدا روونددەکەنەوە بەپێی توانا لێرەدا چی باسی ژیانی تایبەتی خۆی و خێزانەکەی هەیە کەبریتین لەو باسانەی لەدایکمان و پورمان و هەندێك لەکەس وکارمان بیستووە یاخود هەر بەبیرەوەریی خۆم لەیادم ماون دەیاننووسمەوە تاکو بەزنجیرە بەپێی ساڵ و تەمەن و فەرمانی میریی وێنەیەکی ژیانی تایبەتی بخەمە بەردیدەی خوێنەرانی خۆشەویست، سەبارەت بە خەباتی سیاسیی باوکم وەك وتمان یاداشتە کانی خۆی باشترین سەرچاوەن هەروەها نووسینەکانی و شیعرەکانی لە رۆژنامە سەرەتاییەکانی سەردەمی شێخی نەمرو لە رۆژنامەی حوادث و نجمة کرکوك وتجددی کرکوك. لەزۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی وعەرەبییەکانی سەردەمی حوکمی عیراقدا ئەوانەی خۆی نووسیونی یان لەپاش کۆچی دوایی نووسراون ئەوانە وێنەی چالاکی و ئازایی و نەبەزی ئەو پیشان دەدەن. بەپێی تواناش لێرەداهەندێ لەو نووسینانەمان هەر وەك خۆی بڵاوکردۆتە یان بەدەستکاریی و کورتکردنەوەوە بەشێوەی بەڵگەنامە خستومانەتەروو بەتایبەتی ئەوەی سەبارەت بە گەورەیی رەفیق حیلمی وتراوە پێش نووسینەوەی ئەم کتێبەش بۆخۆم زۆرم بابەت لەم بوارەدا بڵاوکردۆتەوە لەگەلێك لایەنەوە قسەم لەسەرکردووە هەندێکیان وەك خۆی لێرەدا بڵاودەکەمەوە ئەوانیتر تێهەڵکێش و لەکۆتایدا بیبلۆگرافیایەکی وردی لێ دروستدەکەم وەك لەمەوپێش کردومە بۆگشت ئەو باس و نوسینانەو بەوێنەوە دەیانخەمە روو.

با لەوە زیاتر لەباسەکەمان دوورنەکەوینەوە، رەفیق حیلمی پاش ئەو ماوەیە لەبەغدا کەموفەتیشی مەعاریف دەبێت لە نێوان ١٩٢٧/١٠/١-١٩٣٩/١١/٢١ و بەپێی فەرمانی میریی هەتا ١٩٤٠/١٢/١١ موچەکەی تا ئەو کاتە(٢٥)دیناربووە. پاش ئەمە نووسراوە کە ١٩٤٠/١٢/١١-مانگی١٠ ی ساڵی١٩٤١ بووە بەموفەتیشی مەعاریفی موسڵ.

بەلام ئەوەی خۆم لەبیرمە ئەوەیە سالّی ١٩٣٩،١٩٣٨ لەبەغداوە گوێزرایەوە بۆ بەعقوبە، چونکە پاش کوشتنی مەلیك غازیی چوین بۆ بەعقوبەو لەوێش هێشتا هەر شیوەن بوو بۆمەلیك غازیی، لەوێ بووین کە هەواڵیان هێنا مامە ئیبراهیم کۆچی دوایی کردووە لەوکاتەدا رەفیق حیلمی لەتەفتیش بوو لەدەرەوە، کەهاتەوە بۆ دایکمانی گێرایەوە چی بەسەرهاتووە چۆن لەرێگەی چۆلّی قولّفە کە ویستویەتی بچێ بۆ دواماڵئاوایی لەو برایەی، پێ رانەگەیشتووە، لەبەرئەوەی لەوچۆلّە کە ئەو کاتە رێگەوبانی دیارنەبووە و لەوسالّەدا بەتایبەتی گەلێك ئۆتۆمبێل و خێزان ونبوون‌و لەناوچوون ئەمیش (٣)شەوو سێ رۆژ لەو چۆلّەدا بێ نان‌و ئاو، بێ بەنزین ماوەتەوەوبەپێ رۆیشتووە بۆ پەیدا کردنی بەنزین لەناو خێلّە دەشتەکییەکاندا. ئەوسالّانەی لەبەعقوبە بووین زۆر لەلایەن تەندروستیمانەوە کێشەمان هەبوو ئەم شارە زۆر بەناوبانگ بوو بەمێشولە و نەخۆشیی مەلاریا، لەبیرمە کە لەسەریان دەنوستین دەبووایە هەموو قەرەوێڵەکانمان بەپەردەو کوللە داپۆشییایە، بەیانیی کە هەلّدەستاین سەر کوللەکە رەش دەچووەوە. زۆرمان مەلاریامان گرت و تابڵیی نارەحەت بووین.

یەکەمجار خانووەکەمان لەناو باخچەیەکی ئێجگار خۆشدابوو لەقەراغ شار بەتەنیشت باخچەو خانووی خاوەن خانووەکەمانەوە جۆگە ئاو بەچوار دەوری مالّەکەدا دەرۆیشت، شەو تابەیانی دەنگی بۆقی ناوجۆگەکان دەهات، منداڵانیش مەلەیان دەکرد بۆیە گەلێك نەخۆشیی تریش هەبوون لەوێ. باخەکەمان پڕ بوو لەمیوەی هەمەجۆر وەك ترێ، هەنار، پرتەقاڵ، لیمۆ، مسك، خورما ،جگە لەوە ئەوکاتە لە سەرەتایی بووم تازە لە قوتابخانە فێری سەوزە چاندنیان دەکردین، بۆیە خۆشم باخچەیەکی بچوکی سەوزەم هەبوو چێشتە قولێم تیادا دەکرد. تەماتە، پاقلە، فاسۆلیا، لۆبیا، پیازم تیا دەرواند.

کۆمەلێك مریشك‌و کەلّەشێرو جوجەلّەشم هەبوو. ناوی خزمەکانم لێنابوون کە زۆر لامان دەمانەوە کەلّەشێرێکم قاچی شکا، بەپێی خوێندنی وانەی تەندروستی بۆمگرتەوە چاکبووەوە بەلام دەشەلی هاربوو بوو لێمان بازیدەدایە سەرشانمان‌و بێزاری دەکردین، رۆژێك هاتمەوە وتیان مریشکمان لێناوە بینیم کەلّەشێرەکەم دیارنەماوە قاچەکانی گۆشتە لێنراوەکەم پشکنیی دەرکەوت کە قاچێکی بەگرێ بوو زانیم قاچەشکاوەکەی کەلّەشێرەکەم بوو، کردم بە هەراونەمهێشت کەسیان لێی بخۆن.

کەلە بەعقوبە بووین فەڕاشێك هەموو بەیانیانێك دەهات بە شوێنماندا دەیبردین بۆ قوتابخانەکانمان بۆ ناوشارو بەسەر پردی رووباری خریسانی بچوك و باریکدا دەپەڕینەوە. پاش ماوەیەك گواستمانەوە بۆ خانوویەك لەناوشارا ئەو باخچەی نەبوو خانوویەکی دوو نهۆمیی بوو. هێندە لامان خۆش نەبوو تەنها ئەوەم بیردەکەوێتەوە لەوێ ژوورەکان پڕدەبوون لە چۆلەکە،ژمارەیان لەوەدا نەبوو، برا گەورەکەم هێشتا منداڵ بوو دەرگا و پەنجەرەکانی لەسەر دادەخستن و ڕاویدەکردن بەزیندووی بەتۆڕی وەك تۆڕی پەپوولە ڕاویدەکردن.

هەرلەبیرەوەرییەکانی بەعقوبە ئەوەی دێتەوە یادم ناسیاویمان بوولەگەڵ خێزانی خشالییەکان، یەکێك لەمامۆستاکانم ناوی ست نەعیمە الخشالی بوو، خوشکی خلیل الخشالی کەیەك دووبرای تریشی هەبوو، ئەمانە زۆر باوکمیان خۆشدەویست هەمیشە بانگیاندەکرد بۆ میوەو مەسگوف خواردن لە باخەکانیاندا سەبەتە میوەی نایابی ترێ و هەناری شارەبان و خورمایان بۆ دەناردین لەدەوڵەمەندەکانی بەعقوبە بوون. دیارە لەم ماوەیەدا باوکم زۆر سەری قاڵ بوو بەدامەزراندن و ڕێکخستن و گەشەپێدانی پارتی هیواوە، بۆیە هەمیشە دوور بوولێمان، ئێمە واماندەزانی دەچێت بۆ تەفتیش، بەڵام وەك لەدوایدا دەرکەوت باوکم زۆربەی سەفەرەکانیشی بۆ کۆبوونەوەو کۆنگرەو بەڕێوەبردنی ئیشوکاری پارتی هیوا بووە. کەلق و پۆپی هاویشتووە بۆ سەرجەم شارو شارۆچکەکان وبووەتە گەورەترین پارت لەکوردستاندا ئەویش وەك خوێندومەتەوە، بەڵام بێ کێشەو گێچەڵیش نەبووە، بەهۆی سیخوڕو ناپاك و فێرکراون کە خۆیان تێهەڵکێش کردووەو بەدرۆو دەلەسەو پیلان ڕێکخستن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوونەتە دامەزرێنەری پارتی تر، بۆئەوەی بتوانن پارتی هیوا بڕوخێنن،ئەویش بەلابردنی رەفیق حیلمی لە سەرۆکایەتی ئەو پارتە. سەبارەت بەپارتی هیواو کێشەکانی بڕوانە بەشی تایبەتی ئەم کتێبە لەسەر ئەو پارتە کەچی لەسەر نوسراوە بەڕاست و بەدرۆ وەك خۆی نەقڵم کردون و هەندێکیان بەدەستکارییەوەو بە (تەعلیقات) و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەوە تیشکیان دەخەمەسەر. بۆ ئەم باسانە هەریەکە لە ناونیشانی باسەکە و لەکام گۆڤار یان ڕۆژنامە وەرمگرتوون ئاماژەیان پێدەدەم ئەو ژمارەو مێژووانەیش کە لێرەدا ماوەی

دووپاتکردنەوەیان نییە لەکۆتایی کتێبەکەدا دایاندەنێم یاداشتەکانی بۆ گەلێك باس و سەرچاوەی تریش بڕواننە یاداشتەکانی رەفیق حیلمی خۆی.

# حەربی ڕەشید عالی گەیلانی ١٩٤٠

پاش ئەوەی دووساڵ لە بەعقوبە بووین دووبارە گەڕاینەوە بۆ بەغدا، لەساڵانی ١٩٤٠-١٩٤١ئەمجارە لە الاعظمیەماڵمان نزیك بە گۆڕی مەلیك بوو.

لەبەغدا خوشکێکمان بوو باوکم ویستی ناوی بنێت (حەربییە) چونکە سەردەمی( (حەربی ڕەشید عالی) بوو نەمانهێشت. دیسان باوکمان هەر سەرقاڵی سەفەروهاتوچۆی شاران بوو، بەتایبەتی کاتی بۆردومانی بەغدا. خانووەکەمان دوونهۆم بوو، لەترسی بۆردومان نەماندەوێرا بچینە حەوشەکە زرپورێکی دایکم خۆی وکچێکی هاتبوونەلامان بۆماوەیەکی درێژ، ئەم زرپورەم لەترسی بۆردومان چووبووە حەمامەکەو کچەکەی نابوو بەدیوارەکەوە وخۆی لەبەردەمیا وەستابوو، گوایە بەمە کچەکەی دەپارێزێت لەو بۆمبەی کە دەیانوت فڕۆکەکان فڕێی دەدەن جاروبار وامان دەزانی سەربانی سەرەوەمان ئەگەر بوێرین بچین، ڕەنگە پڕبێت لەمەترەلوێز.

مەترەلوێز چی‌بوو؟ نەماندەزانی ! دایکم گوێی لێبوو لەپەنجەرەی سەر کۆڵانەوە دەیانوت (ذب المناشیر) ئەم بەترسەوە دەیوت ئای! دەڵێ (ذب المناشیر) وایدەزانی مەناشیریش جۆرێك لەبۆمبایە. ئیتر ئەو خەڵکە زراویان چووبوو عەسکەروپۆلیس‌وقوتابیان وەك پارێزەر بەسەر جادەکانەوە بەتاریکی ڕادیۆیش بەکزی‌و بەدزیەوە دەنگوباسی بڵاودەکردەوە... دایکم ئێجگار دەترسا دیسان لەوکاتەدا باوکم لەوێ نەبوو هەر نەهاتەوە، نەماندەزانی چی لێبەسەر هاتووە. کاك فایەق هۆشیاری پورزازای دایکم یەکێك بوو لە قوتابیانی حقوق کەکرابوون بە بەرگریی میللی لەگەڕەکەکەماندا. جاروبار سەری لێئەداین، دایکم تکای لێکرد چارمان بکات دەربازمان بکات. بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ ماڵی ناسیاوێکمان چوین بۆ بەعقوبە بۆ ماڵی هاوڕێیەکی باوکم پێیان دەوت (حەمیدە فەندی مودیری تەل) مودیری بەرید بوو لەسلێمانی‌و لەوێش ئەوان هەموومانیان بردە ناو باخ‌وباخاتێکی گەورەوە، وەکو پەناهەندە وابووین، چەند ڕۆژ لەوێ ماینەوە. دیاربوو لەو ماوەیەدا باوکم گەڕابۆوە بۆ بەغدا و بینیبووی کەسی لێنەماوە، باش بوو کاك فایەق یان دەرودراوسێ پێیان وتبوو ئێمە لەبەعقوبەین.

باوکم هات بۆ ئەوێ و بەزۆر بردینییەوە بۆ بەغدا. ئینجا شەو بەشەمەندۆفێری سەربەقوڕو گژوگیاو بەتاریکی بەفارگۆنی دەرجە دووو بردینییەوە بۆ سلێمانی (٣) مانگەی هاوین لەسلێمانی بووین لەماڵی مستەفا ئەفەندی مێردی ڕەحمەخانی کچی پیرەمێردی شاعیر کە (ژنی پیرەمێرد پوری دایکم بوو) ودایکی کاك فایەق هۆشیاریشە، باسی ئەو گەشتەمان لەم ماڵە چیرۆکێکی دوورو درێژە ماوەبێت بەجیا وەك چیرۆك دەیگێڕمەوە، لێرەهەر ئەوەندە دەڵێم ئەوسێ مانگی هاینە (*) لەماڵی دایکی کاك فایەق هۆشیاربووین گەلێك بیرەوەری خۆشی لەو مانەوەیەماندابوو. زۆر خۆشما ڕابوارد پێکەوە. بەتایبەتی گشت ئێوارانێ (خاڵە پیرەمێرد) دەهات بۆلامان و کابرایەکی بەسینییەك کەبابی بەناوبانگی (وەستا تۆفیق)ەوە لەپێشەوە بوو، لەو باخچە گەورەو خۆشەیاندا لەژێرسێبەری دارگوێزا سفرە ڕادەخرا لەلایەکەوە گۆشتو سیوجگەر دەبرژێنراو لەلایەك ماستاو زەڵاتە دەکران ئیتر بەڕێزو خاڵە لەناوماندا دادەنیشتین، نانی ئێوارەمان بەگاڵتەوپێکەنینەوە دەخوارد. ئەوکاتە باوکیشم مۆڵەتی وەرگرتبوو لەگەڵماندابوو. ئێمەش قوتابخانەکانمان پێش تاقیکردنەوەی کۆتایی داخران لەبەغدا، لەبەر بۆردومانو فەرهود کردنیان لەلایەن جولەکەکانەوە. بۆیە دەبوو ئیتر بکەوینە خوێندنو خۆئامادەکردن بۆتاقیکردنەوە پاش پشودانی هاوین. ماوەیەك باوکم وانەی بیرکاریی پێوتمەوە زۆر باش بوو، بەڵام حەدم چیبوو هەڵەیەك بکەم، لەوانەبوو سەرم هەڵبکەنێت. نزیك کۆتایی پشووی هاوین باوکم توانی خانووەکەمان کەکرابوو بەقوتابخانەی (مەلیکە عالیە) بۆئامادەبکاتو بچینەوە ناوی ، کەتاقیکردنەوەمان دەستی پێکرد، لەسلێمانی بەشداریم کردو دەرچووم، ئیتر ئێمە لەسلێمانی ماینەوە.بەڵام باوکم بۆکوێ گواسترابۆوە ئەوەیان نازانم بەفەرمانە میرییەکانو دەفتەری خزمەتی بێت گوایە لە ١٩٤٠/٢/١١-١٩٤١/١٠/١ دا کراوە بەموفەتیشی مەعاریفی موسڵ.

---

(*) لە ڕۆژژمێرەکانی ساڵی ١٩٤٠ یدا نوسیویەتی (١٩٤٠/٧/٢٢ ذهاب العائله من کرکوك الی السلیمانیه) دیارە ئەمە ئەو ڕۆژە بووە کە لەبەغداوە بردینی بۆ کەرکوك ئینجا سلێمانی کاتی حەربی ڕەشیدعالی گەیلانی کە تا کۆتایی هاوین لەماڵی کاك فایەق هۆشیار ماینەوە.

دەفتەری سێهەم

لەیەکێ لەدەفتەرەکانیدا باوکم نوسیویەتی اجمالیة شباط ١٩٤١ هەروەها ئەمانەی نوسیووە:

١-توشی نەخۆشی پێست بووم(خوروو)، ماوەی ٢٠رۆژ لەجێگەدا مامەوەو دەرزیی (کالیسیۆم٦)م لێدراو گولاجی زەریان دامێ خێزانەکەشم توشی مەلاریابوو.

٢-دەستمکرد بەدانانی کتێبی (شاعیرە کوردەکانی عیراق) و یەکەم (کوڕاسیم) تەواوکرد، دیارە مەبەستی بەشی یەکەمی (شیعروئەدبیاتی کوردی)یە.

٣-(افلست افلاساً شدیداً) ئەمەی لەقوژبنی سەرەوەی لاپەڕەکەدا نوسیووە.

دواتر لیستەی حساباتی مانگی ئازاری نوسیووەو لەوێدا دەردەکەوێت سلفەی وەرگرتووە و ئابوونەی پارتی هیوای نەخواردووە!

## بوویە موفەتیشی مەعاریفی کەرکوك وسلێمانی

ساڵی ١٩٤٢ئێمە لەسلێمانی بووین باوکیشم لامان بوو،لەم ساڵەدا دوایەمین منداڵی رەفیق حیلمی واتە کوڕە بچوکەکەی لەدایك بوو، ئەم رووداوە خوشییەکی گەورەی خستە ناو خێزانەکەوە، ئەم کوڕە بوویە سێهەمین کوڕیان بێجگە لەوبچوکەیان کە مردو ئیتر وتیان بەسە، بەم منداڵە رەفیق حیلمیو خێزانەکەی ژمارەی منداڵەکانیان بوویە (١٠) منداڵ (٤)کوڕو(٦) کچ، سیانیان بەمنداڵی مردوون، دووکچ هەریەکەیان تەمەنی (٥) ساڵان بووە وکوڕێك کە تەمەنی ساڵ‌ونیوێك بووە پاشان لە هەشتاکاندا کوڕە گەورەکەشی بەرووداوی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کردووە خۆشبەختانە ئەوکاتە نەدایکمانو نەباوکمان نەمابوونو ئەو ناسۆرە جەرگبڕەیان نەبینی.

لەسەرەتای یان نیوەی یەکەمی چلەکاندا وەك دوایی بۆمدەرکەوت خەباتی رەفیق حیلمیو رۆڵی لەپارتی هیوادا گەیشتبووە لوتکە، هەرچەندە د.موکەڕەم تاڵەبانی ویستوویەتی بڵێت هەر لەزووەوە ناکۆکی کەوتۆتە نێوان رەفیق حیلمی(سەرۆکی باڵای هیوا)و هێندێك لەئەندامانییەوە، کەویستویانە ئەولەسەرۆکایەتی لابەرن بەڵام(نە

بەریتانیاو نە عێراقو نەپارتیهیوا نەیانتوانیوە لایبەرن) (*) لەبەرئەوە بەپیلان لابراوەو ئەوەش لەدەوروبەری ١٩٤٤ دا گوایە بەهۆی ئەوەی ئەم پارتە ئیتر هێزی نەماوە بۆ درێژەدان بەچۆنێتی بەرێوەبردنی هیواکانی سەرۆکایەتی رەفیق حیلمی و چۆنێتی شێواندنی پارتیهیواو مەبەستی ئەو شێواندنەو کێ هەوڵی بۆ ئەوەداوە و چۆنێتی وازهێنانی باوکم لەو سەرۆکایەتییە، وەك وتمان بەشێکی تایبەتیمان داناوە بۆ باسی ئەم پارتە بەگشتی، بەهەموو ئەو بەڵگانەوەی دەستمانکەوتون. بۆ ئەوانەی دەیانەوێ زۆرتر بزانن سەبارەت بەم پارتە مەزنەی کوردو بزانن کێ بەڕاستی بووبەهۆی سڕینەوەی هیوای کورد؟ ئەوە خۆم بەبیرمدا دێتو دیارییشە لەم ماوەیەدا بەهۆی ئەم کێشەیەوە بوو رەفیق حیلمی وەك ئاگر کڵپەی دەسەند، لەو قۆناغەدا ئێجگار بێ ئارام بوو، هاتنو رۆشتنو هەڵسوکەوتو تورە بوونو هەڵچوونی ئامارەبوون بۆ ئاستی نیگەرانییەکەی. بیرمە ئێواران درەنگ دەهاتەوە، من و پورم چاوەڕێمان دەکرد، تائەوکاتە من ئەرکی قوتابخانەم ئامادە دەکردو پورم بەدیارمەوە دادەنیشت. کەباوکم دەهاتەوە هەمیشە ئێواران کاسەیە زەلاتەم بۆ دەکرد پوریشم خواردنی تری بۆ دادەنابەلام دایکم زوو دەنوست.

رۆژێك بۆ یەکەمجاربینیم باوکم ئێوارە بەشەڕواڵومراخانی کوردییەوە چووە دەرەوە، پێش ئەوە وتیان ماجید مستەفای هاوڕێی کۆنی هاتووە بۆلای، ئەوکاتە ماجید مستەفا وەزیر بوو لە حکومەتی عیراقدا (*) پاش ئەم هاتنە، باوکم بەو جلوبەرگەوە ڕۆیشت وەك لەدواییدا زانیم، ئەمە ئەوکاتە بووە کە ماجید بەباوکمی وتووە مەلا مستەفای بارزانی ئەگەر لەعیراق بچێتەدەرێ باشترە بۆی ئەگینا تووشی کێشەی گران دەبێت، وابزانم باوکم بۆ گەیاندنی ئەو هەواڵە بەمەلا مستەفا دەرچوو بووە دەرەوە، هەروەها لەوکاتەدا باس باسی لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکە بوو.

---

(*) ئەم رستەیە لەبابەتەکەی د.موکەڕەم وەرگیراوە لەسەر زاری خۆیەوە. ئەی باشە کەواتە چۆن وتویەتی رەفیق حیلمی هێزی نەماوە بۆ سەرۆکایەتی پارتەکە؟

(*) بۆ هاوڕێیەتی رەفیق حیلمی و خەباتی نەتەوایەتی لەگەڵ ماجید مستەفا بڕوانە (یاداشت) باسی خۆیو ماجید مستەفا و مەحمود جەودەتو کۆبوونەوەیان لەماڵی تۆفیق وەهبی. ئینجابەشداری و هاوکارییان لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا وەك سەربەخۆیی کورد.

ئەوەشم بیرە شەوێك باوكم بەپەلە ڕۆیشت، بەر لەڕۆشتنی من ودایكمی بانگكردو وتی: هەركەسێك هات لەدەرگای داو وتی (سەرۆك) ئەم دۆلابە بكەرەوە، لەپشتی ئەم وێنەیەدا چەند لیستی ناوێك هەیە بیدەرێ. كە لەدەرگادرا قاچم وەك بینی ئاو دەلەرزی بەلام خۆمراگرت، هەرچەند هێشتا تەمەنیشم ئەوەندە نەبوو كەچی دەبووایە ئەركی سیاسی و مەترسییەكانی بگرمە ئەستۆم.باوكم چی وت وامكرد، ئەمەیش دیاربوو پەیوەندیی بە پارتی هیواوە هەبوو، من ئەوكاتە هەر نەشمدەزانی هیوا چییەو باوكم سەرۆكی چییە؟هەرئەوەندەم دەزانی تاقە ڕادیۆكەمان كە شەوانی پێنج شەممە لە ڕێگەی ئەوەوە گوێم لە دەنگی (ئوم كەلسوم) دەگرت لەگەڵ (بجی) بەدەم ئامادەكردنی وانەكانمەوە ئەویش لە ئاكاودا نەما،پرسیم چی لێهات؟ دایكم وتی باوكت فرۆشتی تاپێی بگاتە لای مەلا مستەفا.[*]

بۆ شێوەی گوزەرانی خۆیو خێزانەكەی لەماوەی جەنگ و پاش تەواوبوونی جەنگ، بڕوانە نامە تایبەتییەكانی ڕەفیق حیلمی بۆ خێزانەكەیومنداڵەكانی،شایەنی باسە لەم ساڵانەدا مووچەكەی هێشتا (٢٥)دیناربووە. كاتی خۆی ئەم موچەیەی كردووە بەسێ بەشەوە، یەكێكی ناردووە بۆ خێزانەكەیو منداڵەكانی، یەكێكی بۆ ئەوكچەی كە لە بەغدا خوێندویەتی. نامەی تایبەتیی وێنەی ژیانی ئەوكەسەو ئەوانەشە كە نامەكەیان بۆ دەنێرێت، بڕوانە باسی نامە تایبەتییەكانی ڕەفیق حیلمی لەم كتێبەدا بۆ زانینی جۆری ژیانی كە لە گۆڤاری (بەیان)دا بڵاومكردونەتەوە.

١٩٤٢/٩/١-١٩٤٣/٧/١ بەپێی دەفتەری خزمەت، ڕەفیق حیلمی كراوە بە موفەتیشی كەركووكو هەولێر.

١٩٤٣/٧/١-١٩٤٥ كراوتەوە بەموفەتیشی كەركووكو سلێمانیو لەم ماوەیەدا گرانیو نەخۆشیو مردنی زۆر لەسلێمانی بڵاوبۆتەوەو هەندێك پورزاوكەسی ڕەفیق حیلمیشی بەركەوتووە.

---

[*] ڕەفیق حیلمی سەرۆكی باڵای هیوا (لەو كاتەدا) ئەمە وەزعە ئابورییەكەی بووە بەلام هەرگیز دەستدرێژیی نەكردۆتە سەر ئابوونەی پارتی هیواو ئەندامانی وەك خوالێخۆشبو فایەق هۆشیاریش وتویەتی ئەوكاتە یونس ڕئووف لێپرسراوی ئابوونەو پارەی هیوابووە نەك ڕەفیق حیلمی.

بۆ بارودۆخی سلێمانی بڕوانە چی نوسراوە لەسەر هەموو جیهان پاش جەنگی یەکەمودووەمی جیهان کە نەك هەر لەسلێمانی بگرە لە سەراپای جیهاندا گرانیو نەخۆشیی بڵاوبوونەوە. گرانییەکە هەرلەوەدا نەبوو! باوکم هەر لەزووەوە لەسەر ئەوەی کەبەسەر وڵاتەکەو بەتایبەتی سلێمانیدا هاتبوو چی بەدەستەوە بوو دایبە چەند گوێنییەك ئاردوشەکروگەنم و تەنەکە ڕۆنو دۆشاو. ئەمە لەدواییدا گەلێك ماڵی هەژاری ڕزگار کرد لەبرسێتی، چونکە هەر بەچەند ڕۆژجارێك دەیوت ئادەی تورەکەیەك ئارد و کاسەیەك شەکر یادۆشاویان ڕۆن بەرن بۆ فلان ماڵ.

نەخۆشیی گرانەتا، تیفۆئیدو تیفۆسو ڕشانەوە بڵاوبووبوونەوە، هەر ڕۆژە ناڕۆژێك دەتبیست فلانیش مرد یان وائەمرێ. جەنگی پێشو گەلێك کەسوکاری نزیکی دایکمی بەڕشانەوە کوشتبوو، ئەم جەنگەش هەندێك پورزای باوکمی برد. مەترسیی مردن بەنەخۆشیی یان لەبرساندا خەڵکی حەپەساندبوو. چەند دوکاندار گیران بەهۆی گەچ کردنە ناو شەکر یان برنجو خوێوە و لەمجۆرە کارە ناقۆڵایانە بەتەماعی پارەو ماڵی دنیا. گەلێك لە ڕووناکبیران قۆڵیان لێهەڵماڵیی وەك مامۆستایان کەوتنە کڕینی کوتاڵی هەرزان و دروونی لەماڵەوە بۆ هەژاران یان ئەو کوتاڵانەیان دەفرۆشتو خواردنیان دەکڕیی بۆیان. ئێمە لەو کاتانەدا خواردەمەنیمان هاتبوەسەر کولەمەرگیی خواردنمان نەمانەبوو نۆكو کنگری کولاو، کاڵەكوشوتیونان، شەکری ئەسمەر لەسەر سینیی ئەکرایە ئاو ڕەق دەبوو بۆ دیشلەمە، زۆر ژنی خانومان کەوتنە کڵاو وکڵاش چنین بۆ پاروویەك نان، ئەسپێ پەیدابوو مامۆستاکانیان بەناچاریی نەوتیان دەکرد بەسەری قوتابیاندا لە قوتابخانە بۆ پاکژ کردنەوەی سەری قوتابییەکان!!!

# چۆنیێتی گواستنەوەی لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر

( مـوديری مـەعاریف ١٩٤٥/٣/١٠-١٩٤٥/٩/١٤ بەڕێوەبـەری پـەروەردەی کـەرکوك مووچەی ٣٠دینار)

وەك بەمێژووی مانەوەیدا لە کەرکووك دەردەکەوێت هەر پاش چەند مانگێك لەچوونی بۆ کـەرکوك شـەوێك لـەپڕ بروسکـەی بۆ هـاتووە کـە دەبێـت بەگەیشتنی ئـەو بروسـکـەیە کەرکووك بەجێبهێڵێت و بچێت بۆ بەسرا..

بەوشەوە کەمن بەتەما بووم بچمەوە بۆ بەغدا، پشووی هاوین تـەواو بووبوو لەبەغدا دەمخوێنـد، چـونکە ناوەنـدیی سلێمانیی نەمامۆستای پێویسـت نـەکتێبی خوێنـدنیان نـەبوو مامۆسـتاکانی سـەرەتایی یـەك دووانێکـی سـوریی وانـەیان دەوتـەوەو کـەس دەرنەچوو. هـەمان شـەو لـەپڕ بـرا بچوکەکەمان تایـەکی ئێجگـار بـەرزی لێهات ئەوشـەوە پیرۆزی (ئەمین ڕواندزی) هاوڕێی باوکم لامان بوو زوو هەستمان بەوەنەکرد ئـەم منداڵـە واتـای لـێ هـاتووە. بـاوکم کـەزانیی خێـرا (د. مـەلیك)ی بـانگکرد کـە پزیشـکێکی زۆر بـەناوبانگ بـوو کچەکانیشـی هاوڕێمـان بـوون ئـەو وتـی (سـەحایا)یـەتیو دەبێـت ئاولـە (نوخـاعی شـەوکی)دەربهێـنین. دایکـم کردی بـە هەراوشیوەنو سوێندی خواردن نابێـت دەسـتکاریی بکرێـت، دکتـۆر مـەلیك بەناچاریی وازی لـەوەهێناو کەوتـە سـڕینی لەشـی بەئیسـپرتۆو کحولو دەرمـانی هێنانـە خـوارەوەی تـا هـەر سـودی نـەبوو، دایکـم ژنێکـی دیندار بوو زۆر بڕوای بەچارەکردنی کوردەواریی هەبوو. ئەمەیش من خۆم چەند جاربـە چاوی خۆم بینیومەو زۆر سودی هەبووە، لێرەدا ئەمـە وێنەیـەکی ئـەوە کـە خـۆم بینیومـە هەرچـەندە ئـەم جـۆرە چـارانە هـەر هێـزی ڕۆحیـی نـین. دیـارە هێـزی دەرونیـی و دەوروبەریش لەگەڵ ئەوشتانەی بەکاریدەهێننن تێکەڵ دەبێت.

بۆ وێنە لەکاتێکدا نۆژدار وتی براکەمان سەحایایەتیو دەبێت ئاو بـەدەرزیی لـە نوخـاعی شـوکی دەربهێنینو هـەموو ئومێدمان بـڕی لـەوەی چـاك بێتـەوە، تاکـەی لـەوەدا نەبوو!هەموو چووینە حەوشەوگریاین.

مەترسیی لەچارەسەرەکەی نوژدارەکەدا هەبوو، بۆیە دایکم ڕێگەی پێنەداو چەند ڕۆژێك چاوەڕوان بووین پاش سێ ڕۆژ براکەمان چاوی کردەوەو وتی قوبلّی ئەخۆم!!! ئێمە بەیەکجار دامانە قاقای پێکەنین، هەم لەخۆشیانداو هەم لەبەر ئەوداواکارییە سەیرەی براکەمان! سێ ڕۆژ بوو هیچی نەخواردبوو لەبەرئەوە بۆخۆی سەیر نەبوو دیاربوو زۆری برسیبوو.هەر ئەوەندە براکەمان چاکبووەوە من وباوکم بە شەمەندۆفێری بەغدا کەرکوك ڕۆیشتین کە هەر دەرەجە (٣) هەبوو، لەناو ٤٠-٥٠ کەسدا تابەیانی لەم ویستگە دادەبەزین و لەویان سەردەکەوتین، خەڵکیی بەقەفەزە قازو قوڵنگەوەو بە گوێنییە شتومەکەوە، فرۆشیاری چاومیوەو لەفە لەشەمەندۆفێرەکەدابوون و تەقەی پیاڵە چا بۆ بەئاگاهێنانەوەی نوستووان و کڕینی چا و ئاوی سارد یان میوە سەرنجیان ڕادەکێشایت، هەندێکیشیان سەبەتەخواردن بەسەریانەوەبوو لەهەموو ئەمانەش سەیرتر ژمارەیەك سەرخۆش بوون کەئەگەر باوکم لەگەڵما نەبووایە هەر زراوم دەچوو لێیان، تابەیانی ئێمە لەسەر ئەو تەختە ڕەقە بێ خەووخۆراك جوڵانێمان دەکرد. ئەم سەرخۆشانەش بەهەموو هێزی خۆیان دەنگیان لێهەڵدەبڕی بەئاوازێکی ناساز هاواریان دەکرد.هەر چۆنێك بێت گەیشتینە بەغداو باوکم بەوحاڵەوە ڕاستەوخۆ بردمی بۆیەشی ناوخۆی خانەی مامۆستایان (دارالمعلمات) بەشەو لەوێ دەبووم و بەڕۆژیش لەقوتابخانەی ناوەندیی ڕەصافە دەمخوێند.

باوکم وتی هەر ئێستا دەچم بۆ وەزارەتی مەعاریف،تابزانم ئەو بروسکەیە چییە؟ دوایی دێمەوە بۆ لات کەهاتەوە وتی: کاك فلانی لێپرسراوی شورتە مێردی فلان خانە کەشەوو ڕۆژ لەماڵمان بوو دایکتی بەجێنەدەهێشت، گوایە دڵسۆزو خزمەتکارو خۆشەویستی ئەوە داوای گوێزانەوەی کردووم و نەشی وتوە بۆچی؟ پێکەنیم وتم : دیارە لەبەرغیرەیە، چونکە ژنەکەی هێندەی هاتووچۆ دەکردین ناخۆشی کردبوو دیارە کابرا ترساوە لەخۆی، ئەگینا بۆ وادەکات؟ باوکم زانی گاڵتەدەکەم تاساردی کەمەوە، هیچی نەوت بەڵام پێش ئەوە دایکم وتی: شەوێك باوکت هاتەوە زۆر شڵەژابوو وتی گەیشتمە بەردەرگا یەکێك لەپشتەوە دەمانچەیەکی خستە سەر پشتیملم تابمترسێنێت ئینجا ئەوە بۆچی و لەبەرچی بووە باسی نەکرد بەڵام دیاربوو ئەمەش پیلان بووە، لەوساڵەدا بوو وابزانم پیلان گێڕان بوو دژی پارت و سەرۆکەکەی، ئینجائەوە هیچ

پێوەندیی هەبوو بەوەوە من نازانم، پاشان ئەمە لەبەردەرگای ماڵی خۆمان لە کەرکوك بووە لەڕێگەی قەڵانەبووە وەك (د.موکەرەم) وتویەتی کەباسی لابردنی رەفیق حیلمی لەهیوادا کردووەو ئەوانەی وەڵامیان دابۆوە لەکاتی خۆیدا وتبویان ئەمە چیرۆکی شانۆییە چونکە ئەوە دکتۆر باسی دەکات نەبووە وڕوونەداوە.

## محەمەد عەلی مستەفا[*]

د. موکەرەم تاڵەبانی لەباسی باوکمدا دەڵێ هاوڕێیەکی هەبوو لێپرسراوبوو لەوەزارەتی مەعاریف، زۆری خۆشدەویست و دڵسۆزی بوو، زۆر لەئیش و کاری خۆی و خەڵك و ئێمەدا یارمەتیدەدا.

برازایەکی هەبوو خۆی گەورەیکردبوو، ئارەزوەیدەکرد بیدات بەکوڕێکی برازای تری بەڵام قایل نەدەبوو. خۆی وابزانم ژن و ماڵی نەبوو لەبەر بەخێوکردنی ئەم منداڵانەی براکەی دوایی کە قایل بوو، چوو بۆ ئەستەمبوڵ جیازیی بهێنێت لەڕێگە ئۆتۆمبێلەکەی هەڵگەڕایەوەو مرد. زۆر ناسۆری گران بوو، جارێك هات بۆلامان بۆ کەرکوك دایکم بەعەرەبیی چیرۆکی شێتەوژیرەی بۆدەگێڕایەوە، کە وشەی وای تێدایە چیرۆك نووسیش نازانێت واتای چییە بەعەرەبی، ئەو گوێی نەدەدایە بەکوردییەکەی دەیوت.

محەمەد عەلی خۆی کورد بوو بەکوردیی گفتوگۆی دەکرد بەڵام برازاکانی بەعەرەبیی گفتوگۆیان دەکرد، ئینجا ئەوشەوە تابەیانی دایکم ئێمەی پچڕان لەبەرپێکەنین. دایکم عەرەبیی فێربووبوو بەقسە، بەڵام هەروەك هەرکوردێك هەڵەی هەبوو. تا لەموسڵیش بووین هەر جلی کوردیی کڵاوئاڵتونشی دانەکەن ئیتر لەبەغدا لەبەرگەرما وازیهێنا محەمەد عەلی فەرمانەکەی پێ گۆڕین.

---

[*] ئەم محەمەد عەلی (مستەفا) یە یارمەتی باوکمی دا ئەو فەرمانەی بۆبگۆڕن.

## بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی دیالە : $\frac{1945/9/11}{1946/11/10}$

وەك وتمان ڕەفیق حیلمی بەبروسکە لەکەرکووکەوە گواستراپەوە بۆ بەسراودەبوو هەمان شەو فەرمانەکە جێبەجێ بکات. بەلام کە گەیشتە بەغدا و چوو بۆ وەزارەتی مەعاریف ڕاستەوخۆ فەرمانەکەیان بۆ گۆڕیو کرا بە بەڕێوەبەری پەروەردەی دیالە . ئەمەیش زیاترلەبەر خاتری دایکم بوو چونکە دەیزانی زۆر بێزاربووە لەگواستنەوەکانی و ڕەنگە لەگەڵی نەڕوات بۆ بەسراو جێگای دوور. لەبەرگەرماو نەزانینی زمانەکە بەباشی، بەلام لەبەعقوبە ڕاهاتبوو، چونکە ئەم شارە کوردی تێدایە و نزیکە لە سلێمانییەوەو باخ و باخاتی خۆشی لێیەو فێنکترە لە باشوور، من لەم کاتەدا لەبەغدا ئامادەییم دەخوێند، هەرهاوینان بۆ پشوودان دەچوومەوە مالی باوکم. لەم ساڵەدا تاقیکردنەوەی بەکەلۆریای پێنجم ئەنجامداو یەکەمی عیراق بووم. باوکم لە بەغداوە هاتەوەو زۆر پێخۆشحالبوو، وتی ئەزانی (بعثە)یشیان داوەپێت تا (٥)ساڵ لە (ئەمەریکا) بەکالۆریۆس لەجوگرافیادا بخوێنیت؟ چیت پاداشت دەوێت ئامادەم، وتم گەشتێك بکەین بۆ خانەقین. خزمێکی لەوێ دەژیا پێماندەوت خالە فەتحی ئێستاش نازانم کوڕی خالی خۆی بوو یان دایکی. باوکم وتی هەر ئەوەندە،ئیتر چووین بۆ خانەقین، ئەو ڕۆژەمان زۆر خۆش ڕابوارد لەوێو هەموو کەوتنەباسی (قەسری شیرین) و دەیانوت خۆشە واشتی جوانی لێییە.

## یەکێ لەگەورەترین کارەساتەکانی ژیانمان

داوام باوکم کرد بمانبات بۆ (قەسری شیرین) کە ئەوکاتە لەسەرعیراق بوو. قایل بوو ئەوشەوە لەمالی قائیمقامی خانەقین بووین، بەتەمابووین شەوێ بگەڕێینەوە، ئۆتۆمبێلێکی ستەیشن و پۆلیسێکیشان لەگەڵ ناردین و چووین نیوەڕۆ لە ئوتێلێکی کۆن لەتەنیشت حەوزو ئاوو باخچەیەکی بچوکی یەك نهۆمیی پاك و خاوێن، نانوکەبابی خۆمان خواردو چووین بۆ بازاڕ برنجی صەدریو شتی ترمان کڕی.

تەماع گرتینی زیاتربڕۆین،بەرەو سەرپیلی زەهاو ملماننا لەوێش لەچایخانەیەکی فۆلکلۆریی دابەزین ماستاو چامان لەسەر حەوزوئاوەکە خواردەوە.. شۆفێرەکە

تایەکانی فووتێکردو بەرەو کەرەند کەوتینە ڕێ. لەڕێگە خوشکەکەم وتی باجێگاکانمان بگۆڕینەوە بۆلای پەنجەرەکە. جێمان گۆڕییەوەو هێندەی پێنەچوو گرمەیەك وەك بۆمبا هات،هۆشم لەلای خۆم نەما دوایی بۆیانگێڕامەوە کە دووتایەمان تەقیوەو ئۆتۆمبێلەکە هەڵگەڕاوەتەوەو هەموومان بە بریندارییی لەدەشتێکدا کەوتووین جووتیارەکان لەدوورەوە هاتوون بە سوتوو خوێنبەربوونی سەری دایکم و خوشکە ناونجییەکەم وملی براگەورەکەمیان ڕاگرتووە، باوکیشم ئەژنۆیوپشتی چاوی زامداربووەو منیش لووتم و ناوچەوانم، ئیتر بە بێهۆشیی لە ئۆتۆمبێلەکەدا ماومەتەوە، کە هاتوومەتەدەرێو ئەوانم بینیووە بەپەرشوبڵاویی کەوتوونو خوێنیان لێ دەتکێ! وەك خەو هاتۆتە بەر چاوم! باوکم لەسەر کورسی بوو یان بەرد نازانم سەری شۆڕ بوو بووەوە، بریندارو بێدەنگ بوو، ئەوانی ترم بەبیردا نایەتەوە! دووبارە لە هۆشخۆ چوومەوەو کەوتم. لەوکاتەدا ئۆتۆمبێلی زراعە بەتاڵ دەکەنو ئێمە سواردەکەن بەرەو قەسری شیرین بۆ هەمان ئوتێل کە لێی دابەزیبووین. ئیتر شەودادێتو سنوور دادەخرێت بۆیە بە ناچاریی لەوێ دەمێنینەوە، دواتر دوو دکتۆری زراعیی دێن شیرو دەرمانمان دەدەنێ من چاوم دەکەمەوە دەبینم حەوزە خۆشەکەی بەیانی، پرچێکی خوێناویی تێدایە، تومەز پرچی خوشکەکەمە کە تەپڵی سەری بریندار بووەو بۆ تەعقیمکردن قژیان بڕیووە.

بەیانیی براینەوە بۆ خانەقین، دکتۆر لووتی پشکنیم، وتی بەستەزمانە بەتەواویی لووتی شکاوە ئیتر دیسان لەسەر خۆم چوومەوە، دوومانگ بەوجۆرە مامەوە بەچەند (ئیسعاف)ێك براینەوە بۆ بەعقوبە، دووبارە دایکم قایل نەبوو لەنەخۆشخانە بکەوێن، ماڵەوەیان کرد بەنەخۆشخانە، قەرەوێڵە لەحەوشە، سەیارەی ئیسعافو تەداویی لەبەردەرگا، چەند نۆژدارێك تابەیانی بەدەورماندا دەهاتن سەرو دەموچاوم بەلەفاف بەسترابوو، هۆشم نەبوو نەمدەزانی چیم دەخواردەوە یان چیم دەخوارد؟ وادیاربوو هەر بێهۆش بووم، دایکم پشتی سەری بریندار بووبوو. لەم کاتەدا باوکم فەرمانی بعثەکەمی وەرگرتبوو.بەو حاڵەشەوە کەهاتمەوە هۆش خۆم هەروازی لێنەهێنام، ئەوەندەی بینیی چاوم کوێر نەبووە بەوخوێنەی ناوچاومی پڕکردبوو، پێی لێداگرتم وتی دەبێ ئەو (بعثە) یە لەکیس خۆت نەدەیت.من یەکەم مێینە بووم لەوسەردەمەدا کە ئەم پاداشتەم وەرگرت

بـۆ خوێنـدنی بـاڵا لەئەمـەریکا هـەر ئەوەنـدە لەجێگـە هەسـتام بردمـی بـۆ بەغـدا و پێداویستیی چوونەکەمی بۆ جێبەجێ کردم.

ئەوەی سەیرە لەم باسـی بەسـەر هاتـەدا ئەوەیـە ئـەو رەفیـق حیلمییـە چالاك و گورجو گـۆڵ و ئازایـە! ئـەوێك کەبـەو هـەموو زمانانـەی دەیـزانین (فارسـی و کـوردی و عـەرەبی) تەنانەت وانەی فارسیشی بە ئینگلیزەکانی سەردەمی شێخ مەحمود وتۆتەوە شیعریشـی پێداناوە کەچی دەیانگێڕایەوە ئـەو ڕۆژەی کارەساتەکە روویـداوە نـەیتوانیوە بەهیچکام لەوزمانانەی کە دەیزانین ورتەیەك بکات. واتـە هـەرهیچ قسـەی بـۆ نـەکراوە. هـەروەك لاڵ سـەری سـووڕداوەو سـەیری خێزانـە برینـدارەکـەی کـردووە چـۆن خـەڵتانی خـوێن بـوون و هەریەکـە لـە لایەکـەوە کـەتون. من لەوکاتـەدا سەروچاوم شـین بۆتـەوەو سـەرم ئاوسـاوەو ناوچەوانم بەقەد هەرمێیەك دەریـەڕیووەو چاوم پڕەبووە لـەخوێن و هـەر هـاواری پشتیشـم کـردووە، کاتـێ جارجـار هاتومەتـەوە سـەر خـۆم بینیوومـە براگەورەکـەم شوشـە ملـی بڕیووەو دایکم و خوشکیشم سەریان برینداربووە کەچی ئەو خوشکەم کە ماوەیەکی کەم بەر لەکارەساتەکە داوایکرد جێگەکانمان بگۆڕینەوە هیچی لێنەهاتبوو!.

هەر ئەو ساڵە پشووی هاوین تەواوبوو، لەوکارەساتە ڕزگارم بوو. هێشتاچاوم پڕبوو لەخوێن و زۆر بێهێزو لاواز بووم، چونکە پاشکردنەوی ئەوبرینپێچانەی کەلـە دەموچاوم ئـاڵێنرابوون، خـوێنی لـوتم بـەربوو هـەر لـەئێوارەوە تابـەیانیی نەوەسـتایەوەو بەتـەمام نـەمابوون. لەبەرئـەوە تووشـی کـەمیی خـوێنیش بووبـووم. بـەڵام بـاوکم هـەر لەسـەر ڕای خۆی ما و ناردمی بۆ ئـەمریکا لەپێشدا چووم بۆلوبنـان ،پـێش سـاڵێك لـە ناردنەکـەم بۆ ئەمەریکا دەبووایە لـەلوبنان بم تـائینگلیزیی فێرببم ئینجابچم بـۆ ئەمـەریکاو چـوار سـاڵ لەوێ جوگرافیا بخوێنم و بەڵگەنامەی بـەکالۆریۆس لـەوێ وەربگـرم لـە زانکـۆی کـلارك کـە بەناوبانگترین زانکۆی جیهانە لە جوگرافیادا. لە لوبنـان ناچاربووم ئەوبەشـەی لـەزانکۆی ئەمەریکیی لەبیروت دووساڵ بۆکچان علومیان دەخوێندو بەڵگەنامـەی (A.A.) دیبلـۆمی (جونێرکۆلیج) ی پێوەردەگیرا ئەوەبخوێنم و ئینگلیزیی تایبـەتی نـەبوو بۆ ئێمـە وەك بـۆ کوڕان هـەیبوو. لەبەرئـەوە لـەجیاتی ساڵێك بۆ فێربوونی ئینگلیزیی لـەلوبنان دووساڵی بعثـە کـەم ڕۆیشـت ،مایـەوە تـەنها سـێ سـاڵ بـۆ تـەواوکردنی بـەکالۆریۆس لـەجوگرافیادا لەئەمـەریکا و بەپشـتیوانی خـواو بەهـەوڵ و تەقـەلای خـۆم و هانـدانی بـاوکم وەك لەنامـە

تایبەتییەکانیا دەبیبنن . توانیم بەڵگەنامەی (.B.A)یش وەربگرم هەرچەندە لەبەشی ماستەرو دوکتۆرایش دەمخوێند چونکە زانکۆکە بەشی بەکالۆریۆسی نەبوو لە جوگرافیادا.

## تێبینی/

ئەم وردەکاریانەی لێرەدا خراونەتەروو رەنگە بڵێن زیاتر باسی خۆمە. بەڵام وەك دەبینن ئەمەکێشەو ئەشکەنجە بووە بۆ رەفیق حیلمی سەرەڕای ئەوهەمووهەوڵو تەقەلایەی کە بۆ خزمەتی گەلو نەتەوەکەیو لەئیشوکاری میریدا پێشکەشیکردوون ئەم خەمانەشی هەبوون.

هەروەها دەمەوێ هەڵەیەك ڕاستبکەمەوەکە زۆر زیانی لەمن داوە ئەویش ئەوەیە د.پاکیزەی خوشکم لە ژیاننامەکەی خۆیدا بەهەڵە نووسیویەتی:

١-ئەوساڵەی ئەو ڕووداوە روویداوە لەبەر ئەو کارەساتەی بەسەرم هاتووە دەوامی قوتابخانەم نەکردووەو ساڵی دوایی گوایە ئیمتیحانیبە بەکالۆریمداوەو ناردومیان بۆ لوبنان.

أ- وەك وتومە من پێش ئەو کارەساتە تاقیکردنەوەم تەواوکردبوو بەیەکەمیش دەرچووبووم‌و لەپاداشتی ئەوەیشدا باوکم بردینی بۆ ئەوگەشتە و هەرچاکبوومەوە هەمان هاوین کەپشوو تەواو بوو ڕۆیشتم بۆ دەرەوەو هەرگیز لەهیچ پۆلێك نەماومەتەوە دیارە د.پاکیزە لەبەرئەوەی دەمێکە ئەمە رویداوە ئەو لەبیری چۆتەوە.

ب- بعثەکەم بۆ ئەمریکاولوبنان نەبوو هەردووساڵ بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزیی لە لوبنان بووم.

٢-لەکاتی گەشتەکەماندا ئەو جێگەکەی بەمن گۆڕی نەك من بەئەوم گۆڕبێت!

نامەکانی باوکم کەدەیناردن بۆم بۆ لوبنان ئینجابۆ ئەمەریکا ماوەی پێنج ساڵ لەژیانم هەروەها وەڵامەکانی خۆم بۆی ئەوانە بە چەندین کتێب ناگێڕدرێنەوە بەکورتی بەڵام بەوردیو بەڕاستی هەرچی بەسەر هاتو ڕووداوو چی کێشەو گێچەڵو ئەشکەنجە هەیە پیشانتانی دەدات، بۆیە ماوە هەبێ بڵاویاندەکەمەوە، چونکە باشتر لەمن رەفیق حیلمی بەزمانی خۆی دەروونی خۆی هەڵدەڕێژێت. چی هەستو خواستی بەرامبەر بەئێمە

هەیبووە چی خۆبەختکردنە کە لەپێناوی پێگەیاندنی ئێمەدا کردوویەتی بەتایبەتی چەند بەپەرۆش بووە کە هەموومان خوێندنی بەرز تەواوبکەین. چەند ئاگاداری ژیانمان و کێشەمان و تەندروستیمان و خوێندنمان و ڕەوشت و هەڵسوکەوتمان بووە؟ چی هەوڵ و تەقەلای داوە پەکمان نەکەوێت هەموو ئەمانە بەروونی لەنامەکانیدا کەلەکاتی خۆیدا بۆیناردووم بەرجەستەدەبن[*]

چەند بەدوای گشت پێداویستییەکمانەوە بوو،ڕۆژ بەڕۆژ هاتوو چۆی وەزارەتی کردووە بۆجێبەجێکردنی ئیش وکارمان و پێداویستییەکانی ژیانمان و خوێندنمان، ئەمانە هەموویان لەکاتێکدا بوون کەهێندە سەرقاڵیش بووە بەئیش و کاری میری وخەباتەوە لەپێناوی سەربەرزیی میللەتەکەیدا.

سالی ( $\frac{1949-1946}{1951-1950}$ ) لەم ماوەیەدا ڕەفیق حیلمی هێشتا بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردە بووە لەبەعقوبە، خەڵکی دیالە زۆریان خۆش ویستووە و ئێجگار ڕێزی هەبووە لەناویانداو زۆر هاوڕێی چاکی هەبووە کە کاتی خۆشی لەناویاندا بەسەربردووە هەروەها خێزانەکەشی لەبەعقوبە دڵخۆشتربوون وەك لەشارەکانی تر، لەم کاتەدا من ڕۆیشتم بۆ لوبنان لە ١٩٤٨-١٩٤٩ دا بەپێی بعثەکەم ، بڕواننە ئەو هەموو نامەیە کە لەماوەی ئەم (٥) ساڵەدا باوکم بۆی نووسیوم و بڕواننە وەڵامی منیش بۆئەو، لەوێدا نمونەی ژیانی تایبەتی خێزانی ئەم پیاوە گەورەیەو ئاگاداریی ئەو سەبارەت بەگشت لایەنێکی ژیانیان هەروەها بیرو ڕای و چالاکی و هاندانی بۆ سەرکەوتنیان و ڕازونهێنانیان لەخوێندن و لەتێکۆشانداو حاڵ و ئەحواڵی خۆی و منداڵەکانی تری و دەستکورتی و خۆبەختکردنی بۆ منداڵەکانی چەند بە جوانی دەردەکەوێت؟

---

[*]١-بڕوانە نامە تایبەتییەکانی بۆ منداڵەکانی بەتایبەتی بۆ ناهیدەی کچی کاتێ لەدەرەوەی وڵات خوێندویەتی.

٢-بڕوانە ئەو بابەتەی ناهیدە ڕەفیق حیلمی بڵاویکردۆتەوە بەناوی" ڕەفیق حیلمی ڕاستە نیشتمانپەروەری ئاینی بووە بەڵام هەرگیز منداڵەکانیشی لەبیر نەچووە، ئەمەوەڵامی بابەتێکی خوالێخۆشبو مستەفا نەریمان بوو. کاتێ لە یەکێك لەوەچەکانی ڕەفیق حیلمی پەستبووبوو وتبوی گوایە منداڵەکانی نەچوونەتەوە سەر خۆی هەروەها وتبووی ئەو دوایی ئەوەی ئاشتدەکردەوە کە لێی تووڕە دەبوو بەڵام ئەمان ئەوەش ناکەن و هتد......

لەساڵی ١٩٥١-١٩٥٢ باوکم لەبەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی بەعقوبە لابرا، ئەوکاتە من هێشتا لەئەمەریکا دەمخوێند،نەمدەزانی بۆ لابرا لەو ماوەیەدا باوکم و ئەوان چووبوون بۆ بەغداو لەوێ دادەنیشتن. باوکم لەئامادەیی تفیض وانەی دەوتەوە، کە گەڕامەوە ئێجگار دڵتەنگ بووم لەحاڵ و ئەحواڵی، هێندەی پێنەچوو کرایەوە بەمودیری مەعاریف لە عەممارە، (قەدەم خێر) واتە کچەکەمان دیسان بووبە خێر بۆمان.

کەی بەتەواوی لەبەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی بەعقوبە لابرابوو نەمدەزانی؟ وەك وتیان لەبەرئەوە بووە دوو مامۆستایان بێپرسی ئەو لە بەعقوبەوە گواستۆتەوە بۆ سەر سنوور.

## ساڵی ١٩٥٢-١٩٥٤ لەعەممارە

پاش ماوەیەك لەوبارودۆخە ناخۆشەی لەبەغدا لەساڵانی ١٩٥١،٩٥٠ لەخانویەکی جولەکەکاندا بردبوویانەسەر لە (بستان الخمس) ساحە النصر ئەمجارەشیان باوکم بەهەوڵ و تەقەلای هاوڕێیەکی دڵسۆزی بەناوی مامۆستا محەمەد عەلی مستەفا کرایەوە بە (مودیری مەعاریف) ئەمجارەیان لە عەممارە . هەرچەند دایکم و هەموومان زۆرمان پێخۆشبوو کە گەڕایەوە سەرئیشوکاری خۆی، بەڵام زۆریش دڵتەنگ بووین کە هەروا زوو هێشتا پاش پێنج ساڵ غەریبی و خوێندن لەدەرەوەی وڵات ، هەمووی مانگێکی پێنەچوو کەچی سەفەربکات بۆ عەممارەو بەجێمان بهێڵێت؟!

هەرچۆنێك بوو دایکم قەناعەتی پێ کرد بچێت لەگەڵی و منداڵە بچوکەکان ببات و من وپورم و ئەوانی تر لەبەغدا بمێنینەوە، لەبەر خوێندنی براو خوشکەکەم لەبەغدا چونکە منیش لەبەغدا دامەزرابووم.

**سەرگوزشتەی هەڵبژاردنی رەفیق حیلمی بۆ (نیابەت)**

لەم ماوەیەدا دەنگ بڵاوبۆوە کەهەڵبژاردنی ئەندامی پەرلەمان سەربەست دەبێت. جاران ڕاهاتبوون ڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەتەوە دادەنران و کوردەکان هەمیشە هەمان دوو نوێنەریان هەبوو ماجید مستەفا و سەعید قەزاز.

باوکم هەرچەند دەیزانی کە هەروەك جارانە و هەڵبژاردنەکە سەربەست و سەربەخۆنیە، بەڵام هەر بۆ تاقیکردنەوە خۆی بۆیەکەمجار کاندیکرد. لەبیرمە ئێوارەیەك باوکم ودایکم و منداڵەکان لەعەممارەوە هاتبوونەوە بۆ ئەم مەبەستە. لەپڕ ماجیدو سەعید قەزاز هاتن و

چوونە ژووری میوان کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵیدا، دیاربوو بە زوویریی ڕۆیشتن، دوایی دایکم پێیی وتین کە پێیان وتووە، وازلە خۆکاندیدکردن بهێنە، لێپرسراوان بەبێ ئەوەش ڕاستەوخۆ دەتکەن بەنوێنەر، لەجیاتی هەرکامێك لەئێمە.باوکیشم پێی وتبوون من لەبەر (نیابەت) خۆم کاندید نەکردووە، من دەمەوێ گەلەکەم بزانێ هەڵبژاردنەکە ڕاست نییەو سەربەست نیە، هەروەك جارانە ئەوەتا واش دەرچوو.

ئەو سەد دینارەی باوکم پێویستی بوو بۆ تەئمینات، قەرزی کردبوو، دوایی بە قیست دایەوەو هەر سووربوو لەسەر چوون بۆ سلێمانی لە ڕۆژی هەڵبژاردنداو چوویش.... شەوی هەڵبژاردن گوایە وتیان شێخ چەند هەزار کەسی ناردبووە قەراغ شاری سلێمانی، تارەفیق حیلمی هەڵبژێرن ،بەڵام نەیانهێشتبوو ئەو کەسانە بچنە ناوشار. شەوێ تەلەفۆنمان بۆکرا لەسلێمانی یەوە، وتیان ڕەفیق حیلمی وا لەپارێزگای سلێمانی دانیشتووە. دەیانەوێ قایلی بکەن واز لەبیری هەڵبژاردن بهێنێت و پاشەکشە بکات بەپەیمانی ئەوەی بە تەزکیە دەربچێت،کەچی قایل نابێت، ئەمەیش بەواتای خستنەوەی ئاژاوەیەکی پڕمەترسیی دێت لە سلێمانی و ڕەنگە ببێتە هۆی تەقەو چەند کەسێکی بێگوناهیش تیابچن. بۆیە دەمانەوێ ئێوە خۆتان بەڵکو هەوڵبدەن تا هیچ نەبێت لەبەر ئێوە وازبهێنێت. من خۆم بە تەلەفون قسەم لەگەڵ باوکم کردو تکام لێ کرد لەبەرخاتری خەڵکەکە وازبهێنێت ئەوەبوو کەوازی هێناو هەڵبژاردن بەتەزکییەشی ڕەتکردەوە.

## نموونەی یادنامەکانی ڕۆژانەی

ئاخر پێنج دیناری نائبی ١٩٥٧ خۆشەویست حەفیدزادە سەید ئیبراهیم ئەفەندی شەوی $\frac{12}{13}$/١٩٥٧/٧ یەعنی شەوی یەك شەممە نزیك خانەکەی کەرکوکیزادە ئەحمەد ئاغا درایەوە بەخۆیو بەمە حیسابی ئەو (١٠٠) دینارە کە بۆ تأمیناتی اینتخابات(*) بەقەرز لێموەرگرتبوو تەواو بوو لەسایەی خواوە لەم قەرزەیش ڕزگارم بوو.

$\frac{2}{13}$/١٩٥٧/١٠

ڕەفیق حیلمی

---

(*) ئەمەم لەدەفتەرێکی (مفکرە)یدا دۆزیەوە. باوکم ئەمە بووە، ئەگەر وەك د.موکەرەم تاڵەبانی باسی کردووە ئاخۆ پارەی ئەندامانی هیواچی لێهاتوەو ئەم بوختانەی کردۆتە ملی ئەمیندارانی هیوا، ئەگەر باوکم لەو جۆرە کەسانە بوایە هەڵبەتە پێویستی بەقەرزکردنی (تائمیناتی انتخابات)و دانەوەی بە اقساط واتە (٥) دینار ٥دینار نەدەبوو. هەروەها تادواساڵی ژیانی هەر قەرزی دروستکردنی ئەو خانوەی دەدایەوەکە پارەی گشت خێزانەکە بووچەند پارچە خشڵێکی کۆنی دایکمو گوارەو ئەنگوستیلەی منداڵانو تەنانەت هی باوەژنی دایکیشم و پوریشمی فرۆشت بێجگە لە وەی ئەحمەد ئاغا کەرکوکی زادەی خزممان پارچەیەك لەزەویەکەی پێبەخشین ئینجا توانیمان خانوو دروستبکەین.

## بەغدا پێش شۆڕشی تەمموز ١٩٥٢-١٩٥٨

لەم ماوەیەدا رەفیق حیلمی پشکنەری تایبەتی بیرکاریی بوو لە بەغدا لە ١٩٥٢-١٩٥٤ کرایەوە بە بەرێوەبەری بەڕێوەبەرایێتی پەروەردە لە عەممارە وەك وتمان پاشان زوو زوو دەچوو بۆ شارەکانی تر لەبەغداوە بۆ پشکنینی قوتابخانەکانی شارەکانو بەپاص دەچوو تاپارەی زۆر نەدا بەئوتۆمبێلی تایبەتی. رۆژێکیان خۆم بردمە لای پاصی دیوانیە، چونکە تائەوکاتەش هێشتا مووچەی نەگەیشتبووە (١٠٠) دینارو زۆر جاریش پێش کۆتایی مانگ ناچاردەبوو شتێك لەخزمێکمان قەرزبکاتو لە بەغدایش هەر بەپاص دەچوو بۆپشکنینی قوتابخانەکان.

پێش شۆڕش باوکم زۆر کێشمەکێشی پێکرا، جارێك دەکرا بەیاریدەدەری ئامادەیی (مەرکەزی) یە جاریّ بەڕێوەبەری شرقیە یان کەرخ و زۆر ئیستیفزاز دەکرا. بڕواننە وێنەی رەشنوسی ئەم چەند کاغەزە کە بۆ لێپرسراوە گەورەکانی ناردووە کە بەزمانی تورکینو هەستو نارەزایی خۆی زۆر ئازایانە روونەدەکاتەوە وەك ئەم نامەیەی بۆ نوری سەعیدپاشاو ئەوەی بۆ ئەرشەد ئەلعمری ناردووە.

صاحب المعالي

مدير المعارف العام

لقد تسلمت الامر الوزاري المرقم ٢٠١٥ والمؤرخ ١٩/١/٩٥٦ المتضمن اعادتي الى معاونية الاعدادية المركزية بعد كل الجهود التي بذلتها لتعييني في محل آخر وبوظيفة ثابتة تتلائم مع مؤهلاتي [منذ اكثر من سنة] واصبحت اشعر بان اصرار المسؤولين على ابقائي في هذه المدرسة بالوضع غير الطبيعي الذي انا فيه ودون اسناد اي عمل لي اقوم به، ما هو الا وسيلة لاستفزازي واثارة مشاعري وعواطفي دون ان اعرف لذلك اي مبرر. فقد كان على وزارة المعارف ان تقدر ظروف الموظفين القدماء امثالي وتجد من خدماتهم الطويلة المشرفة ومن ادائهم لواجباتهم باخلاص وكفاءة ومن تمسكهم بالمبادئ السامية وبالخلق الرصين ما يجعلها ان تشعر بواجبها نحوهم حتى تتمكن من العطف عليهم وتكليفهم المراكز اللائقة بهم جزاء لهم وتشجيعاً لامثالهم. اما اذا كان المسؤولون في المعارف يأبون السير على هذه الخطة الرشيدة او تقدير الموظفين [illegible] في [illegible] بمصاير امثالي وتقديراتهم او في [illegible] يحتقرون [illegible] ذكرياتهم فاني لست بقادر على ان اتحمل سوى [illegible] [illegible] [illegible] بما سيصيبني من الاذى بعدما تجرعت على ايدي بعضهم من الاذى المعنوي حتى الثمالة. فقد امر لهم باني [illegible] مؤمن بان الحق يعلو ولا يعلى عليه واخيراً تفضلوا بقبول فائق احتراماتي ودمتم

رفيق حلمي

معاون مدير الاعدادية المركزية

٢٢/١/٩٥٦

## هێرشی سێ قۆڵیی بۆ سەرمیسر (العدوان الثلاثی)

ساڵی ١٩٥٦ لەکاتی هێرشی سێ قۆڵیدا بۆسەر میسر. ئامۆزایەکی باوکم کوڕەکەی لەئامادەیی شەرقیەبووە وباوکیشم لەوێ بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیە بووە. ئەو قوتابییە چۆتە ماڵەوەو بەدایکی وتووە ئەمڕۆ ئامۆزاکەتیان بەسەرشان برد بۆ باڵوێزخانەی میسر بە وتنەوەی دروشمو گۆرانیی نیشتمانیەوە.شایانی باسە کە قوتابییەکانی زۆر یان خۆشدەویستو ڕێزیان لێ دەگرت چونکە ئەویش زۆر باش بوو بۆیان [*]

ڕەفیق حیلمی پێشتگیریی قوتابیەکانی دەکرد، کە دەکەوتنە کێشەیەکەوە یان لەکاتی مانگرتنو خۆپیشاندانیاندا لەناو قوتابخانەدا. تەنانەت ڕۆژێك لەپڕ تەلەفونی کرد بەدایکمی وت: جانتایەكو دەستێك نوێنم بۆ ئامادە بکە چونکە لەوانەیە بمگرن . تاهاتەوە چەند کفنمان دڕی دواتر پرسیمان چی ڕوویداوە ؟ وتی: وەزیر بە تەلەفون فەرمانی دامێ هەرئێستا لیستەی ناوی ئەو قوتابیانەی بۆ بنێرم کە مانیانگرتووەو من وتومە هیچیان نەکردووەو قوتابیان هەموویان لەپۆلدان وەزیریش وتویەتی ئێستا هەواڵمان بۆ هاتووە لەقوتابخانەکەوەو توڕەبووەو هەڕەشەیکردووە. لەکاتی هێرشی سێ قۆڵییەکەشدا ڕەفیق حیلمی پشتیوانیی لەمیسر کردووە، هەر لەو بۆنەیەشدا قوتابیان بۆ خۆپیشاندان چوونەتە بەردەم باڵوێزخانەی میسرو ڕەفیق حیلمیی بەڕێوەبەریان بەسەر شانیان هەڵگرتووە.

بێجگە لەمە بۆ بەشداریکردن لە پشتگیریکردنی میسردا باوکم بەناوی جەمیلە خانی خێزانییەوە بەسەفارەتی میسری وتووە هیوای سەرکەوتن بۆ میسر دەخوازێتو

---

[*] ١٩٤٨-١٩٤٩ بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی دیالە (من لەبەیروت بووم).
١٩٥٠-١٩٥١ لابرا، (من لە ئەمەریکا بووم)
١٩٥١-١٩٥٢ کرایەوە بە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردە لە عەممارە
١٩٥٥-١٩٥٨ هاتەوە بۆ بەغدا وەك پشکنەری تایبەتی. دەستبەکاربوو
١٩٥٨-١٩٥٩ کرابە مولحەقیڕووناکبیریی لە تورکیا پاش شۆڕشی تەمموز
١٩٥٩-١٩٦٠گەڕیەوە بۆ بەغدا بووەوەبە پشکنەری تایبەتی.
١٩٦٠ کۆچی دوایی کرد..
تکایە ببورن ئەگەر پاشو پێش هەبێت لەساڵەکاندا چونکە لەو ماوەیەدا زوو زوو کارو شوێنی کارەکەی دەگۆڕانو زۆر کێشەکێشیان پێدە کرد.

پرسیبووی بۆ گەیاندنی ئەم هەستەی خۆی بەمیسرییەکان چیبکات باشە ؟ وتبوویان بروسکە بنێرە بۆ سەرۆك (جەمال عەبدولناسر) پێخۆشحاڵ دەبێت. من بۆخۆم وەڵامی ئەو بروسکەیەم بەناوی جەمال عەبدولناسر-ەوە بینیووە ئەویش لەناو نامەکانی باوکمدا.

وەك چەند جار باسکراوە و بۆخۆیشی لە یاداشتەکانیدا ئاماژەی پێداوە رەفیق حیلمی هەستی نەتەوایەتی بەرامبەر بەسەرجەم نەتەوە کانی دنیا هەبووە چونکە خۆی نەتەوە پەروەربووە.

لەسالآنی پێش شۆڕشی تەمموزو کۆچی دوایی خۆیدا واتە لەسالآنی ١٩٥٢-١٩٥٨-١٩٦٠، لەو ماوەیەدا کە بەهۆی شیعرەکانی و کاری میریشییەوە زۆر کێشەی بۆ دروستبووبوو گەلێك لەو بەرهەمانەی کە هێشتا بەچاپی نەگەیاندبوون وەك بەشێك لە یاداشتەکانی و کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردیی) لەچاپیدان. ساڵی ١٩٦٠ بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات بە ماوەیەکی زۆر کەم، کۆمەڵە شیعری دووەمی بەناوی (پاش تەمموز) بەچاپ گەیاند. ئەم بەرهەمە بەکوردییەو خۆی لەژیانی خۆیدا لەچاپیداوە، بەهەڵە چەند جار وتراوە ئەم کۆمەڵە سیعرە پاش کۆچی دوایی رەفیق حیلمی چاپکراوە چونکە ئەم دیوانە ساڵی ١٩٦٠ بلآوبۆتەوەو خوالێخۆشبوو رەفیق حیلمی مانگی ٨ی ساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووەو کتێبەکە پێش ئەو مانگە بلآوبۆتەوە. بەلآم بەداخەوە خۆی پێڕانەگەیشت بیانگەیەنێت بەکتێبخانەکان بۆ فرۆشتن‌و گەلێك نوسخەیان تا ئێستاش لەماڵەوە ماون (کێ ئارەزوو دەکات بیانخوێنێتەوە بابێت تاپێشکەشی بکەین).

رەفیق حیلمی لەم ماوەیەداو پێشتریش هەرپێنوسی دانەناوەو زۆر بابەتی بلآوکردۆتەوە لەگۆڤارو رۆژنامەکانی سەردەمی خۆیدا، تەنانەت وتاریشی لەئیستگەدا پێشکەشکردووە ! وابزانم دوا وتاری باسێك بووە سەبارەت بەئەمین زەکی بەگ.

لەوشیعرانەدا کە پاش تەمموزو پێش تەمموز هۆنیونییەتەوە، تیایاندا پێشبینی کردووە شۆڕشێ هەڵبگیرسێت .

## ١٩٥٨ لەكویت لەگەڵ وەفدی یەکێتی ئەدیبانی عیراق

لەیادنامەیەکی بۆری بچوکدا نووسراوە :

١٩٥٨/١٢/١١ بەیانیی چوارشەممە.

بەغداد- کەرکوك- موسڵ بەفڕۆکەی هێڵی عێراقی. کاتژمێر ٧/١٥ میوانخانە، تەحقیق لەگەڵ بەڕێوەبەرو هەندێك مامۆستاو یەکێتی قوتابیان، زیارەتی قوتابخانەی کۆمەڵەی رۆشنبیریی و دار المعلمین و زراعه وصناعه.

لەلاپەڕەیەکی تردا نووسیویەتی:

خەیری مەحمود (قائم بتفیش) دژی کوردەکان (ضدالاكراد)

لەلاپەڕەیەکی تریشدا ئەمەی نووسیوە :

ئەگەر بەمن بێ من ئەڵێم

عێراق وەك دیلی بێ فەڕ

درابووە بەرلیسی نۆکەر

ئەمە وابزانم بەشێکە لەو شیعرەی دوایی لە دیوانی (پاش تەمموز) دا بڵاویکردۆتەوە.

**١٩٥٨/١٢/٢٠ سەفەری یەکەمی لەگەڵ نووسەرانی عێراق بۆ کوێت**

لەیەکێ لە لاپەڕەکانی ئەم یادنامەیەدا بەباسێك دەستی پێکردووە کە پیشانیدەدات رەفیق حیلمی چەند پاك و دڵسۆز بووە نەك هەر لەگەڵ نەتەوەو گەلی خۆیدا بەڵکو لەگەڵ هەموو گەلانی عێراق ودەرەوەی عیراقیشدا. بەناوی مامۆستا نوری کەپارێزەرێکی عێراقی بووەو مامۆستابووە لەکوێت چەند وتەیەکی وەرگرتوە کە ئەمانەن :

١-یاسای تەملیکی کوێتی ساڵی نووسیوەتەوە. فاضل الجمالی و عبدالالەو مەلیك پاش زیارەتی کوێت و وەرگرتنی دیاریی کە پێشکەشیان کردون وەك ئۆتۆمبیلی کادیلاك و گەردانەی مرواری و شێری ئاڵتون...

٢-وەزعی عێراقییەکان لەکوێت، جیاوازیی لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا و لەمووچەوەرگرتن وئیمتیازاتدا.

٣-ژمارەی فەرمانبەران و مامۆستایانی عیراق، نزیکەی (٢٠) مامۆستان بەرامبەر بە (٥٠٠) مامۆستای میسریی.

٤- جاليەی عێراقيی لەوانيتر زياترن،بەڵام زۆربەيان کريکارن.

٥- بازرگانانی کوێت جێگە بازرکانييە گرنگەکانی بەسرا لە بازاڕی سوق الصيادله و هتد.. دەگرن

٦-خەڵکی کوێت زەوی و عەقارات لەبەغدا و بەسرا دەکڕن پاش دەرچوونی ياسای تەمليك.

٧- قونسولخانەی ئەمەريکا لەکوێت زۆری ديناری عێراقی کڕيووە .

رەفيق حيلمي بەمشێوەيە باس‌و خواسەکانی ئەم سەفەرەی تۆمارکردووە دواتريش ناوی ئەوانەی نوسيووە کە لەو گەشتەدا وەك ئەندامی يەکێتی نووسەرانی عێراق و جێگری سەرۆکی يەکێتييەکە ناسيونی‌و ئەمانە لە وڵاتە عەرەبييە جۆربەجۆرەکانەوە هاتوون و ديارە هەموويانی ناسيووە‌و گفتوگۆی لەگەڵ کردون‌و وتاری لەسەر نوسيوون. تەنانەت نووسيويەتی ئاشنابوونی بە ئەندامانی تيپی شانۆی نەتەوەيی ( المسرح القومي) لەنەخۆشخانەی کوێت بەشی دانسازيی بووە‌و گاڵتەی لەگەڵ ژنە هونەرمەند (ئەمينە رزق) دا کردووە کەئەکتەرێکی بەناوبانگی ميسرە‌و پيرۆزبايی لێکردووە بۆ نواندنی ڕۆڵی (لەيلا) لەسەر شانۆی هۆڵی قوتابخانەی (الصديق)ی شکۆدار لەکوێت بەشێوەيەکی زۆر جوان‌و سەرکەوتووانە کەئەم بەرهەمە بەشێوەيەکی تايبەتی پێشکەش بە وەفدەکە کراوە.

## پێنج شەممە ١٩٥٨/١٢/٢٥کوێت

لە لاپەڕەيەکدا نووسيويەتی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٥٨/١٢/٢٥ چووە بۆ نەخۆشخانەی ددان‌و سەرۆکی ئەوبەشە ناوی د. يوسف الاسدي بووە لەوێ ددانێکی کێشاوە‌و دکتۆر عەبدول لەتيف عەلەکەی بينيووە،لە لاپەڕەيەکی پاش ئەم تێبينييەدا بە قەڵەمی رەساس نووسراوە ١٩٥٨/١٢/٢٦ کە بەدەستو خەتی باوکم ناچێت‌و خەتی يەکێکی ترە.

لە شوێنێکدا رەفيق حيلمي ناوی ئەوانەی نووسيووە کە لەوێ ناسيوونی‌و ئەمانە بوون:

الدكتور محمد هفطشي الأردني، يعمل في الكويت تعرفت عليه عن طريق الاستاذ درويش المقدادي واتە لە کوێت کاردەکات‌و بەهۆی مامۆستا دەروێش ميقدادييەوە

ناسیوونی ئەم دکتۆر محەمەدە یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەو زانیاریی کوێت بووەو باوکم نوسیوویەتی سەبارەت بەڕێبازی ڕۆژنامەی (العجن)ی کوێتی لەسەر یاپۆرەکە گفتوگۆم لەگەڵدا کرد بەئامادەبوونی مامۆستا کامیل الشناوی. ئەم باسەش دوورو درێژ بۆوە تا گەیشتینە سەر باسی عەرەبە قەومییە متطرفەکان .

لەوناوانەی تر کە رەفیق حیلمی لەم یادنامەیەدا باسیکردون و ناسیوونی ئەمانەن( اسعد داغر، عبدللة المازنی، الدکتوره بنت الشاطئیو الأستاذ امین الخوکلە) دەڵێت وێنەیشی لەگەڵ گرتوون، کە ئەم وێنانە تائێستاش ماونو لەم کتێبەدا دەیانخەمە بەردیدەی خوێنەرانی خۆشەویستو دۆستانی رەفیق حیلمی.

لە شوێنێکی تردا باسی دکتۆر سهیل ادریسی خەڵکی لوبنان دەکاتودەڵێت (تحدثت معە عن مجلة الأداب) واتا باسی گۆڤاری(ئاداب)م لەگەڵ کرد. دواتر باسی عە فیف الکیالی دەکات کە خەڵکی حەلەب بووەو جوانترین شیعری لەو فێستیڤاڵە شیعرییەدا پێشکەشکردووە.

هەروەها نوسیوویەتی دکتۆر شەوقی ضیف کە مامۆستای کرلێجی ئادابی قاهیرە بووە لەلیژنەی (گۆڤار)دا ناسیویەتیو ئەوویەتی خاتوو پاکیزەی کچتان دەناسم .

باوکم هەر لەم یادنامەیەدا نوسیوویەتی دکتۆر سهیل کە خاوەنی گۆڤاری (الاداب) ەلە لیژنەی ئەوگۆڤارەدایە کە میهرەجانەکە دەریدەکات هەروەها مەحمود جواد الغیان-یش کە نووسەرێکی عیراقییەو خاوەنی گۆڤاری (الفکر)ە ئەمیش لە لیژنەی گۆڤارەکەدابوو،وەك دەردەکەوێت ئەندامەکانی ئەو گۆڤارە وەفدەکە خۆیان بوون، مامۆستا رەفیق حیلمی-یش ئەندام بووە تیایداو بەهۆی گۆڤارەکەوە لەنزیکەوە ئەو رووناکبیرانەی ناسیووە کەباسی کردوون.

لەم لاپەڕەیەداو بەقەڵەمێکی سەوزو دەستو خەتێك کە بە خەتی باوکم ناچێ نووسراوە (انقله هنا لمعرفة الاخطاء في الکتابه رغم ان الشخص کما ذکربنفسه في دائرة المعارف الکویتیة وقدکتب: حسن ابراهیم کمال داء رة معارف حکومة الکویت قسم الاسکان وتأثیث!)

رەفیق حیلمی-یش بەدەستو خەتی خۆی وبە مەرەکەبی سەوز نوسیوویەتی :کان مکلفأ بتأمین راحتنا في ضیافة رقم (١)

لەلاپەڕەکانی تری ئەم یادنامەیەدا ڕەفیق حیلمی نوسیویەتی رئیف الخوری بیروت- لوبنـان ڕۆژنامـەی (الکفـاح)، (الکلیـه البطررکیـه للـروم الکاثولیـك). رئیـف لـە ئەدیبـە یەکەمەکان بوو کە لەگۆنگرەی نووسەران لە کوێت ناسیمو بیری ساغیان هەبوو سەبارەت بـە (دیمقراطیـة)و ئیعتیرافکـرن بـە (قـەومیاتی) غـەیری عـەرەب، بەتایبـەتی بـاوەڕبوون بـەمافی نەتـەوەی کـورد وەك هـەر عیراقییـەك بـاوەڕی بـەدیمـوکراسی هـەبێ، کـەپاش شۆڕشی ١٤ ی تـەمموز لەعیراقدا بلاْوبۆتـەوە . مامۆستا جـواد الغیـان خـاوەنی گۆڤـاری (المجلـه)ی بغـدادی وتـارێکی بـەنرخی لـەرئیف وەرگـرت کـە ئـەم بۆچـوونەی تیـادا بەیانکردبوو.

## ١٩٥٨/١٢/٢٢ کوێت

لەشوێنێکدا ئەم ناوانەشی نوسیووە :

سعید فهیم نوێنەری (الجامعه العربیه)، عبدالکریم المدرس

هەروەها ئەم ناوانەیشی ناساندووە:

١-حمزه عباس- دائرة المالیه بەشی نهێنی (القسم السری) الکویت

٢-احمد شاب القدس- فلسطین

٣-خەلیل البیطار- الاردن

٤-سعید البدری- سامراء

٥-الشیخ عەبدالزهره

٦-ابراهیم العریض -البحرین

٧-محمود محی الدین احمدی- المعارف العامه الکویت.

ڕەفیـق حیلمـی لەبەرئـەوەی ئەنـدامی لیژنـەی دەرهێنـانی گۆڤـاری فێسـتیڤاڵ بـووە لیستی ناوی لیژنەکانو ناوی سەرجەم ئەندامانی لەلابووە

وێڕای وێنەی هەموویان.

## ١٩٥٨-١٩٦٠ پاش شۆڕشی تەمووزو پێش کۆچی دوایی

باوکم تەنها دووساڵ دوای ڕاگەیاندنی شۆڕش ژیا . بەیانیی لەپڕ کە ئیستگەکە وتی (هنا الجمهوریە العراقیە) واتا ئێرە کۆماری عیراقە باوکم لەو شیعرەیدا کەبەناوی (شۆڕشی تەمموز)ەوە دایناوە هەستی خۆی بەرامبەر بەو وشانە لەدیوانی (پاش تەمموز)دا دەربڕیووەوهۆکاری ڕوودانی ئەو شۆڕشەی بەدەرئەنجامی ڕەفتاری ئەو حکومەتە لەقەڵەم داوەکە ئەوەندە گەلەکەی لەدەستی بێزار بوون، ڕەفیق حیلمی دەڵێت کە گوێم لە (هنا الجمهوریە العراقیە) بووهێندە نەبوو لە خۆشیاندا لەسەر خۆ بچم.

## پاش تەمووز ١٩٥٨-١٩٥٩

ساڵانی ٥٨-٥٩ باوکم کرا بە مولحەقی ڕووناکبیریی لەتورکیا، بەڵام دیارە لەوێ (وەك خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان لەیەکێك لەبابەتەکانیدا نوسیوویەتی) حکومەتی تورکیی ترسی هەبووە لێی، ترساوە لەوەی کوردەکان هانبدات لەدژیان، بۆیە داوایان لە حکومەتی عێراق کردووە بیگەڕێننەوە بۆ وڵاتی خۆی، هەرلەبەر ئەوە مانەوەکەی لەتورکیا تەنیا دووساڵی خایاند.

مامۆستا مستەفا نەریمان نووسیویەتی ئەم هەواڵە لەڕۆژنامەی (لۆمۆند) ی فرنسیدا بڵاوکراوەتەوەو لەژمارە (٢٨)ی ڕۆژی کوردستانی ئێرانی(٢٠ك ١٩٦٠ ) ئیتر دوای ئەمە ڕەفیق حیلمی کە گەڕایەوە بەغدا تاکۆچی دوایی پشکنەری تایبەتی بوو، هێشتا خانەنشینیش نەکرابوو کە لە (٤ ئابی ١٩٦٠)دا کۆچی دوایی کرد.

ئەو کاتە جارێ (٤٥) ساڵ خزمەتی هەبوو هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی خانەنشینیو تەمەنی(٦٢)ساڵ بوو ئەو تادوا هەناسە لەخەباتو هەوڵو تێکۆشان نەکەوت. هەمیشە وەك کاتی گەنجێتی بەشەو و بەڕۆژ کایدەکردو سەرقاڵ بوو، بەڕۆژ کاری میریی کە لەیەك ڕۆژدا دووجار دەچوو بۆ بەعقوبە بۆ پشکنینی قوتابخانەکانو ڕاپۆرت نوسین . وێڕای کاری میری سەرقاڵی نووسینو پرۆژەی لەچاپدانی کتێبەکانی بوو لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە گەلێك هەوڵیدا تا کۆمەڵە کوردییەکان یەکبگرنەوەو کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی بەسوود بهێننەئاراوە، کەچی ئەوانەی خاوەنی ئەو کۆمەڵانە بوون

هەوڵیاندەدا ڕایبکێشن بۆ ناو ئەو کۆمەڵانەی خۆیان دایانمەزراندون بەڵام وەك ماموستا مستەفا نەریمان دەڵێت ئەو رەفیق حیلمی یەی کە سەرۆکی باڵای پارتی هیوا بوو نەدەکرا ببێت بەئەندامێکی لاوەکیی لەناو هیچ پارتێکی تردا.

وەك دواتر بیستومانە هەوڵیشیداوە خۆی پارتێکی یەکگرتووی نێوان کوردو عەرەب بەناوی پارتی (جمهوریە)وە دابمەزرێنێت بەڵام نەیتوانیووە، چونکە وەك دەوترا سەردەمی(مدالشیوعی) بووەو خەڵکەکە خرۆشاون هەریەکە بەلایەکدا وهەریەکە سەربەبیرو رایەك بوون، لەوکاتانەدا باوکم تانیوەشەو لەم وتار پێشکەشکردنەوە بۆ ئەو وتارو لەم کۆڕەوە بۆ ئەوکۆڕو کۆنگرەو کۆبوونەوەیە رۆیشتووە تا بەیانیش سەری بەسەر نوسیندا شۆڕکردۆتەوەو چەندبەشێکی لەیاداشتەکانی تۆمارکردووە .

نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کەپاش تەمموز رەفیق حیلمی کرابە جێگری سەرەکیی یەکێتیی نووسەرانی عێراقو سەرۆکی سەندیکای ماموستایان کە ئەمانەش کارێکی هەروا کەم نەبوون.

تێبینی/ کۆمەڵە شیعری (پاش تەمموون)ی رەفیق حیلمی بە زمانی کوردییەو وەك لەو بەڵگەیەنامەیەشدا دەردەکەوێت دیارە نوسخەیەکی پێشکەش بە عەبدولکەریم قاسم کردووەو ئەویش لەرێی سکرتێرەکەیەوە بەم نامە رەسمییە سوپاسی دەکات، هەرئەم بەڵگەنامەیەش دەریدەخات خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان بەهەڵەدا چووە کەنوسیوویەتی ئەم کتێبە د.پاکیزە پاش کۆچی دوایی باوکی بەچاپی گەیاندووە.

الرقم ٢٧/ ٢١٦
تاريخ ١٩٦٠/٣/١٧

بغداد

الأخ رفيق حلمي
وزارة المعـــــارف

تحية طيبـــــــة :

يسرني ان انقل اليكم شكر سيادة الزعيم عبد الكريم قاسم رئيس الوزراء على هديتكم نسخة من المجموعة الشعرية (( پاشرتموز )) الذى نظمتموهــا وان اعرب لكم عن تقديره لجهودكم في حقل الثقافة الكردية •

انتهز هذه الفرصة لاقدم لكم نسخة فريدة من تصوير سيادة زعيمنــا المفدى مذيلة بتوقيعه ، واقبلوا شكرى واحـــــترامى •

الرئيس
سعيد الدورى
ع• سكرتير رئيــــس الوزراء
لشؤون الصحافة

# جەمیلەخانی هاوسەری رەفیق حیلمی

دایکم ژنێکی ئێجگار لەسەر خۆوبێدەنگ و سەنگین وکەم دوو بوو زۆر دینداریش بوو، بەتەمموز بەقرچەی گەرما رۆژوی نەدەشکان ونوێژی دەکرد وخێروخێراتی دەکردو یارمەتی هەژارانیدەدا خەسویەکی بێهاوتا بوو، زاواکانمان ئێجگار خۆشیاندەویست و خزمەتیان دەکرد، چونکە هەرگیز پشتی نەدەدان لەزەوی‌و ئەگەر شتێك بوایە دەیوت کچەکەی خۆم و منداڵەکانی دەکەم بەقوربانتان بۆیە ئەمانە زۆریان خۆشدەویست و ئەویش زۆری خۆشدەویستن، جیاوازی نەدەکردن لەگەڵ براکانمان. هیچ خۆی هەڵنەدەقورتاندە کاروبارو حاڵ‌وئەحواڵی کچەکانی ، هەروەها بووکەکانی‌و هەرچی شوییکردایە یان ژنی بهێنایە دەچووە ماڵی خۆی‌و سەربەستانە دەژیا ئەو دەستی پێوەنەدەگرتن. بەڵام هەمیشە ئەوان لە بۆنەکاندا دەهاتن بۆلای هەندێجار بەشەویش دەمانەوە. کاتێ نەخۆش دەبوو دەوریان دەداو ئێشکیاندەگرت بەدیارییەوە. بوك‌و زاواکانی وەك منداڵەکانی خۆی وابوون، دیاربوو لەخەسویەوە زۆر وانەی وەرگرتبوو، ئەویش وابوو بۆ دایکم کە بووکی بوو، لەگەڵ پوریشمان چەند ساڵ ژیاوە وەك خوشکی بێت وابووەو تەمەنیان نزیك بووە لەیەکەوە هەندێجار کە زوویربوونێك روویدەدا دەیوت بەخوا لەئێوەم زیاتر خۆشدەوێت، هەستن دەستی ماچ بکەن و ئاشتی‌بکەنەوە . ئەویش خێرا لێمان خۆشدەبوو هێندە دڵی ساف‌و خاوێن بوو، هێندەی خۆشدەویستین، ئێمەیش ئەگەر لەدایکمان زیاترنەبووبێ لەو کەمترمان خۆشنەویستووە و پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو زیاتربوو وەك لەدایکمان چونکە زیاتر ئاگای لە هەمووژیانمان بوو، هەموو پێویستیمان، هەستمان‌و نهێنیمان، خوێندنمان، دڵتەنگیمان، نەخۆشیمان. من دەمەوێت لەرێگەی ئەم قسانەوە ئەو راستییە روونبکەمەوە کەئەگەر باوکم خێزانەکەی وانەبووایەو لەگەڵ خوشکەکەشی وانەبوونایە ئەوا رەفیق حیلمی هێندەی سەریقاڵی چارەسەرکردنی کێشەی ناوماڵەکەی دەبوو، هێندە بوارو دەرفەتی نەدەبوو بۆ خەباتی نەتەوایەتیی. ئەگەر ئەم خێزانەش بەمجۆرە نەبووایە چۆن بەرگەی دووریی رەفیق حیلمی‌و کێشەکانی رۆژگاریان دەگرت ؟

ئەم باسە ئیتر درێژەی ناوێت، بەڵام پێویستە ئاماژە بۆ ئەو خۆشەویستییە گەورەیە بکەین کەلەنێوانی باوکمو دایکم دا هەبوو تەنانەت لەکاتی نەخۆشییەکەیدا سەری لەسەر ڕانی دایکم دانابوو ئەگەرچی بێهۆشبوو بەڵام دایکم بەچرپە لەگەڵی دەدوا لەو دیمەنەدا لەدوو کۆتر دەچوون کەلەترسی لەیەك جیابوونەوە سەریان نابێت بەسەری یەکترەوە.

## دایکمو باوکم ئێمەیان بەجێهێشت و چوون بۆ تورکیا

دایکم لەئەستەمبووڵ عەبای فڕێدابوو، کەهاتەوە ئیتر نەیدایەوە بەسەریدا وەکو ژنە ئەوروپاییەکان دەستکێشی لەدەستدەکرد و قاتی مۆدەی لەبەردەکرد، بەتایبەتی چونکە لەگەڵ باوکم دەچوو بۆ دیداری دیبلۆماسیو بینینی پیاوی بیانی، لەو شوێنانەیش دەستی ژنان ماچ دەکرا وعەبا لەوجێگانەدا بێ سوودبوو. باوکم لە سەرەتایشدا پێیخۆشنەبوو کەئێمەیش عەبابدەین بەسەرماندا کاتێ کە لە سلێمانی بووین بەڵام لە مانگی هاویندا کە دەچوم بۆ بەعقوبە لەوێ زۆر توندڕەوبوون بۆیە عەبام دەدا بەسەردا.باوکم دەیوت من نامەوێ بەعەبا خۆتان داپۆشن واباشترە بەڕەوشتی جوان خۆتان بپارێزن، ئەو نەزۆر توندڕەوبوو وەك لەنامەیەکیدا وتویەتیو نەوازی لەتەقالیدی ئیسلامیش هێنابوو. بەپێچەوانەوە زۆر پارێزگاریی لە دابو نەریت دەکرد. وەك وتم دایکم ژنێکی خانومانی بەئارامی، بێدەنگ بوو بەڵام وریاو بیرەوەری بەهێز وخۆی بەجەرگ بوو. زۆر خەمی لەدووریمان دەخواردو ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەژیانی ڕەفیق حیلمیدا ، ئەو نەبوایە هیچ ژنێکیتر نەیدەتوانی لەگەڵ باوکمدا ئەو ژیانە سەختە بژی بەو جۆرەی کەباسمانکرد هەر شەش حەوت مانگ جارێك لە شارێك بوون، هەمیشە لەترسدا ژیاونو زۆربەی کاتیش دەستکورت بوون، گەڵێ جاریش دایکم بەتەنیا ڕووبەرووی کارەساتو کێشەکانی ژیان بۆتەوەو نەیهێشتووە ئێمەش بێ باوکیمان پێوە دیاربێت.

## چالاكییەكانی رەفیق حیلمی لەكاری میریدا

گـەلێك چـالاكیی هـەبوو لـەگۆڕەپانی سیاسـیی و خۆبەختكردنـدا بـۆ نیشـتمان و نەتەوەكەی، وەك بەشداریكردنی لەكاروباری شێخی نەمردا بە وەرگێڕانی گفتوگۆی شێخ لەگەڵ كاربەدەستانی ئینگلیزدا كاتێ كەنوێنەری تایبەتی و نهێنی پـارێزو راوێژكاریشی بوو. هـەروەها دامەزرانـدنی قوتابخانـە و دامەزرانـد كۆمەڵـەی سیاسـیی بەفەرمانی ئـەو، وێـڕای بـەڕێوەبردنی رۆژنامـەكانی سـەردەمی شـێخ و نوسـین و بلاوكردنـەوەی شـیعرو بابەت و وتار لەرۆژنامەكانـدا چالاكیشـی هـەبوو لـە كۆڕەپـانی كـارە میرییەكەیدا. بڕواننـە ئـەو هــەموو هەوڵــە بــۆ پێشخســتنی خوێنــدەواریی بەنوســین و بــە ئامۆژگــاریی، بەدامەزرانـدنی قوتابخانـە و بـەڕێوەبردنی بەچاكترین شـێوە وبەئامۆژگاری بـۆ قوتابیـان و مامۆسـتایان بڕوانــە ئامۆژگارییــەكانی بــۆ مامۆســتایان لــە دەفتــەری پشــكنینی قوتابخانەكاندا كاتێ پشكنەر بووە، بڕواننە كارەكانی كاتێ (بەڕێوەبەری پەروەردە) بووە هەروەها بڕواننە ئەو وێنانـەی كـە لـە خۆنواندنی قوتابخانەكانـدا گیراون بـزانن ئەوانـەی بینیویانـە چـۆن باسـی دەكـەن ،چیكردووە تـا كارەكـەی بـەجوانترین شـێوە دەربچـێت، تەنانــەت لەســەر ئــەركی خــۆی لــەماڵی خۆیـدا خـواردنی زۆر نایـابی دروسـتكردووە بۆسەرجەم میوانەكانیش هەرچەند خۆم لەبەرئەوەی لەدەرەوە دەمخوێند ئەو نمایشـانەم نـەبینیووە . یەكـەم سـاڵ كـە لـەلوبنان بـووم بـۆ هـاوین گەڕامـەوە بـۆ لایـان بـۆ بەعقوبـە كەگەیشتمە بەغدا دڵم خۆشبوو بـاوكم و دایكم و هـەمووان دەبینم كـاتێ دێـن بەپیرمـەوە بەتایبەتی كەساڵێك بوو دووربووم لێیانەوە و پاش ئەو كارەساتەی كەبەسـەرماندا هات ڕۆیشـتبووم و تووشـی گـەلێك كێشـەی تەندروسـتی بووبـووم لـەلوبنان .لەهـەموو ئەمانـە ناخۆشتر ئەوەبوو پاش ئەو هەموو شـتە دەرنەچم بـاوكم نـاچار بێـت پـارەی كەفالەتەكـەم بۆ بدات بەڵام بەهاندانی باوكم و بەخـەباتی بێوچـانی خـۆم دەرچـووم و دەمزانـی ئـەوە دڵـی باوكم شاد دەكات، كەچی كە گەیشـتم چـاوم گێڕا هـیچ كەسـێ دیارنـەبوو،وتم ئـاخۆ چـی قەوماوە؟ لـەپڕ پۆلیسێك هاتـە پێشـەوە ، وتـی تـۆ ناهیـدەیت؟ وتم بـەڵێ چـی ڕوویداوە؟ وتــی مەترســە باوكــت داوای لێكــردووم بتبــەم بــۆ مــاڵی كەســێك لێــرە تاپشــوبدەیت ئینجابتبەم بۆ بەعقوبە، چونكە باوكت سەرقاڵی نمایشی گشتیی قوتابخانـەكان و بڕیارە

مەلیك و وەصی بچن بۆ بینینی بۆیە باوکت نەیتوانی بێت بەپیرتەوە،ماڵەوەشتان خواردەمەنی بۆ میوانەکان ئامادە دەکەن.

بێجگە لەم چالاکییانە زۆر چالاکیی تریشی هەبووە لەچوارچێوەی کارە میرییەکەیدا.ساڵی ۱۹۵۰-۱۹۵۲ من لەئەمریکابووم لەپڕ رۆژێك هاورێیەکم کە وەختی خۆی لەبەیروت لەگەڵم بووتازە لەعیراقەوە گەڕابووەوە نامەیەکی بۆ ناردم تیایدا نووسیبووی چووم بۆ بەعقوبە بۆ سەردانی ماڵی باوکت بەڵام وتیان لەوێ نەماون نەمزانی لەکوێن؟ بەم هەواڵە زۆر نارەحەت بووم بەخۆمم دەوت ئاخر (بەرێوەبەری بەرێوەبەرایێتی پەروەردە)و پیاوێکی وەکو باوکم بەناوبانگو ناسراو چۆن دەبێت خەڵکی نەزانن بەماڵو خێزانەوە بۆ کوێ چوون؟ ئینجا بیری لێبکەنەوەو بزانن حاڵی من چۆن بووە، نەمدەزانی نامە بۆ کێ بنووسم تاهەواڵیانم بۆبنێرێت، پاش پرسیار و هەوڵدان زانیم لە بەغدان، بەڵام تاگەڕاشمەوە عێراق نەمزانی ئەمە چۆن بووە.

بەکورتی وتیان: گوایە دوو مامۆستا لەبەعقوبە بێپرسی ئەو گواستراونەتەوە بۆ سەر سنور واتە دوورخراونەتەوە ، رەفیق حیلمی کە ئەمەی بیستووە زۆری پێناخۆشبووە چونکە بەبێ لێکۆڵینەوە لەراستیی ئەو رووداوەی بەهۆیەوە دوورخراونەتەوە کارەکە ئەنجامدراوەو ئەم کەبەرپرسی بەرێوبەرێتییەکەبووە پرسی پێنەکراوە بۆیە هەوڵیداوە راستیودرۆ دەربخرێتو بە رەسمیی بگەڕێنرێنەوە سەر کارەکانیان بەڵام سوودی نەبووە، دیارە تووڕە بووەو نارەزایی دەربڕیووە کەلەسەر ئەوە خۆیشی لابراوە لە بەرێوەبەرێتی (مەعاریف). هیچ ئیشوکاری تری نەدراوەتێ، هاتۆتەوە بەغداو لەوێ لەئامادەیی قوتابخانەی (تفیضیءا ھلی) وانەی وتۆتەوە هەربۆیە لە نامەیەکیدا بۆ من نووسیویەتی ( من ئێوە نەبوونایە شتێکی تر دەبوم) ، واتە لەبەر ئێمە نەبووایە ئەم کارەیشی لەبەغدا قبوڵ نەدەکرد. پشتی زۆر قوتابی و مامۆستاو فەرمانبەری گرتووە و هەوڵی بۆداون و کاری بۆ جێبەجێکردون، لەهەموو ئەمانەیش گرنگتر ئەوەیە کە لەتەنگانەدا پشتی بەرنەدەدانو هاورێیەتییەکانی دڵسۆزانەو تا سەربوون.

## قۆناغی یەکەم

## لاوێتی و شیعری دڵداری ...

وەك لەیاداشتەکانیدا نووسراوە باوکم ژیانی ئەدەبیی بە شیعر دەستپێکردووەو هەربە شیعریش کۆتایی پێ هێناوە.

لە سەرەتاوە وەك خۆی لە دیوانی (پاش تەمموز )ی دا کە پێش کۆچی دوایی لە چاپی داوە ، نووسیویەتی: لە پانزە ساڵییەوە [*] دەستم کردووە بە دانانی شیعر. بەڵام شیعری دڵداری وغەزەلی نووسیوە ئەویش بەزمانی تورکی. بابزانین بۆچی بەشیعری دڵداری دەستی پێکردووە ؟ خۆی وتویەتی : چونکە ئەو کاتە هێشتا هەستی نەکردووە بە رووداوەکانی دەوروبەر لە گۆڕەپانی سیاسیداو ئەو کاتە هێشتا قوتابی ناوەندیی بووە. لە بەرگی حەوتەمی یاداشتەکانیدا باسی چوونە ئەنقەرەی بە نوێنەرایەتی شێخ مەحمود بۆ کێشەی مافی کورد کردووەو وتویەتی : هاوڕێیەکی ئەو سەردەمەی بینیوەتەوە ناوی (خلوصی)بووەو پێکەوە شیعری تورکییان داناوەو ناردوویانە بۆ رۆژنامەی (حوادث) و گۆڤاری (کەوکەبی شەرق) لە کەرکوك ،هەروەها وتویەتی ئەو شیعرانە بە تورکی بوون چونکە ئەو کاتە هەر ئەو رۆژنامەیە هەبووەو ئەویش بە تورکی بووەو لە کەرکوك دەرچووە ،نەك ئەم بەڵکو هەموو هەر بە تورکی نووسیویانە چونکە خوێندن لەتورکیابووەو ئەوانەیشی گەڕاونەتەوە بەو زمانە نووسیویانەو زمانی کوردیی و رۆژنامەگەریی کوردیی لەو شارەداو لەو قۆناغە سیاسییەدا نەبووەو رێگەی پێنەدراوە ، ئەو هەڵبەستانەیش کە باوکم و هاوڕێکانی لەو بڵاوکراوانەدا بڵاویاندەکردنەوە (لاسایی کردنەوە)ی ئەوانەبوو کە لەرۆژنامە تورکییەکاندا دەیانخوێندەوە ، مامۆستا مستەفا نەریمان زۆر بەوردیی و زانستیانە بیبلۆگرافیایەکی باشی بۆ سەرجەم ئەو شیعرانەی باوکم دروستکردووە کە لە (حوادث)دا بڵاویکردونەتەوە، بەڵام وتوشییەتی ئەوانە هەرشیعرەکانی ئەو ژمارانە بوون کە دەستی کەوتوون. ئەمەیشی لە کۆڕێکدا لەساڵی (١٩٨٥) وتووە کە لە سلێمانی بە بۆنەی تێپەڕبوونی (٢٥) ساڵ بەسەر کۆچی دوایی رەفیق حیلمیدا بەڕێوەچووە.

---

[*] لۆرد ئیریك لە پەرلەمانی بەریتانی لە پەسەند کردنی یاداشتەکانی رەفیق حیلمیدا بە ئینگلیزیو لەوەرگێڕانی ( د. ف. حیلمی ) نووسیویەتی رەفیق حیلمی هەر لە دە ساڵییەوە شیعری لاوانەوەی بۆ شێخ سەعید بە تورکی خوێندۆتەوە لە پێشوازی ( شێخ مەحمود) ی کوڕیدا .

## قۆناغی دووەم

## خەباتی وشیعری سیاسی

بە عەرەبی نووسراوە "كانت الفترة الثانية من حياة رفيق حليمي من اهم الفترات في النضال القومي الكردي " واتە دووەمین قۆناغی ژیانی رەفیق حیلمی لە گرنگترین قۆناغەكانی خەباتی نەتەوایەتی كورد بووە.

وەك باوكم خۆی لەیاداشتەكانیدا نووسیویەتی پاش رۆژنامەی (حوادث) ی سەردەمی عوسمانلی كە شیعری دڵداریی بەتوركی تیا بلاّوكردۆتەوە، رۆژنامەی (النجم) دەرچووەو دیسان بە توركی و لەكەركوك بووە ، ئەمەیان سەر بە ئینگلیزبووە و بەڕێوەبەرەكەی بەڕێوەبەری قوتابخانەی (ظفر) بووە لە كەركوك .رەفیق حیلمی-یش ئەو كاتە مامۆستا بووە لەوێ ، بۆیە كەوتۆتە بلاّوكردنەوەی شیعر لەو گۆڤارەشدا، بەلاّم ئەمجارە شیعری سیاسی و پەروەردەیی و بابەت و سەروتاریشی نوسیووە. ئەوەتا دەڵێ:" ئیتر نەمهێشتووە هیچ ژمارە یەكی النجم بەبێ سەروتار دەربچێت " ئەم رۆژنامەیە ئەگەرچی بە توركییبووە بەلاّم بۆ كوردبووە .(*) ئەم نووسینانەی باوكم لەو رۆژنامەیەدا ئینگلیزەكانی خستۆتە مەترسییەوە ،وەك خۆی لە كۆمەڵە شیعری (پاش تەمموز) ومامۆستا نەریمان باسیانكردووە شیعرە توركییە سیاسیەكانی رەفیق حیلمی توركەكان و ئینگلیزەكانی زۆر تووڕە كردووە (*) بڕوانە باسی چوونی رەفیق حیلمی بۆ لای ئۆزدەمیر لە رواندزو چۆن لەكاتی گفتوگۆو وتوویژ لە گەڵیدا تووڕەبووەو وتویەتی شیعرەكانتم خوێندۆتەوە دەزانم گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا سوودی نیە . بۆ شیعرەكانی سەردەمی ئینگلیز لە رۆژنامەی (النجم)دا دیسان بڕواننە ئەو دوو سەرچاوەیە . باوكم خۆی لە پاش تەمووزو لە یاداشتەكانیداو مامۆستا نەریمان لە باسەكانیدا ئەم

---

(*) بڕواننە رۆشنبیری نوێ ١٠٨سالّی (١٩٨٥) تۆماری تایبەتی بۆ لیستەو باسی شیعرەكانی رەفیق حیلمی لە رۆژنامەی (الحوادث و النجم)دا و وەرگێڕانی هێندێكیان لە توركییەوە بۆ كوردی . هەروەها لە (٣) رۆژنامەكەی شێخ مەحمودو دوودیوانی شیعری خۆی .

(*) بڕوانە ئەم سێ بەڵگەیە لەسەر لاپەڕە (١٢٧) بۆ سەرئەنجامی ئەو شیعرە سیاسیانەی رەفیق حیلمی و سەروتارەكانی لە (النجم)دا .

سەرگوزشـــتەیان گێڕاوەتـــەوە. لێپرسـراوی ڕۆژنامـەی (الـنجم) بـە بـاوکمی وتـووە :ئینگلیزەکـان زۆر تـووڕەن لـە شیعرەکانت، ئامـادەن چـی پاداشـتێ دەتـەوێت بتـدەنێ تەنانـەت بشـتکەن بـە لێپرسـراوی ڕۆژنامەکـە بـە مـەرجێك لەوڕێگەیـە لابدەیت . ڕەفیـق حیلمـی لێـی پرسـیوون:ئـەی ئەگـەر وانەکـەم؟ وتویانـە:زیـانێکی گـەورەت لیدەکـەوێت وتویەتی زیانی چۆن؟ وتویانە ڕەوانەتدەکەن بۆ هندستان، وتویەتی : باشتر، ئەوسا چی لە گەشتێکی هندستان بە بەلاش باشترە . ئیتر کابرا وازی لێ دەهێنێت چونکە دەزانێت سوودی نییـە ئەگـەر زیـاتری لەگەڵـدا بڵێـت، هـەر پـاش چـەند ڕۆژێـك ڕەفیـق حیلمـی دەگوێزنـەوە بـۆ قوتابخانـەی نموونـەیی سـەعادەت لـە سلێمانی [*] هتـد کەواتـە بـاوکم سـەرەتای ژیـانی سیاسیشـی بەشـیعر دەسـتی پێکردووە،بـۆ شـێوەو جۆروبابـەتی شیعرەکانی بڕواننە باسـەکەی مامۆستا مستەفا نـەریمان لـە ڕۆشنبیریی ژمـارە (١٠٨)ی ساڵی١٩٨٥ولە باسی شیعرو پەخشانەکانیدا.

زۆر هەوڵمـدا ئـەو دوو ڕۆژنامەیـە واتـە (حـوادث) و (الـنجم) بەتایبـەتی ئـەو ژمارانـەی ڕەفیـق حیلمـی تێیانـدا نووسـیویەتی پەیدایانبکـەم تەنانـەت چـووشمەلای پارێزەرێك لە کەرکوك وتیان هەموو ژمارەکانی هەیە پەیمانی پێدام بۆم بنێرێت بـەڵام بە داخەوە دەستم نەکەوت، مامۆستا مستەفا نەریمان دوو دانەی لە(النجم) پیشـاندام پێش کۆچی دوایـیو پەیمانیشـی دابوو خـۆی هـەموو بەرهەمـە تورکییـەکانی ڕەفیـق حیلمـی کۆبکاتـەوەو وەریشـیانبگێڕێتو بڵاویانبکاتـەوە بەداخـەوە مـەرگ مۆڵـەتی نـەدا،کاتێ ڕەفیق حیلمی دەگوێزرێتەوە بۆ ناسرییە [1*] ئینگلیزەکان لەسـەر ئەم شیعرانە دیوانی شیعریی (شیعر لەرم) ی کەبە زمانی تورکییە، دەیفەوتێنن .

لەسـەردەمی حوکمـدارێتی شـێخ مـەحمودی نـەمردا لـە سـلێمانی سـێ ڕۆژنامـە دەردەچـوون (بـانگی کوردسـتانو ڕۆژی کوردسـتانو ئومێـدی ئیسـتیقلال ) ئەمانـە بـە کوردی بوون .لـەم قۆناغـەدا بـاوکم بووەبـە سەرپەرشتیاری بەشـی فارسییو تورکیی لـە دوو ڕۆژنامەکـەی پێشـەوەدا و بـووە بـە لێپرسـراوی "ئومێـدی ئیسـتیقلال" بـە فـەرمانی

(*) بەڵگەی یەکەم گواستنەوەی بۆ سلێمانی
* بەڵگەی نەفیکردنی بۆ ناسرییە

شێخ مەحمود خۆی کە ئەو کاتە بە ناوی مەلیکی کوردستانەوە مۆریکردووە. بڕوانە یاداشتەکانی رەفیق حیلمی و چۆن خۆی بە درێژیی باسی ئەم سێ رۆژنامەیەی کردووە، کەی و چۆن و کێ دامەزرێنەریان بووە خۆی چی کردووە بۆ گەشەپێدان و مانەوەو بەردەوامبوونیان ؟ هەروەها بڕوانە بەشی رەفیق حیلمی و رۆژنامە نووسین لەم کتێبەدا .
لەم رۆژنامانەیشدا گەلێك شیعری بڵاوکردۆتەوە بەڵام ئەمجارەیان بە کوردیی، یەکەم شیعریشی بەناوی (بۆ کوردان)ەوە بووە لە رۆژنامەی بانگی کوردستاندا بڵاویکردۆتەوە، لێرەدا داوایکردووە بەرگی نەخوێندەواریی و نەزانین بدڕن و رووبکەنە خوێندن و قوتابخانە بکەنەوە، پیشەسازیی پێشبخەن، ئەمانە هۆی پێشکەوتنی شارستانیەتن و داوای شۆڕشی پیشەسازیی کردووە وەك شۆڕشەکەی فەرەنسا،چونکە ئەوە هۆی پێگەیشتنی گەل و بەرەو پێشەوە رۆیشتن و گەیشتنەوەیەتی بە گەلانی تری دنیا ...

## قۆناغی سێیەم

## سەردەمی شێخ مەحمودی نەمرو خەباتی نەتەوەیی

سەردەمی حوکمداریێتی یەکەمو دووەمی شێخی نەمرو پەیوەندیی رەفیق حیلمی بە شێخ مەحمودو کاربەدەستانی ئینگلیزەوە باسێکی دوورو درێژە،هەروەها لەگەڵ بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی وەزعی شێخدا ژیانی ئەمیش لە بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەدا بووە ، کاتێ شێخ پێویستی پێیبووە ئەم بەهەموو هێزو توانایەوە پشتگیریکردووەو یارمەتیداوە،ئەو کاتانەش لەئەوپەڕی جموجووڵ و چالاکییو هەوڵو تەقەلایدا بووە، لە لایەکەوە چی گفتوگۆ کراوە لەنێوان شێخ مەحمودو ئینگلیزەکاندا ئەم لە فەرەنسییەوە کردوونی بەکوردیو بۆ شێخی وەرگێڕاون بەپێچەوانەشەوە لە کوردییەوە گفتوگۆکانی کردووە بە فەرەنسی بۆ ئینگلیزەکان، هەروەها گفتوگۆی سەرەك عەشیرەت و خەڵکەکەی بۆ ئینگلیزەکان وەرگێڕاوەو بەشارو دێهاتەکاندا گەڕاوە، لەو لاشەوە بەفەرمانی شێخ وانەی کوردییو فارسیی بە هەندێك لە کاربەدەستە ئینگلیزەکان وتۆتەوە وەك میجەر نۆئێلو کاپتن بێڵ. کاتێکیش کەشێخ شکاوە رەفیق حیلمی خراوەتە بەندیخانەوە لەکۆیەو هەر بەتەمای رزگاربوون نەبووە، بڕوانە سەرگوزشتەی ئەم بەندیخانەیە کە لە یاداشتەکانیدا بە درێژیی باسی کردووە ! لەم کاتەدا تاقە براکەی لە تورکیا دەگەڕێتەوە ، هەر لە موسڵ پێی دەڵێن باوکیشیو دایکیشی کۆچی دواییانکردووە وکە دەچێتە سلێمانیش خوشکەکەی و دایکم دەبینێت پێی دەڵێن براکەی لە بەندیخانەیە لە کۆیە . زۆر لە خوشکەکەی دەپاڕێتەوە لەگەڵی بڕواتەوە بۆ ئەستەمبووڵ چونکە لەوێ (ضابط مدفعیة) دەبێت،ئەم قایل نابێت ئیتربە زوویریی دەڕوات بۆ کۆیە تا براکەی ببینێت لە بەندیخانە کەچی رێگەی نادەن بیبینێت، بە دڵشکاویی دەڕواتەوە بۆ تورکیاو دەنگوباسی نابێت ،رەفیق حیلمی کە لە بەندیخانە دەردەچێت دەڕوات بۆ سۆراغێکی لە تورکیا، چەند دەگەڕێت کەسوکار دڵیان نایەت پێی بڵێن کوژراوە. ئیتر بەغەمباریی دەگەڕێتەوە و هەرگیز لای کەسمان ناوی نەبردووەو ئەو پوورەشمان تا ما کەپێشیان وتبوو نەشماوە کەچی هەرچاو لە رێبوو. ئەمەیش یەکێك بوو لە ناسۆرەییە هەرە سەختەکانی ژیانی باوکم لەسەرو بەندی خەباتی نیشتمانیو نەتەوایدا.

## بەشی دووەم درێژەی قۆناغی سێیەم

## ژیانی سیاسی ڕەفیق حیلمی لەسەردەمی شێخ مەحمودی نەمردا

باوکم لە دەفتەرێکدا چەند لاپەڕەیەکی نووسیوە،بەناونیشانی

" دەستکردن بە نووسینەوەی ئەم (خاطراتە)" وا دیارە لە پێشدا بە تەمابووە (یاداشت)ەکانی بە ناوی (خاطرات)ەوە بنووسێتەوە لەو دەفتەرەدا دەڵێ " سلێمانی ١٩٤٦/٨/١٤ لە مودیری مەعاریفی لیوای بەسرەوە بە ئیجازەی مانگێك لە سلێمانیم" ئینجا بەم سەرەتایە دەستی پێکردووە:

### ١٣٣٠ ڕۆمیی کێ فێری کوردایەتی کردم ؟

پاش ئەمە بەسەرەتایەکی تر ئەم پرسیارەی داناوە :

### من چی بووم ؟

بەداخەوە وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆی نەداوەتەوە ، بۆچی نازانین خۆزگە ئەو وەڵامەی دادەیەوە .سەبارەت بەوەڵامی کێ فێری کوردایەتی کردم خۆزگە ڕەفیق حیلمی ئەمەی دەکرد بە پێشەکی بۆ یاداشتەکانی، وەك دیاریشە بۆ خۆیشی سەرەتا وای ویستووە بۆیە ئەمەی ڕاستەوخۆ لەدێڕی یەکەمدا داناوە ،پاش ئەوەی دەڵێ دەستکردنم بە نووسینەوەی ئەم (خاطراتە ) وا منیش بەمە دەستدەکەم بە باسی یاداشتەکانی و سەردەمی شێخ و خەباتی سیاسی ئەو قۆناغ و سەردەمە .

### کێ فێری کوردایەتی کردم ؟

" کەریمی حاجی ئەوڵا -کەرکووکی زادە کەریم بەگی حاکمی منفرد )[*] تازە لە ئەستەمبول هاتبۆوە. من لە ئەعدادی دەرچووبووم لە(١٣٣٠) ڕۆمی و دەمویست بچمە ئەستەمبوڵ بۆ خوێندن . کاغەزێکی بۆ نووسیم لای نەجمەدین حسێن برای

---

[*] ئەم کەریم بەگە برای ئەحمەد ئاغا کەرکوکی زادەی خزمی ڕەفیق حیلمییە، ڕەفیق حیلمی زۆر لە یاداشتەکانیدا باسی ئەحمەد ئاغا بە تایبەتی و ئەم برایەی کردووە . چونکە ئەحمەد ئاغا کاتی تەنگانە دەستی ڕەفیق حیلمی گرتووەو دەربازیکردووە کاتێ ویستوویانە سەردەمی میجەرسۆن بەندیبکەن .

عەبدولخالق(ئەسیریی) کە یەکێکە لە شاعیرە کوردەکانی کەرکوك نەجمەدینم لە کەرکوك ناسی ، فەقێ بوو لای شێخ حسێنی باوکی ، بە تۆراوی چوو بۆ ئەستەمبوڵ لە شوعبەی ئیلاهیاتی دار الفنون دوای ئەوە لە قیسمی حقوق خوێندی . بەینێك لە ئەستەمبووڵ ( معلمی ) کرد ، ئەم کوردە وەتەنپەروەرە زۆر خزمەتی کردمو فکری کوردایەتیو خزمەتی کوردی خستە مێشکمەوە . دوای ئەوە لە گەڵ قوتابیانی کورد بووم بە ئاشنا ، تێکەڵ بە کۆمەڵەی (هێڤی) بووم . جارێکیش بە ئیشێکی کۆمەڵە چوومە حەلەب [*] ئەم ئیشە هەرچەند بۆ قوتابییەکی بێ تەجروبەی وەکو من زۆر خەتەر بوو ، بەڵام بەبێ ترس بەجێم هێنا ".

خوالێخۆشبوو جەمال عیرفان لە حەلەب بوو و شاکر مجرمی ملازمی ئیحتیاط و مەحمود فائزی بێکباشی برای شاکر مجرم و چەند ضابطیکی تری کورد لە حەلەب بوون. مەلا عارف،عارفە سووری رئیس ئەول متقاعد ئەوساکە لەوێ وەکو ضابط ئەیخوێند . تەنیا لە شاکر مجرم دا رۆحی کوردایەتیم بینی . جەمال عیرفان هەمشەرێکی باشی کورد، بەڵام ضابطیکی موخلیسی تورك بوو . باسی کوردایەتیو کورد پەروەریی بە وریا بوونو تەعەجوبەوە لە من دەبیستو پێی ناخۆش بوو . ئەو ضابطە ناسراوو زیرەکە نەك بە عەیبی بزانێ بەڵکو بەفەخرەوە دەرسی وەتەنیەتی لێ ئەبیستم [*] و تەقدیری ئەکردم .

لە رووی ئیحتیاطەوە بێ مشاوەرەو پرسی ئەوان چوومە مەکتەبی کچووك ضابطانو چوومە خێوەتەکانی عەسکەری کوردو لە بەینی ئەستەمبووڵو حەلەب دا ئەو جێگایانەی عەسکەریان تیدابوو پشکنیمن[*].چوومە خێوەتەکانیو لەگەڵ کوردەکان دانیشتم، چیم پێ سپێردرابوو تێمگەیاندن . رۆحێکی ترم کردن بە بەراداو گەڕامەوە .

---

[*] ئەم باسەم بە هەمان نووسینی رەفیق حیلمی گوێزاوەتەوە بەڵام بە ڕێنووسی ئێستا .

[*] شاکر مجرم : رەفیق حیلمی (باوکم) کاتێ منو دایکمی برد لەگەڵ خۆی بۆ ناوچەی رەواندز و یاداشتەکانی لەو جێگانەدا دەنووسیەوە کە پیایانا رۆیشتبوو بردینی بۆ ماڵی شاکر مجرمیش لە رەواندز . نەمانزانی بەم بیرەوەریەوە بوو .

[*] بە پێی مێژووی خوێندنی رەفیق حیلمی لە ئەستەمووڵ ئەو کاتەی ئاوا چووە بۆ حەڵەبو یەم ئیشە خەتەرەو وانەی وەتەنێتی بەمانە وتووەو گەڕاوە تەمەنی ئەوپەڕی (١٤) ساڵبووە ئینجا بزانە لە کەیەکەوە خەباتی رامیاری دەس پێ کردووەو چۆنو بەئازایی.

ئینجا بزانن ئەمە کاتێ روویداوە کە قوتابی بووە لە ئەستەمبووڵو تەمەنی هێشتا نەبۆتە (١٤)ساڵ لە کاتێکدا حکومەتی تورکیا ئەوە بووە کەهەموومان دەیناسین.

## ١٣٢٩ی رۆمی

هەر لەو دووسێ لاپەڕەیەدا رەفیق حیلمی ڕووداوێکی گێڕاوەتەوە کە پەیوەندی هەیە بە هەستی نیشتمانپەروەریی‌و چۆنێتی پەیدا بوونی ئەو هەستەوە لەلای . بۆیە لێرەدا وەك خۆی دەنووسینەوە :

بەم ناونیشانە (١٣٢٩ی رومی) نووسیویەتی : یەکەمی پۆلی دوایەمین (صنفی منتهی) اعدادی عەسکەریی بووم لەبەغدا (*١)(نظیف الشاوی)(* ٢)بە روتبەی (قول اغاسی) واتا (رئیسی اولی ئێستا) معلمی قۆزمۆغرافیامان بوو رۆژێك لە دەرسێکدا سەری لێتێکچوو مەسئەلەیەکی بۆ حەل نەکرا . کە روانیم زۆری لە گەڵ خەریك ئەبێ و ماندوو بووە، بەدزیەوە پەنجەم هەڵبڕی ئەویش بەوەستایی منی هەستاندو حەلم کرد .بەڵام لە جیاتی تەقدیر وتی: لە ڕێیەکی دوورو درێژەوە بۆی چووی. تۆ خەڵکی کوێی ؟ کە زانی خەڵکی سلێمانیم‌و کوردم ، وتی : ( لە کوردیان پرسی کامەتا گوێت ؟ دەستی راستی لە ملیەوە برد بۆ گوێی چەپی) لەگەڵ ئەم قسەیە تطبیقاتە کەیشی بۆ کردم ، قوتابییەکان پێکەنین . من تا بنا گوێم سوور بووەوەو بەرامبەر بە مامۆستایەك بەبێ نەزاکەتی ئەژمێرم . ئەگینا ئەو وەرامەی ئەوساکە دامەوە، لێرەدا ئەم نووسی لەوەوە لێم بوو بە دوژمن‌و هەڕەشەی لێ کردم بەڵام دوای ئەوە زۆری پێ‌نەچوو لە مەکتەب نەقڵکرا . لە پشووی هاویندا کە چوومەوە لای باوکم لە کەرکووك ، زانیم ئەم (ماجەرایە) بۆتە هۆی ناسیاوی‌و دۆستایەتی (نظیف بەگ) و باوکم ، لەوێ ئاشت بووینەوەو دەستم ماچ کرد بەڵام هەر ئەو ئیهانەیەشی لە مندا بوو بە سەبەبی پەیدا بوونی رۆحێك کە (نەجمەدین) لە ئەستەمبووڵ زیندوویکردەوە . لەوهۆکانی تر کە رەفیق حیلمی یان هانداوە بۆ خەباتی سیاسی وەك خۆی نوسیوویەتی ئەمانەن :-

١-مامۆستا زێوەر، گەلێك نووسەرو رەفیق حیلمی خۆشی دەربارەی زێوەر نووسیویەتی‌و سەبارەت بە زێوەر وتویەتی: کاتێ بۆ یەکەمجار کەوتۆتە نووسینی شیعر بەکوردیی، یەکێك لەوانەی ناردووە بۆ مامۆستا زێوەر کە مامۆستای سەرەتایی بووە ،

ئەو شیعرە هێشتا غەزەلی بووە . مامۆستا زێوەر بەهەمان کێش و قافیەی شیعرەکەی رەفیق حیلمی نووسیویەتی ...

ئەی رەفیق حیلمی شیرین مەقال

شیعرەکەت هاتە بەردەمم وەك ئاوی زولاڵ

من ئومێدی گەورە گەورەم پێتە بۆ ئەم میللەتە

حەیفە صەرفی جوهدی خۆتکەیت بە باسی خەت و خاڵ

رەفیق حیلمی دەڵێ ئیتر لەو رۆژەوە شیعری غەزەلم دانەناوە مەگەر بە دەگمەن کەنووسیویشمە بۆ بلاوکردنەوەم نەبووە. بۆ ئەم شیعرەو باسەکەی بڕواننە کتێبی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیی (١) لە باسی مامۆستاو شاعیر زێوەردا .

٢-مامۆستای ئەو حوجرەیەی رەفیق حیلمی لە کەرکووك لێی خوێندووە(مەلا تەقی) بووە باوم دەربارەی مەلا تەقی نووسیویەتی کەدە ساڵ بووە ئەم مەلایە (مرثیە یەك)لاواندنەوەیەکی دوورو درێژی بە تورکی فێرکردووە بە بۆنەی کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودەوە. باوکم دەڵێ پێش پێشکەشکردنی بە شێخ مەحموودو ئەوانەی لەگەڵی لە موسڵەوە گەڕابوونەوە بۆ کەرکووك و سلێمانی، بۆ هەزاران کەسی خوێندۆتەوە . لۆرد ئێریکی بەریتانیی باسی ئەمەی کردووە لە پەسەندەکەیدا بۆ وەرگێڕانی کتێبی یاداشتی رەفیق حیلمی بۆ ئینگلیزیی لە لایەن (دوکتۆر .ف. رەفیق حیلمی)یەوە کە دەریدەخات لە (١٠) ساڵی‌یەوە شیعری خوێندۆتەوەو داناوە واتە هەر لە منداڵییەوە چۆتە گۆڕەپانی سیاسیی و خەباتی نەتەوایەتییەوەو دەستی داوەتە قەڵەم‌ونووسین.

## ناشنابوونی بەشێخ مەحمودی نەمر

باوکم لە چەند لاپەڕەیەکدا بەدەستوخەتی خۆی کەوابزانم بۆ سەرەتای یاداشتەکانی داناوەو لە چاپینەداوە باسی ئەم یەکترناسینەی خۆیو شێخی نەمری کردووە و وتوویەتی :-

"معارەفەم لەگەڵ شێخ مەحمود" بالطبع لە وشەی معارەفە مەبەستی ئیعتیادی نەبووە ، چونکە ئەم وشەیە هۆیەکی تەواو نیە بۆ ناسینی کەسێتیو ماهێتی راستی مرۆیەك. بەتایبەتی ئەو مرۆیە ئەگەر پاڵەوانی وسائل حوادسی هۆو رووداوی گرنگو نهێنی بێت ، هەرچۆنێك بێت لە ناسینی کەسێتی شێخ مەحمود-ەوە معارەفەم دەست پێ ئەکات . بە یەك دوو وشەی کورت ئەم معارەفەیە باس ئەکەم "ئەم زاتەم لە زەمانی حکومەتی عوسمانیدا دوور بەدوور ئەناسی . جارێکیش لە سلێمانی لە دائرەی بانقی زراعەت مصارفی بووم من معاونی مەئموری بانك بووم . شێخ مەحمود بە ئیشی خۆی هاتە دائیرەکە، کە مەئموری زیراعەت منی تەقدیم کرد. ئیزهاری سرور و بە قصەی خۆی گوایا لەبەر موعامەلەی پیاوانە و حمایەتکارانەی لە بانە دەرحەق بە خۆمان و یا موتەعەلیقاتی شێخ مەحمود کردویەتی ، تەشەکوراتو مەمنونییەتێکی عوزمای دەرحەق باوکم ئیزهار کرد [*]. لە پاش ئەم معارەفەیە وا دەزانم یەك دوو جارێك مەرحەبای سەرە رێگەمان بووە . فقط شێخ مەحمود لە موخەیەلەی گەنجییو منداڵیی مندا قەهرەمانی شەڕی هەمەوەندو جافو ئەخیرەن لە حەربی عموومیدا موقابیل بە رووسەکان مودافیعی غەیوورو بە حەمەتی سلێمانی بووە . ئەوی لەو تاریخەدا لە سلێمانی بووە ئەحواڵی سلێمانیو هات هاتی رووس ، ترسو هەراسانی ئەهالیو وەزعییەتی حکومەتی عەسکەرییو کۆچو باری ماڵو منداڵ بۆ دێهاتی ئەترافو وەلحاصل ئیلتیحاقی شێخ مەحمودو عەشائری کوردی بە عەسکەری تورکەوە لەبیرە. زۆری پێنەچوو غائیلەی رووس زائیل بوو شێخ مەحمود شەوێك فجأة لە طرف ئالأی قوماندانی تورکەوە لە

---

*ئەمە لەو جارە دەگمەنانەیە کە رەفیق حیلمی باسی باوکیو کەسانی تری کردووە.

تێبینی/ تکایە بزانن لێرەدا بە هەمان نووسینی ئەو سەردەمەی رەفیق حیلمی باسەکە نووسراوەتەوە.

سلێمانی تەوقیف و تحت المحافظە رەوانەی کەرکوك کرا . قحط، گرانی ، نەخۆشی ،ئاساری تەخریبکاری حەرب وەکو ئەکسەری جێگایانی تری سلێمانیشی رۆژ بە رۆژ دەرەجەیەك زیاتر دەتواندەوە .( حومای مەزرەعی) یا تیفۆئیدی یەك لەسەر یەك پێنج شەش کەرەت زۆرانی مردنی لەگەڵ گرتم . نتیجەی شێخ مەحمودم لە پاش تخلیەی و چابوونەوەی خۆم پێ زانی . ئەوەندەم لە بیرە کە لە دەوری نەقاهەمدا بووم رۆژێك وتیان کە فائقی مودیری تاپۆی منطقە ی حاڵیی بەغدا گیراوەو لەپاش دارکارییەکی زۆر سەوقی کەرکوك کراوە. حتی دەیانگوت ئیحتیمالی ژیانی نەماوە، فایەق بەگ ئەو وەختە لە مەحکەمەی سلێمانی عزویەك رەفیقی صەمیمی ویەگانەی من بوو . کە ئەمەم بیست دەستم کرد بە گریان ئەوی قصەکەی بۆ گێرامەوە پەشیمان بۆوەو دایکم مەسئەلەکەی (تکذیب) کردو ئەویش تأییدی دایکمی کرد.

مەگەر ئەم رووداوە خاتیمەی مەزاڵمی ئیش بە دەستەکانی تورك بوو بێت..
عەلی ئیحسان پاشا، خەلیل پاشای قوماندانی ئۆردووی شەشەمی استخلاف کرد . شێخ مەحمودی تەخلیەو دەعوەتی موسڵو بە نەزەر مەسموعاتەوە لە پاش تەلتیف و خەڵاتێکی گەورە بە ناوی رەئیس قوای می للییەوە بۆ تەشکیلاتی خاصە ئیعادەی سلێمانی کردووە. پاش مودەتێکی زۆر کەم قوای ئیحتیلالیەی ئینگلیز لە دەورو پشتی کەرکوك یەك دوو جارێك لە گەڵ ئۆردووی تورك موصادەمە و لە پاش مەدو جەزرێکی حەربی بە تەواوی لە کەرکوك جێگیر بوون لەم کاتەدا شائیعەیەك پەیدا دەبێت واتە عیزەتی تۆپچی ئەو کاتە لە ئۆردووی تورك یوزباشی تۆپچی و فائق کە باسکراوە لە پێشەوە لە لایەن شێخ مەحمود-ەوە بۆ " جەلبی دەعوەتی ئینگلیز بۆ سلێمانی رەوانەی کفریی کراون "

"ئینجا موعارەفەی حەقیقەتی من لە گەڵ شێخ مەحمود لە پاش ئەم حادیسەیە بە مودەتێکی زۆر کەم دەست پێ ئەکا . لەبەر ئەوە لە ئیعتباری ئەم حادیسەیەوە تەحلیلی شەخسیەتی شێخ مەحمود لە فائدە خاڵی نابینم ، چونکە لە کوردستانی جنوبدا (یەعنی کوردستانێك کە بە موقتەزای سیاسەتی حازیرە لە گەڵ عیراق موندەمیج بووە ) نفوزی عوزمای شێخ مەحمود لەم تاریخەوە دەستپێدەکا و دیسانەوە لەم

**تاریخەوە کە موقەدەراتی کوردی بەستەزمان بووە بە یازیچەی ئەم زەعیمە، زەعیمێك کە لە ظروف دروس و لەمەصائیب تەعلیمی کردووە .[*]**

---

[*] ئەم باسە بەشێکە لە ئەو ( ٣٠ لاپەڕەیە) کە ئەمەمان لێوەرگرتووە بەشەکانی تری دەخەینە دواوە چونکە بە پێی مێژوو پاش سەردەمی حوکمدارێتی یەکەمو دووەمی شێخ مەحمودەو کاتێ شێخ لە ناصریە نەفی کراوەو رەفیق حیلمیش پاش بەندکردنی بەهۆی شەشی ئەیلولی رەشەوە لە ١٩٢٩دا نەفی دەکرێت بۆ ئەوێ و ١٩٣٠ شێخ لەوێ دەبینێتەوە .

# شێخ مەحمود پێش حکومدارێتی

شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی حەفیدی خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخ خانەوادەی دەوری (حکومەتی بەبە) ، ١٥٠ ساڵ پێش نووسینەوەی یاداشتەکان لەلایەن رەفیق حیلمی -یەوە دەستی پێکردووە. کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مارفی نۆدێ، مورشیدو گەورەی تەریقەتی قادریی، خواناس‌و پیاوچاکبووە بۆیە خەڵکی کوردستان بە چاوی رێزەوە تەماشایانکردووەو ئەمەیش بۆ کوڕو کوڕەزاکانیشی ماوەتەوە و بە تایبەتی بۆ شێخ مستەفای نەقیب‌و شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود .

بلیمەتیی شێخ مەحمود لە منداڵییەوە دیار بووە، ناوبانگی بە ئازایی، بلیمەتی، بزێویی دەرکردووە و بە شورەتی باپیری‌و نفوزی ئاینیی خانەوادەکەی گەیشتۆتە پلەی بەرزی سەرکردایەتی و لە ناو دونیای سیاسەتیشدا هەر بە گەنجی چووە بەگژ عەشیرەتی جاف‌و هەمەوەندا .

سوڵتان عبدولحەمید کاك ئەحمەدی شێخی خۆشویستووە، بە رەوشتی سیاسی خۆی شێخ سەعیدی کوڕی داواکردووە بۆ ئەستەمبووڵ ئەویش خێزانەکەی‌و لەوانە شێخ مەحمودی کوریشی بردووە بۆ ئەوێ . بۆیە شێخ مەحمود لە منداڵیدا لە کۆشك‌و سەرای پاشای عوسمانیدا ژیاوە و ژیانی ئۆرستۆکراتیی بەخۆیەوە بینیووە ، بنەماڵەی شێخ دواتر بە مووچەو خەلاتی باش‌و نفوزی چاکەوە گەڕاونەتەوە بۆ سلێمانی .لەوێش هەموو لێپرسراوەکان رێزیانگرتوون بەلام هەندێ بازرگان‌و ئەفسەری پلەدار دوژمنیان بوون . بۆیە کە سولتان عەبدولحەمید لێ دەکەوێت ئەمانیش نفوزیان کز دەبێت و دوژمنەکانیان کە دەبنە ئەندامی لقی حزبی (اتحادو تەرەقی تورك) حکومەتیان لێ هاندەدەن بۆیە لە ژێر چاودێریی سوپادا دەیانبەنە موسڵ .

## فیتنەی موسڵ

لەم فیتنەیەدا شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدی برای دەکوژرێن هەرچی عەشایەرو ئەهالی سلێمانی‌و کەرکوك‌و هەولێرە دەخرۆشێن و داوای بەردانی

شێخ مەحمود و گەڕانەوەی دەکەن، لە ترسی هەڵایسانی شۆڕش و چوونی خەڵکی شارەکانی تری کوردستان بۆ سەریان موسڵ بەریدەدەن . بۆ باسی گەیشتنە کەرکوکی بڕواننە (یاداشتی رەفیق حیلمی–بەرگی یەك– بەشی یەکەم ).

چی سوارو پیادە، ئەهالی و عەشایەر،منداڵ و گەورەهەن دەرژێنە سەر رێگەی کەرکوك و چەند سەعاتێ بە پێ و بەسواری ئۆتۆمبێل دەڕۆن بۆئەوەی بچن بە پیریی شێخ مەحمودەوە. بەو بۆنەیەوە قوتابیان چەندین شیعری ناخهەژێن دەخوێننەوە کەرەفیق حیلمی خۆی یەکێك بووە لەوانە کەئەوکاتە تەمەنی دەساڵان بووەو مامۆستای حوجرەکەی کە مەلا تەقی بووە لاواندنەوە (مرثیە)یەکی بەزمانی تورکیی پێ لەبەر دەکات و ئەویش بۆ هەزارانی دەخوێنێتەوە لەپێش گەیشتنی شێخدا. ئەو ڕۆژە ڕۆژی حەشر دەبێت لەو رێگەیەو بەتەمای هەڵایسانی شۆڕش دەبن بۆیە پارێزگاری تازەی موسڵ رەشید پاشا خۆی دەچێتە کەرکوك دڵنەوایی شێخ دەکات و بە هێزێکەوە دەیگەیەنێتە سلێمانی . هەر لەوکاتەدا باوکی ئەو کابرایەی بۆتە هۆی فیتنەکەی موسڵ، لەکفری دەکوژرێ و بەسەر شێخ مەحمودیدا دەهێنن ، بۆیە حوکمی سێ ساڵ زیندانیی دەدرێ بەسەریدا ئیتر بۆ خۆشاردنەوە لەو سزایە شێخ مەحمود لە دێهاتەکان دەمێنێتەوە

## شەڕی گەورەو شێخ مەحمود

١٩١٤ شەڕی گەورە پەرە دەسێنێ، ئینگلیز لە باشوورەوە دێنە عیراق و دەچنە( بەسرە، عەممارە، کوت) پێش کوت لە شوعەیبە کوردو عەرەب بەگژیانا دەچن هەروەها شێخ مەحمودیش بەهەزار سواری کوردەوە رووبەروویان دەبێتەوەو لەئاکامدا رەشید پاشاو گەلێك لەکوردەکانیش دەکوژرێن .

## شەڕی تورك و رووس و شێخ مەحمود

لەشەڕی تورك و رووسیشدا شێخ مەحمود ئازایانە رووس بۆ تورك دەکات بەئەودیوی ئێراندا ، لە پاشدا تورکەکان ئەو بەڵێنانەی بەشێخ یانداوە نایبەنەسەرو بە پێچەوانەوە رەفتار دەکەن و کورد فریودەدەن، چەند سەرەك عەشیرەتێکی کورد بە بوختانی ئەوەی گوایە تالانییانکردووە دەنرێن بەبەر گوللەی شەستتیرەوە، شێخ زوویر دەبێت و

دەگەڕێتەوە بۆ ژیان لەدەوروبەری شاری سلێمانی . رووس دەگەڕێنەوە سەر تورك‌و تورك بێ پشتیوان دەمێننەوە لەوێ ، ئینگلیز هێزیان دەگاتە کەرکووك، شێخ لەداخی تورك نامەیان بۆ دەنێرێت‌و تیایدا دەڵێت کە ئامادەیە بەرامبەر بەو ماف‌و داخوازیانەی داوای دەکات رێگەیان بکات بێنە ناو سلێمانییەوە خۆیشی لەژێر چاودێریاندا ببێتە حوکمداری کوردستان، لەم کاتەدا تورك دەگەڕێنەوە کەرکوك، بە نامەکەی شێخ دەزانن. بە پیلانی کورد خۆی مستەفا بەگی سەرکردەی لەشکری تورك لە سلێمانی لە نیوە شەوێکدا شێخ دەگرێ‌و رەوانەی کەرکوکی دەکات‌و لەوێ حوکمی لەسێدارەدانی دەرئەکەن ، بەلام لە ترسی دوا رۆژو تۆڵەی کوردەکان ئەنجامی نادەن،عەلی ئیحسان سەرلەشکری تیپی شەشەمی تورك لە موسڵەوە داوای شێخ مەحمود دەکات بە رێزو خەلات و پارەی زۆرو ئاڵتوونەوە دەینێرێتەوە بۆ سلێمانی تا ئەو بەرەیەی بۆ بپارێزێ لە ئینگلیز ، ئینگلیز دیسانەوە کەرکوك دەگرن شێخ مەحمود ئەمجارەشیان پاش ئەوەی ناونیشانی (نەقیب)ی دەدەنێ و دەشیکەن بەپارێزگاری سلێمانی ،کاتی موتارەکە هدنە اعلان دەکرێ‌و جەنگی جیهانی رادەوەستێت . بە هاتنەوەی ئینگلیز واز لە قیادەی مەجلیس دێنێ‌و دەست لە تورك دەشوات‌و عززەتی تۆپچی و فایەقی تاپۆ دەنێرێتە لای ئینگلیزەکان لە کفری کە رێگە دەدات بێنە ناو سلێمانییەوە بەرامبەر بەو ماف‌و داخوازیانەی داوای دەکات وەك جاری پێشوو ویلسن-ی حاکمی گشتی عیراق، کاپتن نۆئێل-ی شارەزای ئەو هەرێمە دەنێرێت لە داری کەلی وەفدی شێخ مەحمود دەچن بە پیریەوە . بە هێزی عەسکەریی خۆی‌و دکتۆرێك‌و ئەندازیارێك‌و چەند ئیشکەرێکەوە دەگەنە سلێمانی. شێخ مەجلیسی لە ماڵی خۆیگرتووەو لە پیاو ماقوولانی ناردووە بە پیریانەوە ، نۆئێل بە فارسی وتارێکی دوورو درێژ دەخوێنێتەوەو لەوەدا ئیعلانی دەکات کە شێخ مەحمود (حوکمداری کوردستان ) ەو خۆیشی دەبێتە حاکمی سیاسی .لەوکاتەدا رەفیق حیلمی لەوێ دەبێت‌و ئاگای لەم کارە دەبێت ،هەر ئەو ئێوارەیە دیسان لە ماڵی شێخ کۆدەبنەوە بۆ موبایەعەی شێخ مەحمود لە لایەن رونەسای عەشایەرو ئەهالی‌و... هتد لەوێدا رەفیق حیلمی بە دەست‌و خەتی خۆی ئەو مەزبەتەیە بۆ شێخ مەحمود دەنووسێ کە ئاراستەی کۆنفرانسی ئاشتی کردبوو تیایدا شەریف پاشا دەکات بە نوێنەری خۆی لەو کۆنگرەیەدا، بەلام ئەم مەزبەتەیە ناگات، لە حەڵەب هێزی فەرەنسا

ڕایدەگرێت دوایی درێژەی ئەم باسە دەخوێننەوە ، لێرەدا خۆم پرسیارێکم هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئایا چۆن و کەی رەفیق حیلمی ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ شێخ مەحمود پەیدا کرد؟ ڕاستە باسیکردووە کەی یەکەم جار ناسیوویەتی، بەناونیشانی "یەکەم معارەفەم لەگەڵ شێخ مەحمودا " بەلآم ئەوە هەر پێ ناسین بووە، کەی دەستیکردووە بە ئیش و کار لە گەڵیدا باسی نەکردووە ئەوەتا ڕاستەوخۆ باسی ئەو مەزبەتەیە دەکات کە پێی نووسیوە . ئینجا چۆن ئەمری پێکردووە کە یارمەتی کاپتن نۆئێل بدات لە وەرگێڕانی گفتوگۆو نامەدا لەنێوان نۆئێل و شێخ مەحمودو ڕوئەسای عەشایەری کوردیی و وانەی کوردیش بلێتەوە ؟ لەمەودوا باسی پەیوەندیی رەفیق حیلمی لە گەڵ نۆئێل و ئینگلیزەکانی تردا دەنووسینەوە بە پێی یاداشتەکانی رەفیق حیلمی خۆی . هەروەها باسی پەیوەندیی لەوەودوای دەکەین لەگەڵ شێخ مەحمود تا دەگاتە کۆتایی بەرگی حەوتەمی یاداشتەکانی ئینجا باسی بینینەوەی شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٣٠ دا دەکەین کە هەردووکیان نەفی دەکرێن بۆ ناسرییەو ئەمەی لە (٣٠ لاپەڕە دەستخەتی خۆیدا نووسیوەتەوە ) کە چاپ نەکراوە . پاش ئەوە دەزانم رەفیق حیلمی تا کۆچی دوایی شێخ مەحمود هەر پەیوەندیی هەبوولەگەڵیدا ، تەنانەت پێش کۆچی دوایی شێخ لە نەخۆشخانە لە بەغدا بە دیارییەوە بوو تا دوا هەناسەی و لەگەڵ تەرمەکەشی ڕۆیشتەوە بۆ سلێمانی بە هەمان ئۆتۆمبێل و لەگەڵ جەماوەری سلێمانیدا بەخاکی کوردستانیان سپارد .تەنانەت باوکم لەکاتی کۆچی دوایی شێخ مەحمودا وا دەگریاو سەری خۆی دەدا بە دیوارەکاندا کە خۆشەویستییەکی گەورەی نێو دڵی ئەوی بۆ شێخ بەیاندەکرد.

# چۆنیّتی دامەزراندنی حوکمداریّتی یەکەمی شیّخ مەحمود

بەپیّی ئەو چەند لاپەڕەیەی کە ڕەفیق حیلمی بە ناوی "دەستکردن بە نووسینەوەی خاطراتەکەم " نووسیویەتی، لیّرەدا ساڵی (١٩١٩)ی داناوە لە یاداشتەکانی بەرگی یەکەم بەشی یەکەمدا وتوویەتی ڕۆژی ت ١٩١٨ میّجەر نۆئیل بە ناوی حاکمی عیراقەوە ئیعلانی کرد . بابزانین لەم خاطراتەدا چی نووسیوە.

## ١٩١٩ میلادی

" چەند ڕۆژیّك بوو ئینگلیز کەرکوکیان گرتبوو شیّخ کرابوو بە وەکیلی موتەسەریفی سلیّمانی، لە پڕ غەڵبە غەڵب کەوتە شارەوە بەردەرکی سەرا پڕبوو لە لادیّی تفەنگ بەشانی فەرەنجی لەبەر، ئەهلی شار کش‌ومات لەم حاڵە ئەفکرین، دەنگ بڵاوبۆوە وتیان : ئینگلیز دیّنە شارەوە تابووریّك عەسکەری تورك‌و هەندیّك ژەندرمە لە سلیّمانی بوون، چەکیان لیّ وەرگیراو خرایە عەمارەوە . لە ماڵی شیّخ مەحمود (مەجلسی ئەشراف) گیرا وەفدیّك ڕیّکخرا بچیّت بە پیر میجەر نۆئیّل– ەوە. دەرکەوت کە شیّخ مەحمود بەینیّك بەدزیەوە لە گەڵ ئینگلیز کەوتۆتە موخابەرەوەو عیزەتی تۆپچی‌و فایەقی تاپۆی ناردۆتە لای ئینگلیزەکان تا دەعوەتیان بکەن بۆ سلیّمانی .میجەر نۆئیّل‌و دەستەو دائرەی لە داری کەڵی چاوەڕوان بوون . وەفد چووبوو بە پیریانەوە و ڕۆژی دووەم هاتنە شارەوە .

## حاکمی کوردستان

ئەو ڕۆژانە شاری سلیّمانی لە جۆش‌و خرۆشیّکی گەورەدا بوو ئیش‌وکار هەموو وەستابوو، عەشایەری ئەتراف دوا بەدوای یەك ئەهاتن بۆ سلیّمانی، ماڵی شیّخ بووبوو بە قبلەی ئەخبارو موراجەعات . دوای مذاکرات لە بەینی ئەشراف‌و ڕوئەسا ئینگلیزەکان بە مەراسیمیّکی تایبەتی‌و لە بەردەرکی سەرا کۆنەکەی دەوری بابان حکومەتی کوردیی‌و حوکمداریی شیّخ مەحمود ئیعلانکرا .

ئەهالی لەو رۆژەدا بووبوون بە چەند بەشێکەوە لادێی و قسمێك لە عەوامو دەستەی شێخان کەوتبوونە خۆشیەوە دوێنێیان لەبیر چووبۆوە . سبەینێشیان بە بیردا نەدەهات .

بەشی مەئموورو خوێندەواریش کە زۆرکەم بوون دەست بەجێ بوون بە فیرقەی [*] تورك خواهان و فیرقەی نیشتمانپەروەری بێ تەجروبەو موتەحەیر.

وەکو لە هەموو دەوریەکدا بینراوەو دەبینرێت ئەم فیرقەی نیشتمانپەروەرە بێ پشتو بێ مەنهەجانە لە لایەن تورك خواو شێخ خواوە تووشی گەلێ تانووت بوونو هەر لەو رۆژەوە بە پیاوی ئینگلیزو دوژمنی ولات درانە قەلەم و ئەم تانووتو دوژمنایەتییە بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەوانیش (کورد پەروەرەکان) پالبدەن بە ئینگلیزەوەو هەولێ بۆلە لاواز کردنی ئەوانیتر بدەن ،ئینجا رەفیق حیلمی نووسیویەتی(من چی بووم؟)

## سەرەتای پەیوەندیی بە شێخ مەحمودو ئینگلیزەوە

یەکەم دامەزراندنی شێخ مەحمود بە حوکمداری کوردستان لەبەر دەرکی سەرا لە سلێمانی ،لە تشرینی یەکەمی ١٩١٨دابوو کاتێ میجەر نۆئیل بە ناوی حاکمی عامی عیراقەوە ئەمەی ئیعلانکرد .

ئێوارەی ئەو رۆژە لە مالی شێخ مەحمود ئەهالی و گەورەکان بەیعەتیان بە حوکمداردا (کە معاشەکەی مانگانە "١٥٠٠٠" رۆپیەبوو) [*] رەفیق حیلمی لەبەشی یەکەمی بەرگی یاداشتەکانیدا بۆ یەکەمجار باسی خۆی دەکات [*] ودەلێ :

" خۆم نووسەری ئەم یاداشتە لەگەل ( ئەحمەد ئاغا کەرکوکی زادە ) لەم بەیعەتەدا حازر بووم".

میجەر نۆئیل ناوی حاکمی سیاسی لێنرا، لە مەکتەبی ئەعدادی زەمانی تورك دائەنیشت ئێجگار حورمەتی (شێخ)ی گرت .

بە پێی قسەی هەندێ لە ئینگلیزەکان شێخ کرابوو بە نوێنەری هێزەکانی بەریتانیا لە کوردستان [*1]

---

[*] ئەم وشەیە ناخوێندرێتەوە .

[*] ل ٦٢ حزوری رەفیق حیلمی لە بەیعەکەدا یاداشت بەرگی یەك بەشی یەك .

[*] ل ٦٣ معاشی حوکمدار یاداشت بەرگی یەك بەشی یەك .

رەفیق حیلمی باسی چارەسەری برسێتی و گرانیی و دابەشکردنی زەخیرەو مووچەو دیاریی و ئاڵتوون دەکات،هەروەها چارەی هەژاریی و ... هتد وەدەڵێت" تەنانەت شێخیش لە خۆی بایی بووبوو .. کە لە دەشتی کانێسکان کاتی بەسەر ئەبرد بە هیوای ئەوەبوو تا سەر بەم چەشنە بێت و کوردستانی گەورەی بۆ دروست ببێت "، تەنها شتێکی باشی بۆ کوردستان کردبێت ئەومەزبەتەیەی عەشایەرە کە بۆشەریف پاشا رەوانەکرا وەك نوێنەری کورد لە کۆنفرانسی ئاشتی لەپاریس بۆ داواکردن لەمافەکانی کورد [2*] رەفیق حیلمی دەڵێت: من خۆم لەو کۆبوونەوەیەدا بووم و خۆم نووسەری ئەومەزبەتەیەو ئەو نامە تایبەتییە بووم کە نێردرا بۆ ( شەریف پاشا) بە رەشید کابان و ئەحمەد بەرزنجی دا .

ئەم نوێنەرانە لە حەلەب رێیاننەدرا بچن بۆ پاریس بەڵام کوردی تورکیا(شەریف پاشا)یان کردووە بە نوێنەریان و ئەمیش ٢٢ی مارتی ١٩١٩ موزەکەرەی داوە ١٠ی ئابی١٩٢٠ موعاهەدەی سیڤر مۆرکرا بە(٣) بەندی زۆر باشەوە بۆ کورد .

دوایی لە لۆزان دا [*] لە جیاتی مافدان بەکورد، کوردستان دابەشکراوە بەسەر (٣)وڵاتدا بەهۆی تورکەوەو بەشە چەورەکەی بەو دراوە لە جیاتی وازهێنانیان لە موسڵ .

رای رەفیق حیلمی بەرامبەر بە بیرو هەڵسوکەوتی مێجەر نۆئێل بەم شێوەیە بووە کە وتویەتی : "نۆئێل ویستویەتی شێخ پێبگەیەنێت بۆ حوکمداریی بە راستی دوا

---

[1*] ل ٦٢ شێخ نوێنەری هێزەکانی بەریتانیا یاداشت بەرگی یەك بەشی یەك .

[2*] ل ٦٥

[*] بەوەدا کە هەر ئەوەندە شێخ مەحمود ماوەی داوە ئینگلیزەکان بچنە سلێمانی وەك دیمان پێش ئەم لاپەڕەیە چۆن یەکسەر کردوویانە بە

" حوکمداری کوردستان" و خۆیان پێویستییان بە شێخ بووە تا لای هەرێمی سلێمانی بپارێزرێت لە تورك ئیتر بۆچی دەبوو شێخ بە گومان بێت لە ئینگلیزەکان و با بداتەوە بە لای تورکدا! لە کاتێکدا تورکەکان ساڵەهای ساڵ کورد پشتگیریی کردون و خۆیان بەختکردووە بۆ سەرکەوتنیان لە چەند جەنگێکداو تەنانەت جەنگی کەمال ئەتاتورکیش بۆ بوژانەوەی تورکیا پاش جەنگی یەکەم، کە چی لەجیاتی بەجێ هێنانی پەیمانەکانیان کە سەربەخۆییان بدەنێ خۆ بەختکارانی کوردیان بە زیندوویی کرد بەژێر خاکەوە.

بۆ بڕیاری عصبە الامم سەبارەت بە پەیماننامەی لۆزان و دانەوەی موسڵ بە عیراق بەرامبەر بە واز هێنانی ئینگلیز لە وەعدەکەیان بۆ کوردو (٣) بەندەکەی سیڤر لابرا. بڕوانە رۆژنامەی "ژیانەوە" ساڵی ١٩٢٥ .

رۆژ " بۆیە دەڵێ " شکم نیە زەمان بەدڵی برۆشتایە لەوانەبوو بناغەی کوردستانی گەورەی دابمەزراندایە*.

## پێوەندیی رەفیق حیلمی بە ئینگلیزەوە

١-نۆئێل : رەفیق حیلمی بە فەرمانی شێخ مەحمود یارمەتی نۆئێلی داوە بەمشێوەیە:

ا-وەرگێڕانی گفتوگۆی نێوان شێخ مەحمودو سەرەك خێڵەکانو خەڵکەکە لە کوردییەوە بۆ فەرەنسی و لە فەرەنسییەوە بۆ کوردیی .

ب- وانەی کوردیی بە نۆێل وتۆتەوە .

ج- بە نوێنەرایەتی شێخ مەحمود لەگەڵ نۆێل چووە بۆ پشکنینی کاروبار لە دەورو پشتی سلێمانیو کەرکوكو هەولێر و بۆ وەرگێڕانی گفتوگۆکانی لەگەڵ سەرەك خێڵەکانو خەڵکەکەدا .

رەفیق حیلمیسەبات بەم پیاوە وتویەتی: هەرچەند فارسیی زانیووە ،بەڵام پێویستی هەبووە بە یەکێك کە زمانێکی بێگانە بزانێت . لەبەر ئەوەی ئینگلیزیزان ئەوکاتە لە سلێمانی نەبووەومن فەرەنسیم دەزانی "شێخ ئەمری کرد" کە یارمەتی بدەم . جگە لە نووسینو وەرگێڕان وانەی کوردیشم بە شەوان پێ ئەوت دوای ئەوە لە گەڵم دەکەوتە باسی کوردستان لەم باسانەدا من سوودم باشتر بوو .

نۆئیل بەتەمابوو لەگەڵ خۆی بمبات بۆ تورکیا ، تا لە گەڵ کوردەکانی ئەوێ بۆ داوای کورد تێبکۆشێتو پشتیوانو لایەنگیر بدۆزێتەوە بۆ حکومەتی کوردستان . شێخ متمانەی پێ نەدەکرد بۆیە نۆئێل دەستی لە موستەشاریی شێخ هەڵگرتو مێجەرسۆن جێی گرتەوە ، کەئەمەیان ڕقی لە شێخ بوو، ساڵی ١٩١٩ – ١٩٢٠ نۆئێل نێردرا بۆ تورکیا ، باوکم دەڵێت لەبەر ئەوەی نەخۆش بووم نەمتوانی لە گەڵیدا برۆم : (*) هەروەها دەڵێت پێش رۆیشتنی بەمانگێك نەخۆش کەوتمو نۆئێل هات بۆ لامو دکتۆری خۆی راسپاردبوو،تا رۆژی دووجار سەردانم بکاتو دەرمان بداتیو دەرزیم لێبدت .

---

(*) ل ٧٢ یاداشتی یەك بەشی یەك .

بۆچـوونی بـاوکم سـەبارەت چـوونی نۆئێـل بـۆ تورکیـا لەسـاڵی ١٩١٩، بەمشێوەیەبووە کە وتوویەتی: نۆئێل لە تورکیا هەوڵی دامەزراندنی کوردستانی گەورەی داوە . ئەگـەر مسـتەفا کـەمال ئاتـاتورك بـە داوای خەلیفـەی بکردایـەو بچـوایە بـۆ ئەستەمبووڵ و ئەنادۆڵی بەجێ بهێشتایە "لەوانەبوو نۆئێل و کورد بە ئامانجی دامەزرانی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی کـورد بگەیشـتنایەو تەقـەلای کـوردو شـەریف پاشـا لـە سـێڤر بچوایەتە سەر ."

## سلێمانیی پاش نۆئێل (*)

رەفیق حیلمی دەڵێ : تازە لـە نەخۆشـیی هەسـتابوومەوە هێـزو توانـای ئیش کـردنم نـەبوو زۆر بـێ حەوسـەڵە بـووم بەرامبـەر ئـەو وەزعـە بڕیارمـدا بچم بـۆ کـەرکوك بـۆلای مامەکانم .

## ٢- کاپتن بیڵ

(گرینهـاوس) وەکیلـی نۆئێـل پـاش هەسـتانەوەی بـاوکم لەنەخۆشـییەکەی چـاوی پێیکەوتووە .پێی وتووە (کاپتن بیڵ) دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت(*) بیڵ معاونی حاکم بووەو تازە چۆتە سلێمانی، هێشتا رەفیـق حیلمـی نەیناسیووە بەڵام لەسـەر ئەو داوایە چۆتەلای خۆی پێناساندووە ، بە فەرەنسی پێـی وتـووە ئەیـەوێ فارسـی بخوێنێت،باوکم لەیاداشتەکانیدا دەڵێ ویستم تێـی بگەیـەنم کـە نەخۆشـم و توانـای ئـەوەم نیـە وانـەی پـێ بڵێمەوە،بەڵام ئەو هەرناچارێکردووە بڕیاربدات و ویستوویەتی کتێبی گوڵستانی سەعدی پێ بخوێنێت کە شاکارێکی ئەدەبیی زۆر گرنگە. لەدرێژەی یاداشتەکانیدا سەبارەت بەم داوایە باوکم پێی وابووە کارێکی سەختە کوردێك بەزمانی فەرەنسـی کتێبێکـی فارسـیی واگران فێری ئینگلیزێك بکات ؟!

---

(*) لە ٧٨و٧٩ یاداشتی یەك بەشی یەك .

## ١٩١٩ رەفیق حیلمی و کاپتن بێل (*)

بۆیە نوسیوویەتی پاش یەکەم وانە کە بەکاپتن بێلی وتووەتەوە دیاربووە بە دڵی بووە(*) بۆیە بە گەرمیەوە تکای لێکردووە وانەی سبەینێشی پێبڵێتەوە، رەفیق حیلمی دەڵێت " زۆر ماندوو بووم" بەڵام چونکە سودی بۆ خۆیشی تێدا بووە بەردەوامبووە لەسەری ، بەوە زیاتر بەقسەکردن بەزمانی فەرەنسی راهاتووە، کاتێ مامۆستای فەرەنسی بووە لە ئەعدادی خوێندنەوەو گرامەری باشبووە بەڵام بەپراکتیکی گفتوگۆی زۆر نەبووە. دوای وانەکە چۆتە ئەو ژوورەی نۆئێل بۆی تەرخانکردووە ، پڕ بووە لە هندۆس و ئاشووری ، جێی دانیشتنی نەبووە، ڕاست چۆتەوە بۆماڵەوە ئێوارە چۆتە لای شێخ و ئەمانەی پێوتووە . لەوەڵامدا شێخ وتویەتی بەڵکو ئەم (بێڵ)ە بکەیت بە (خاکەنان)، لەبەرئەوەی شێخ رای لێبووە کە وانەی پێ بڵێ وتویەتی تا ماوەیەك وانەی پێ دەڵێم بەڵام زۆری پێ نەچووە لە مامۆستایەتییەکەی سارد بۆتەوە ئەوەتا خۆی دەڵێ (چونکە قوتابییەکەم بە چاوێکی‌تر تەماشام ئەکات) وەك هندۆسەقاچ باریکەکان لە گەڵم ئەجوڵێتەوە ،باوکم چەند جارێك ، دڵی شکاوە لێی چونکە فیزێکی ئیجگار زلی هەبووەو خۆی زیزکردووە کە رەفیق حیلمی وەك ئەوانی تری نەکردووە، بەڵام جارێ خۆی گرتووە بۆ هەلێك گەڕاوە تابە جێی بهێنێت بۆ وێنە باسێك دەگێڕێتەوە : رۆژێك وانەی پێ‌وتووە سەرۆك عەشیرەتەکانی خۆشناوەتی شەقڵاوە پاش سەردانی شێخ چوونەتە لای ئینگلیزەکانیش، چایان بۆ هاتووە پاش خواردنەوەی جێ نەبووە پیاڵەکانی لێدابنێن هەر رەفیق حیلمی لەوێ بووە قوتابیەکەی ئەمری پێکردووە ئەو لێیان وەربگرێت، باوکم دەڵێت ئەو قسەی نەکردایە رەنگ بوو خۆم لەبەر رێزی میوانەکان پیاڵەکانم وەرمبگرتایە بەڵام بە ئەمری ئەو موستەحیل بوو بۆیە وەڵامی نەداوەتەوە ، دووبارە بێل پێی وتۆتەوە بەڵام ئەم جوڵەی نەکردووە میوانەکان تێگەیشتوون بۆیە زوو خۆیان لەشوێنێك دایاننا وە. رەفیق حیلمی دەڵێ بێل رەنگێکی

---

(*) ٧٨- ٧٩ یاداشتی یەك بەشی یەك .

هێناوەو بردووەو من لەو خراپترم بەسەرهاتووە،هەروەها دەڵێ هێشتا نەخۆش بووم زۆریش پەست بووم " باش بوو میوانەکان زوو ڕۆیشتوون پاش لێکدانەوە بێل وتویەتی بۆچی وەڵامت نەدامەوە لەوەڵامدا وتویەتی" ڕاستت پێ بڵێم من وانە بە تۆ ئەڵێم تۆ قوتابیی منی ، لەبەر ئەوە تێناگەم چۆن ئەمری وام پێ ئەکەی ، دەبوو یەکەمجار تێبگەیشتیتایە " بێگومان ئەم قسانە کاری تێکردووە .

## دەیەوێت واز لە بێل بهێنێت

باوکم ئەو مەسەلەی پیاڵە وەرگرتنەی بە هەڵزانیوەو ویستوویەتی بە تەواویی لە گەڵ بێل بیبڕێنێتەوە بۆیە پێی وتویەتی ئەگەر ئەم قسانەی ئەو بەهەق نازانێ دیارە بە فەراشی دادەنێ بۆیە دەبێت لەو فەراشیەی ئازاد بکات. لەم قسەیە ڕاماوەو بێ دەنگ بووە ئینجا لە ناکاو هەستاوەو بەڕووی خۆش‌و زەردەخەنەوە دەستی ڕەفیق حیلمیی گوشیوەو ئەویش سوپاسی کردووە و چۆتەوە بۆ ماڵەوە .

باوکم دەڵێ لەکاتی نۆئێل دا هەستم بە فیزی ئینگلیزەکان نەکردبوو چونکە ئەو زۆر دڵی ڕادەگرتم‌و بە چاوێکی بەرزو بەڕێزەوە تەماشای دەکردم.

چەند ڕۆژێك پاش ئەم ڕووداوە بێل ناردوویەتی بە شوێن ڕەفیق حیلمیی‌داو گەلێك دڵنەوایی کردووە .

## گەشتی بێل‌و ڕەفیق حیلمی بۆ سلێمانی‌و هەولێرو کەرکوك( * )

بێل داوای لێکردووە گەشتێکی لەگەڵ بکات بە ناو عەشایەری سلێمانی‌و هەولێرو کەرکووکداو خۆی ئامادە بکات تالە گەڵیدا بڕوات دوای ئەوازشێکی زۆر ئینجا باوکم بەڵێنی دەداتێ لە گەڵی بڕوات بۆیە گەلێك دڵی ڕاگرتووە و ویستویەتی هێمنی بکاتەوە ،"ئەمجارە بە چاوی هاوڕێیەکی بە ڕێزەوە سەیری کردووەو لە گەڵی جووڵاوەتەوە.

ڕەفیق حیلمی‌لەیاداشتەکانیدا وتویەتی" کاپتن بێل لەم گەشتەیدا هەواڵی عەشیرەت‌و خزم‌و کەسیان‌و نەخشەی هەرێمەکەیانی وەرگرتووە هەروەها چۆنێتی پەیوەندیان لەگەڵ شێخ مەحمودا، ئەوانەی ناحەزی بوون دەبوونە ئاغاو کوێخا "

(*)رەفیق حیلمی دەڵێت " من لەم هەموو پرسین و لێکۆڵینەوەو چەنە کوتانە هەر وەرگێرانم لەسەر بوو لە چەنەو نەفەسی درێژی بێل و لە قسەی پرپووچی لادێی و عەشایەر چەنەو مێشکم ماندوو و بێ هێز ئەبوو دلیشم ئەگوشرا ، لە گەڵ ئەمەیشدا خۆم تێکنەئەدا .بێجگە لە من بێل کابرایەکی بە ناوی کاتب هێنابوو بەڵام نە دەینووسی نە قسەی لە گەڵ دەکرد ،دوایی تێگەیشتم ئەمە چاودێرە بەسەر منەوە"

بەهۆی شێخ و گوێ نەدانی بەسبەینێ " ئینگلیز ئیشیان گرتە دەست و بۆ هەل دەگەڕان تاکۆتایی بە حوکمی شێخ بهێنن (*).

## سەفەری رەفیق حیلمی و بێل بۆ کۆیە ٢٠ی شوبات ١٩١٩

بێل دەبێت بە حاکمی کۆیە ، ئەمجارەش زۆر لەگەڵ رەفیق حیلمی خەریک دەبێ تالە گەڵی بێت بۆ کۆیە ئەمیش چەند هەوڵدەدات نەچێت و وازی لێبهێنێت کەچی لێی ناگەڕێ تا بەزمانی شیرین تەفرەی دەدات . ئیتر رەفیق حیلمی چاری نامێنێت بۆیە پرس بە شێخ دەکات بەڵام شێخ تەگەرەی تێناخات و بگرە پێشی خۆشدەبێت یەکێکی وەك رەفیق حیلمی لە گەڵ بێل بێت چونکە بە کەسێکی سەربە شێخ خۆیی زانیووەو جێی متمانەی بووە . باوکم دەربارەی ئەمە دەڵێ: من لە هیچ کاتێکدا نەم ویستووە لە خۆمەوەو بێ پرسی شێخ مەحمود هیچ شتێك بکەم چونکە خۆم بە جێی باوەڕی ئەو ئەزانم و حەزم بە سەرکەوتنیەتی ، کە زانیم شێخ پێی خۆشە لە ٢٠ی شوباتی١٩١٩ بەناوی یاریدەدەری وەرگێڕ چوومە کۆیە : ( Assistant – Drogman )

## لە کۆیە (*)

زستان بە باران و سەرما و بەسواری ولاخ لە سلێمانیەوە تا کۆیە باران لێیداین . لێرەدا رەفیق حیلمی بۆ یەکەمجار باسی رەوشتی خۆی دەکات و دەڵێ "لە بنچینەدا زۆر ساردو هێمن نەخوڵقابووم و رەنگە دڕۆنەکەم کە بڵێم هێندەش فێری مەرایی و دوو روویی نەبووبووم ، لەبەر ئەوەی لە پێشدا لە گەڵ یەکێکی جێنتڵمانی وەك نۆئێل دا

---

(*) ل ٨٢ ١-١ یاداشت بەرگی یەك بەشی یەك

(*) ل ٨٧

ئاشناییم پەیداکردبوولە ترو فیزی بێل زۆر پەست بوومو قەدری خۆم ئەگرت، حەزم لە ڕاستی ئەکرد، نەمدەزانی مەرایی لەبەرا بکەمو زمانم وەر نەئەسووڕا وەکو خەڵکی تر پێی بڵێم (ساحێب) ئەمانە تەبیعەتی ئەم ئینگلیزە ئیستیعمارەی توند ئەکردو بۆی بلوایە لە ملی ئەدام . لە گەڵ ئەوەشدا وەك کورد دەڵێ لیم بووبوو بە مووی لووت (*) وێڕای ئەمانەش لەم سەفەرەدا لەچاو جارەکانی پێشوو گەلێك گۆڕابوو، باش بوو، تا ئەیتوانی ئەیویست دڵم ڕابگرێ بەڵام جار جار هەر مشتومڕێکمان ئەبوو . کەمو زۆر ساردیی ئەکەوتە بەینەوە ، ئیڕوانی لە جیاتی عوزرهێنانەوە بۆیو واز هێنان لەو کردەوانە لە بیانوو دەگەڕام لێی جیا ببمەوە. خۆم ئەتۆرانو ئیزنی گەڕانەوەم داوا دەکرد بەڵام ئەو ڕێی جیابوونەوەی نەئەدام هەر جارە بە جۆرێك ئاشتی دەکردمەوە" ڕەفیق حیلمی دەڵێ کە لە ئەنجامی ئەم چەشنە هاوڕێیەتییە کەوتۆتە ئەندێشەوە ترساوە جارێك بگاتە تینیو تووشی داوێکی بکات. تا بەینێك لە کۆیە زۆر دڵی ڕاگرتووەو خاویکردۆتەوە لەو دەورەدا باوکم وتویەتی" تاتوانیم خزمەتی خەڵقم کرد بە هۆی (بێل)ەوە چاکەم بۆ گەلێ کەس بوو بەم تەرحە لە گەڵ هەندێ دۆستی پیاوانی بەنرخ خۆشم ڕابوارد ، لە لای ئەهالیو ئەو دوو سێ ئینگلیزەش کە لە کۆیە بوون بە قەدرو بە ڕێز بووم" بێل بێ وچان ئیشی کردووە یان بەسەر پشتی وڵاخەوە بووە بەناو ڕانیەو ڕواندزدا سووڕاوەتەوەو باوکمی لەگەڵ بووە . ئەو سەرقاڵی نووسینو پرسینو ئەمیش سەرقاڵی وەرگێڕانو قسەبووە ودوو ئەوەندەش سەرقاڵی نووسینی نامەی ئەم بووە بۆ ڕەئیسەکانو وەرگێڕانی نامەی خەڵکیش بۆ بێل . ئەو خۆی نامەکانی بە فەرەنسی دەنووسییو ڕەفیق حیلمی دەیکردن بە کوردیو فارسیو نامەی عەشایەری دەکرد بە فەرەنسی ولەو میانەیەدا نامەی سەیرو سەمەرەی بەرچاودەکەوتن کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبوون"

(*) ل ٨٩

## کارو باری حکومەتی کۆیە (*)

رەفیق حیلمی خۆی وتویەتی پاش نۆئێلو معاونە ئینگلیزەکەی هەموو باری گرانی کەوتۆتە سەر شانی ئەم وتوشیەتی لەگەڵ ئەو رەنجی شەوو رۆژو تەقەلا بێ سنووروودا کە سەرقاڵی کرد بووم ئەودەمە دەورێکی تایبەتی هەبوو لە ژیانما" لێرەدا نوکتەی گێڕاوەتەوە نوکتەکە دەربارەی گفتوگۆیەکی دوورو درێژە سەبارەت بە قەند کێشانی یەکێك لە ئاغاکانو وەرگێڕانی رەفیق حیلمی بۆ دەیان پرسیارو وەڵامی نێوان ئاغاو بێل لە فەرەنسییەوە بۆ کوردیو بە پێچەوانەوە " .

باوکم دەڵێ: بێل غەزەبی خوا بووە،لەگەڵ بێل لە یەك ژووردا دانیشتوون گوایە ئینگلیزێك بە هەڵە داوان هاتۆتە لای بروسکەیەکی پێبووە یەکسەر داوێتییە دەست بێل، ئەویش تووڕە بووە وتویەتی بیدەرە دەست رەفیق حیلمی، کە سەیری کردووە بروسکەکە بە ئینگلیزی بووە ئیتر بۆ بیداتە دەست ئەو؟ نەشی هێشتووە کابرا ڕاستەوخۆ لەگەڵی قسەبکاتو وتویەتی بالەگەڵ رەفیق حیلمی قسەبکات.

## شکاندنی نفوزی شێخ لەناو عەشایەردا :

باوکم لەیاداشتەکانیدا وتویەتی سۆن هاتە سلێمانی شەڕ بە شێخ بفرۆشێت ، یەکەم هەوڵیشی بۆ شکاندنی شێخ لە رانیە دەستی پێکرد .

## رەفیق حیلمیو بێل دەچنە رانیە (*)

بێل لەگەڵ کاپتن پارکەری معاونی لە رانیە لە ماڵی فەتاح بەگ میوان دەبن ،فەتاح بەگ بەتەمای جێگەی (شێخ ئەمین)ی قایمقام دەبێ بۆیە میوانداریيان دەکات، بێل ویستویەتی مەزبەتە مۆر بکرێ دژی شێخ مەحمود شێخان رازی نەبوون . کاتێ شێخان ئەمەیان رەتکردەوەو مەزبەتەکە ئیمزا نەکرا ، رەفیق حیلمی دەڵێ " بۆ یەکەمجار

---

(*) ل ٩٠-٩٢ (جۆرو ئیدارەی حوکمی کۆیە) یاداشت بەشی یەك بەرگی یەك

(*) ل ٩٦/٩٧ بۆ درێژەی باسەکە بروانە یاداشتی رەفیق حیلمی بەرگی یەك بەشی یەك

خۆم پێنەگیراو بە پێچەوانەی واجیباتیَ کەلەسەرم بوو جولاَمەوە" واتە بە پێچەوانەوە بۆ جاری یەکەم لەژیانیدا کاری وەرگێڕانی کردووە، هەروەها دەڵێ " لەگەڵ ئەوەدا کە لە وێستاوێکی (وضع)ێکی ناسکداو لە ترسەوە نزیك بووم دیسانەوە دەورێکی وەکو هینەکەی غەفور خانم تەمسیل کرد (*) ئەم غەفور خانە یاخی وەستاوەو نەیهێشتووە ئەو مەزبەتەیە مۆر بکەن، وتویەتی باوەڕتان نەکردووە کە ئەم ئینگلیزانە باوەڕیان پێ ناکرێت ئەوەتا خۆیان سوێندیان داین لە گەڵ شێخ بین و ئێستاش خۆیان دەیانەوێ بیڕوخێنین ،بێل و پارکەر داوای یارمەتیان لێکردم کە ئیتر یەکە یەکە رەئیسەکان هەڵخەڵەتێنن و دوو بەرەکی بخەنە ناویان و ویستیان هەندێکیان جیا بە جیا ببینم پێش چوونە لایان و بیانترسێنم لەسەر ئەنجامی عنادیی لەگەڵ ئینگلیزەکان" هەروەها دەڵێ" بەلاَم من لەبەر هەرچییەك هەیە بە پێچەوانەی ئەمەوە جوولاَمەوە، وام لێکردن بۆ ئەم چاوپێکەوتنە جیاوازە ملنەدەن " بەلاَم بێل هەر چۆنێك بێت توانی بە هۆی حاکمی سیاسیەوە تەلەگراف بە شێخ بنێرێت کە بڕیاری لابردنی شێخ ئەمین بدەن .

ئەمە هەر هەوڵێك بوو بۆ شکاندنی نفوزی شێخ مەحمود لەناو عەشایەردا بە دەسیسەی ئینگلیزو بەڵگەیەکیشە بۆ هەڵوێست و چالاکی رەفیق حیلمی.

بێل دەیەوێت باوکم ببێتە قایمقامی رانیەو پارکەر بکات بە حاکمی سیاسی تا یارمەتی بدات بەلاَم باوکم بەمە قایل نەبووە بۆیە دەڵێ

" بە نەخێر وەلاَمم دایەوەو دەڵێ بۆ بەڵگە سەعید فەوزی کە بە باشکاتب ناوی دەرکردبوو ئاگای لەمە هەیە ،هەتا بێل وتی کاپتن پارکەر ئەکەین بە حاکمی سیاسی رانیەو لە هەڵسووڕانی کاروباردا یارمەتیت ئەدا،ناهێڵێت تووشی گێرمەو کێشە ببیت، وتم : من ترسم لەوە نی یە کە ئەم کارەم پێ نەکرێت بەلاَم دڵم بە وەزیفەوە نی یە. ئەگەر ئەتەوێت سوپاست بکەم ئیزنم بدە بگەڕێمەوە سلێمانی" ئیتر بێل وەلاَمی نەداوەتەوەو بێ دەنگ بووە .

---

(*) ل ٩٨ یاداشت- بەرگی یەکەم- بەشی یەکەم.

## سەرەتای شۆڕشی شێخ مەحمود

لەم ماوەیەدا رەفیق حیلمی هەر سەفەریکردووە لەگەڵ ئینگلیزەکان بۆ شوێنی دوور لەشاری سلێمانی، بەڵام لێرەدا دەکەوێتەوە باسی هەواڵی شێخ مەحمودو دەڵێ شێخ لە هەوڵی ئینگلیزەکان گەیشتووە لەگەڵیان ساردبووە هیوای هیچی پێیان نەماوە . لە ژێرەوە خەریکی خۆ نزیکخستنەوەبووە لەرەئیسەکان و تا لەگەڵیان رێکەوێت و ئەوانەی متمانەی پێدەکردن دەیناردن بۆ دەرەوەی عیراق و هەر ساتە حاکمێکی ئینگلیز کوژراوە و خەڵك بێزار بوون و لە زۆربەی عیراق کۆمەڵە رێکخراوە و زۆر لەوانەی نزیك بووبوونەوە لەئینگلیز دیسانەوە بوونەتەوە بە تورك خواز . ئۆزدەمیر کە چووە بۆ رواندز ئینگلیزی بە چەشنی رووس داوەتە قەڵەم واتە بە (ظالم) و ئینگلیزەکانیش بە (تصرفیان) واتە هەڵسوکەوتیان ئەمەیان کردووە بە راست. کوردەکان نەیاندەوێرا باسی کوردایەتی بکەن پروپاگەندەیان بۆ تورك دەکرد چونکە لای تورك خواکان ئەوانەی لایەنی ئینگلیز بوون بە جاسوس دادەنران . مێجەر سۆن لە پێشدا بە نهێنی و جلی کوردییەوە کوردستان گەڕابوو فێری کوردیی بووبوو ، شارەزا بوو، بەهۆی خۆبەزلزانیەوە جڵەوی لەدەست دەرچوو دوژمنی پەیدا کرد و زۆری خەڵك بەناوی جادە دروست کردن لە دەوری سلێمانی دانا لە ژێر چاودێریی ( عەزیز خان )دا زۆری خەرجی میریی بۆ ئەم و سۆن چوون. سۆن لە نیشتمانپەروەرو تێگەیشتووەکان بۆتە "قەرەقۆش"[*] باسی فیزی سۆن کە بە بازاڕدا رۆیشتووەو بەهانەی بۆ جەریمە کردن و ....هتد لەبرانەوەنایەت.

لەوکاتەدا سلێمانی وەك مەنجەڵ ئەکوڵا، بۆیە کە سۆن ویستی شەڕ بە شێخ مەحمود بفرۆشێ، شێخ توانیی شۆڕشێك بەرپابکات.

باوکم لە گەشتێکیدا بۆهەولێر لەبەر چاوی یەك دوو حاکمی تری ئینگلیز خراپ تێکچووە بەرامبەر بە بێل و هەندێ قسەی ڕەقی کردووە [*] لەبەر ئەوە کەوتۆتە

---

[*] بڕوانە ل ١٠٨ی یاداشت بەرگی دوو بۆ درێژەی ئەم باسە

[*] ل ١٠٩ لە بەر چاوی حاکمەکانی هەولێرو موسڵ لەسەر قسەیەکی بێ‌فەڕ دەمار رەفیق حیلمی گرتووە بە بێلی وتووە چاوت بکەرەوە من خزمەتکاری باوکت نیم (بە فەرەنسی) " Ouvres Le Yeux " Jenasuie Poo Servetaur de Votre Pere

ئەندێشەوە. دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیە نەچۆتەوە دائیرە بۆ سبەینێ بێل ناردویەتی بە شوێنیدا تکای ئەوەی لێکردووە ئیتر لێی خۆش بێت و ئیزنی بدات بگەڕێتەوە سلێمانی بەڵام بێل زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ وەڵامی داوەتەوەو وتویەتی:" من زۆری پێ ناچێت عیراق بەجێ دێڵم و ئەگەڕێمەوە لەندەن لەبەر ئەوە نامەوێت لەم دواییەدا بە زوویریی لێم جیا ببیتەوە .هەروەها وتوویەتی سبەینێش ئەبێ بچمە رواندز بە وەکیلی حاکمی ئەوێ بۆ ماوەی (١٥) رۆژێك ئەمجارەش لەگەڵم وەرە کە گەڕاینەوە پێتخۆش بوو پێکەوە تا بەغداش ئەچین، لەوێ چەند رۆژێك لەسەر حیسابی من کات بەسەر دەبەین و ئەحەسێینەوە ئینجا من دەگەڕێمەوە بۆ لەندەن ئەوسا خۆت چۆنت ویست وا بکە ،بەڵام نامەوێ جارێکی تر قسەم لەگەڵ کردیت وەك هەولێر وەڵامم بدەیتەوە" بەمجۆرە بێل دیسان رەفیق حیلمی قایل کردووە لە گەڵی بمێنێتەوەو لە گەڵی بڕوات بۆ رواندز.

## رەفیق حیلمی و بێل لە رواندز

کە باسی رێگەو رابواردنی تا رواندز دەکات دەڵێت : لە باتاس لای عەبدوڵڵا پاشای باوکی سەعید بەگ باوکی ئیسماعیل بەگ شەوێکی خۆشمان لە ژێر خێوەتە نایابەکەیدا بردە سەرو بەهۆی دڵسۆزێکەوە لە باتاس ئیسماعیل بەگم ناسیی . ئەمە لە پێشەوە پیاوی ناردووە کە لە رواندز لە ماڵی خۆیدا جێگە بۆ رەفیق حیلمی رێکبخەن لەو رۆژەدا لە گەڵی عەلی بەگ-ەوە بە بەر تاڤگە شیرینەکەی بێخاڵ دا چوونەتە رواندز . ماوەی سەعاتێك حەساونەتەوەو نانیان خواردووە . ئەو شیعرانەی ناوی (وەتەن) نیشتمانە بە تورکی نووسیونی زادەی ئیلهامی ئەو تاڤگە سیحراوییە دڵڕفێنە بووە . دوای گەیشتنی بە رواندز ئەوەندەی پێ نەچووە بەیانییەك گەیشتۆتە دائیرە فنجانێك قاوە لەبەر دەمیا بووە بێل چۆتە ژوورەکەیو لە پشتیەوە بە(تەلەگراف) بروسکەیەکی داوە بە رەفیق حیلمی،ئەویش پاش ئەوەی بێل سەیری کردووەو رەنگی بزرکاوە لە رەفیق حیلمی پرسیووە تۆ شارەزای عەشیرەتی دزلێ هەیت ؟ وتویەتی نەء تەلەگرافەکە بە ئینگلیزی بووە بەڵام باوکم وتویەتی تێگەیشتم بەکوردییەکەی ئەمە نووسراوە"دوێنێ عەشیرەتی دزلێ بە بیانوی زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخەوە هاتنە سلێمانی، حکومەت ویستی رێگەیان نەدا بەڵام بەزۆر هاتنە شارەوە، ئینگلیزەکان گیراون ، فیکری شێخ

مـەحمود نازانرێت؟" مەندوبی سامی بەیانیی بە فڕۆکە چۆتە نزیك شاری سلێمانی بەیاننامەی بۆ شۆڕشگێڕان خستۆتە خوارەوە داوای چاوپێکەوتنی لێکردوون لە ئەنجام ئاگادارتان ئەکەین . شێخ مەحمود بە دزییەوە ڕایسپاردووە، مەحمود خانی دزلی بە (۳۰۰) کەسی چەکدارەوە سلێمانی دەگرن لە ۲۱ی مایسدا .

شێخ مەحمود هەل لەهەستانی عیراق وەردەگرێت دژی ئینگلیزو ئەنجامی یەکەم هەڵمەتی کوردی عیراق بۆسەر ئینگلیز لە٤ نیسانی ۱۹۱۹دا کوشتنی کاپتن (بسن) حاکمی سیاسی زاخۆ دەبێت ئیتر لە هەموو لایەکەوە دژی ئینگلیز هەستان و کەوتونەتە کوشتنیان، کاتێ مەحمود خان سلێمانی داگیردەکات شێخ مەحمود بە ناوی پاراستنەوە ئینگلیزەکان دەخاتە دەبۆکەوە . ویلسن بە فڕۆکە دەچێتە سەریان بە بەیاننامە داوا لە شێخ دەکات بچێتە بەغدا بۆ گفتوگۆ ،حاکمی ئینگلیزی هەڵەبجە هەورامییەکان دەیگرن بەڵام ویلسن بەهۆی خانمی(*) وەسمان پاشاوە بەردەدرێت و خانم بەهۆی ئەمەوە ناو دەنێن (خان بەهادەر) یارمەتیدەری شێخ و شۆڕشی عەشایەری کوردی ئێرانیش یەك دەکەون بۆ دامەزراندنی کوردستانی گەورە .

## خۆفرۆش موشیری سلێمان بەگ

شێخ لە دەربەندی بازیان سەردەکەوێت .لە زەمانی ئاشورییەکانەوە کەس نەیتوانیوە بەو شاخەدا بچێتە ئەودیوی بەڵام وتراوە بە پیلانی موشیری حەمەی سلێمان کە یەکێك بووە لە ڕوئەسای هەمەوەند دژی شێخ ئینگلیزەکان سەردەکەون و لە پشتەوە لە سوپای شێخ دەدەن، شێخ بریندار دەبێت و لەژێر بەردە قارەماندا دەگیرێت ،ئەویش دیسان بە پیلانی ئەم موشیرە(*).

---

(*) ۱۱٦ یاداشتی بەك بەشی دوو

(*) لەم دواییەدا یەکێك لە نووسەران بابەتێکی نووسیبووبەرگری لەم موشیرە کردبوو

## هەواڵی ڕواندز لەو کاتەدا

وەك باسمانکرد باوکم لەگەڵ بێل دەبێت لە ڕواندز، بۆیە ئاگای لە ڕووداوەکانی ئەوێ دەبێت و لەشوێنێکدا دەڵێ "ڕواندز کاتی شەڕی دەربەند خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردووە، بەتەمای ئەوەی شێخ بگاتە کۆیە ،لە داخا ئینگلیز پەرۆش بوون، بێل وەستاوی گرنگ و سامناك بووە تەنها خۆیو معاونەکەیو هێزێکی کوردی بەکرێگیراو بەڵام بە وەستایی جوڵاوەتەوە"هەروەها دەڵێ" گوێنییەك نۆکی بەدەستی من بەسەر ئەوانەدا بڵاوکردۆتەوە، کە چاوەڕێی تاڵانکردنی خەزنەی ڕواندزبوون، بەوە چاو بەرەوژێریکردون و سەرەك عەشایەر ڕۆیشتوون و ئەوانیتریشی کۆکردۆتەوە تا ڕایان بەرامبەر شێخ بزانێت . لەوکاتەدا باوێڵ ئاغای ڕەئیسی هێزەکەی ڕواندز دژی شێخ قسەی دەکات و ڕەفیق حیلمی لێی تورە ئەبێت، بێل-یش لەو تورە ئەبێتەوەو دەڵێ " تۆ وەرگێڕی نابێت تەدەخول بکەیت و لایەنگیریی بکەیت،لێی دەپرسێت ئەوە چی ئەڵێ پێم بڵێ ڕەفیق حیلمی وەڵامی بێل ناداتەوەو هەڵدەستێتە سەرپێ و ڕوودەکاتە باوێڵ ئاغاو ئەوانیترو بەپێی تێگەیشتن و بیرو باوەڕی خۆی ئەو ڕۆژە چی بەباش زانیوە بێ تویکڵ و ئازایانە پێی وتوون و لە جەلسەکە چۆتە دەرەوە[*] ئەمە لە ماڵی حاکمی سیاسی ڕواندز واتە لە ماڵی بێل ڕوویداوەوباوکم ئەو ڕۆژە نەگەڕاوەتەوە بۆ دائیرە، بۆ سبەینێ بێل ناردوویەتی بە شوێنیداو ڕووی خۆش بووەو ڕۆژباشی لەگەڵدا کردووەو قاوەیان خواردۆتەوە وتویەتی " لەکردەوەی [*] تۆ نەڕەنجاوم ئەزانم تۆ هەقت بەدەستەو ئەبێ وابیت، سبەینێش ئەچمە هەولێر چاوم بە سەید تەها دەکەوێت ئەمەوێت تۆیشم لەگەڵ بیت" ڕەفیق حیلمی دەڵێ بێ بیانوو و ڕاستەوڕاست پێم وت "بۆ هیچ لایەك ناچم و ئیتر با بەس بێت و ئیزنم بدەرێ بگەڕێمەوە سلێمانی،ئیزنیشم نەدەیتێ بەبێ ئیزن ئەڕۆمەوە" بێل بێ دەنگ دەبێت، بۆ سبەینێ مەعاشی ئەو مانگەو چەند ڕوپیێەك خەرجی تا کەرکوك دادەنێ بۆ ڕەفیق حیلمی و خۆی دەڕوات بۆ هەولێر، بەمجۆرە لە بێل جیا دەبێتەوە . لێرەدا پرسیارێك لە خۆی دەکات و هەر خۆی وەڵامی دەداتەوە سەبارەت بە

---

[*] ل ١٣٤ یادداشتی یەك بەشی دوو

[*] ئەمەیش هەڵوێستێکی تری ئازایانەی ڕەفیق حیلمیو دڵسۆییەتی بۆ شێخ و کورد

هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵ بێل و بێل لە گەڵیدا کە چۆن بێل هێندەی چاو لێی پۆشیووە؟ ماوە هەبێت لەدوایدا باسیدەکەین دەگەڕێینەوە سەر باسی رەفیق حیلمی و چی بەسەر دێت پاش رۆیشتنی بێل بۆ هەولێر .

## رواندز پاش رۆیشتنی بێل بۆ هەولێر :

رەفیق حیلمی لە رواندز وەك دەستبەسەر دەمێنێتەوە لەماڵ ناچێتە دەرەوە، ئینگلیزو بێل لە هەولێر بەتەما دەبن سید تەها بخەنە جێی شێخ مەحمود .

بۆیە دەڵێ " وەك ئەستێرەی شێخ لە ئەوین بوو منیش کەوتبوومە گێژاوێکی بێ بنی لێکدانەوەوە سەعاتی دەرەکم دەستی کردبوو بە لێدان". ئینجا باسی خانوەکەی دەکات لە ناو باخێکا بووە کەوتۆتە دەرەوەی خۆرئاوای رواندزو بە تاقی تەنیا بەناوی پاسەوانی و خزمەتەوە نووری باوێڵ نەفەرێکی بە تفەنگەوە بۆ ناردووە، شەوان چۆتە ژوورەکەی و راست و درۆ باسی هەواڵی شێخ و ناوبازاڕی بۆ گێڕاوەتەوە. رەفیق حیلمی گومانی لێکردووە هەرچەند خۆی بە کوردخوازو لایەنگیری شێخ داناوەو بەدڵ خزمەتی کردووە بە رەفیق حیلمی وتووە دەتگەێنمە لای شێخ، باوکم ترساوە لەوەی ئەمە فێڵ بێت.

## گیرانی لەرواندزو رەوانەکردنی بۆ بەندیخانەی کۆیە

بێل چوار سوار عەسکەری (لیڤی) بە ناوی پارێزگاریەوە ئەنێرێتە سەر رەفیق حیلمی ، ئەمری پێ دەکات لەگەڵیان بگەڕێتەوە کۆیە، ئەو شەوە دەگاتە کۆیە لەماڵی خۆیدا دەنوێت.لەم کاتەدا (شەفیق)ی برای لە تورکیا دەگەڕێتەوە دەچێت بۆ کۆیە لەگەڵ نۆکەرێك چاوەڕێی رەفیقی برای دەکات بگەڕێتەوە بیبینێت. بەڵام بەیانی عەریفێکی ئینگلیزو پۆلیسێك رەفیق حیلمی لەجێ دەردەهێنن پاش جل گۆڕین دەیبەنە سەرا

هێشتا کەس نەچووە ئینگلیزەکە دەرگای بەندیخانە دەکاتەوەو دەخاتە ژوورەوەو ناهێڵێت شەفیقی برای ببینێت .(*)

## لە بەندیخانەی کۆیە :

زۆر بەوردی‌و دوورو درێژیی باسی بەندیخانەکە دەکات کاتێ لەگەڵ کۆمەڵە بەندییەکی تردا دایدەنێن‌و کاتێ جیای دەکەنەوە بەتەنها ماوەیەك چاوی لێدەپۆشن‌و خواردن‌و کتێب‌و کات بەسەربردنی سەراکەو بینینی هاورێکانی لێ قەدەغەناکەن لەپڕ دەرگاوبانی لەسەر دادەخەن‌و پاسەوانیی چاودێریی توندی دەکەن‌و چوونە دەرەوەی ژوورو بینینی خەڵك یان کتێب‌و کاغەز بردن بۆی لێ قەدەغەدەکەن رەفیق حیلمی بەمشێوەیە باسی ئەو ماوەیە دەکات لە بەندیخانەکەو چارەنووسی دوا رۆژی خۆی دەبەستێت بەکۆتایی کتێبی نوقم بوونی پاپۆری تایتانیك-ەوە کە لەزیندانداو لەوکاتانەدا دەیخوێنێتەوە .

لە سەرەتادا دەیخەنە ناو تاوانبارەکانەوە ئەمانە دەیناسن‌و دەزانن کێیە. لەبەری هەڵدەستن‌و بە کش‌وماتی لە دەوری دەوەستن،ئەویش بەرووی خۆشەوە بۆی روانیوون.

هەوڵیداوە هۆی گرتنی لە کاپتن راندڵ بزانێ سوودی نەبووە . نامەی بۆ حاکمی شار حەمە ئاغاو نائبی جەمیل ئاغا ناردووە وەڵامی نەبووە. کاپتن راندڵ خستویەتی‌یە ژووری تایبەتی بەناوی گوناهباری سیاسییەوە. تاوانبارەکانی ناو زیندان پێیان ناخۆش بووە جیابنەوە لێی، هەروەها رەفیق حیلمی خۆی، پاسەوانی بەردەرگاکەی پۆلیسی نەبووە ئەمانە نێردراون بۆ شەڕی شێخ بەڵکو کرێگرتەبوون. راسپێردراون بینینی خەڵکی لێ قەدەغە بکەن. داوای نوێن‌و کتێبی لە پاسەوانەکەی کردووە لە ماڵەکەی بۆی بهێنێت کەچی هەڕەشەی لێکردووە، پاسەوانەکە دەچێتە لای مودیری پۆلیس ئەو دەگۆڕن یەکێکی بۆ دەنێرن ئەمیان رەفیق حیلمی چی دەوێت بۆی دەکات.

---

(*) شەفیقی برای ئەو کاتە لە ئەستەمبووڵەوە دەگەڕێتەوە سلێمانی کەس‌و کاری ببینێت . هەر لە موسڵەوە پێی دەڵێن دایکی‌و باوکی کۆچی دواییان کردووە. دەچێتەوە سلێمانی تاقە خوشکەکەی لەگەڵ ژنی رەفیق حیلمی لەماڵی خەزووری رەفیق حیلمی دەبێت . لەوێ دەڵێن رەفیق حیلمی لە کۆیە لە بەندیخانەیە، دەچێت بۆ ئەوێ ناهێڵن ببینێت، دەڕواتەوە بۆ تورکیا. ئیتر وابزانم ئەوە دواجار دەبێت‌و یەکتری نابیننەوە .

## ١٨ی حوزەیرانی ١٩١٨ فرایزەر بەرامبەر بە شێخ مەحمود

لەم کاتەدا رەفیق حیلمی هەست بە نەخۆشی دەکات نامە دەنێرێت بۆ راندەڵ داوای نۆژدار دەکات وەڵامی ناداتەوە، دەڵێ ئەو کاتە مامەڵەیان لە گەڵیدا بە پێی هەواڵی شەڕی شێخ و ئینگلیز بووە. هاتووچۆی خەڵك بۆ لای و رەوشتی پاسەوانەکان لەگەڵی و گۆڕانیان هەر رۆژێ ئینگلیز شکستیخواردووە کەوتۆتە خۆشییەوە، کاتێ شێخ شکستیخواردووە بە پێچەوانەوەبووە واتە ئیتر رابواردنی حەوشەو کورسی و مێزو خواردن و میوان و گۆرانی و بەزم و هەرای نەماوە. خەڵکی کۆیە بە تایبەتی لاوەکان سەر بە شێخ بوون.

<u>سدیق ئەفەندی</u> : سدیق ئەفەندی رقی لە باوکم دەبێت (یەکەمجارە ببیستم یەکێك ڕقی لە رەفیق حیلمی بووبێت) رۆژێك لە بەندیخانەکەیدا چوار پاسەوانی بۆ دادەنێن و هاتوچۆی لێ قەدەغەدەکەن ئەم سدیق ئەفەندییە دێتە لای و پێی دەڵێت : وتم ئینگلیزەکان ئامانیان نیە . ئاگات لە دەمت بێت، پاش گەڕانەوەت لە رواندز بەکردەوەی بێجێ و خیانەتەکانیان زانیویت،هەر خوا بکات ئیعدامت نەکەن باشە .

باوکم دەکەوێتە حاڵتێ لەترسەوەو باسی بیرو خەیالاتی دەکات و زۆر بەراوردی نامەی حاجی نەوڕەس دەکات کە لەسەری کردۆتەوە دژی جاسوسەکان و بیر لەژنەکەی و ماڵەکەی دەکاتەوە کە هێشتا تا ئەوکاتە واتا (١٩١٩) هێشتا منداڵی نەبووە .

ئینجا بزانن رەفیق حیلمی کە ١٨٩٨ لە دایك بووە تا ١٩١٩ واتە تەنها (٢١) ساڵ تەمەنی بووە،چ لاوێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو بووەو چۆن ئاوا لاوێتی و ژیانی سەرەتای خۆی خستۆتە لاوەو کەوتۆتە داوی سیاسەتێکی وەك سیاسەتی کاربەدەستانی ئینگلیزەوە کە ئەو کاتە هەرەتی زەبرو زەنگیان بووەو پێیان وتوون (الامبراطورية العظمى) و نیوەی جیهانیان بەدەستەوە بووە.

باوکم بەقسەکانی (مستەر سدیق) زۆر دەکەوێتە ئەندێشەوەو ترسی لێدەنیشێت کە شتێکی وای بۆ رێکخرابێت لەناوچوونی تێدابێت؟ بەمجۆرە دەڵێ بە بیرکردنەوەو هەزاران قسەوباس ویستوویەتی لەلایەن گوناهباریی یان بێ تاوانی خۆی لەسەر

بڕیارێك بوەستێت. وایلێهاتووە زۆر دڵگرا بێت و ئەو شەوە بە برسێتی بچێتە ناو جێگاوەو نەزانێ کەی خەوی لێکەوتووە. نزیك بەیانی بەئاگاهاتۆتەوەو دووبارە کە خەبەریبۆتەوە کەوتۆتەوە ناو دەریای خەیاڵاتەوە.

دەڵێ "رابوردووم وەکو شریتێکی سینەما هاتەوە بەرچاو، سلێمانی، خزمان، دۆست و ناسیاو، ژن وماڵەکەم[*] هەموو شتێکم دوا بەدوای یەك بەتیژیی لە پشت پەردەیەك لە تەمەوە بەبەرچاودا ئەهات و ئەڕۆیشت" هەروەها دەڵێ "دەربارەی گەلێ کەس کەوتمە شکەوە زۆر لە دۆستەکانم وەکو دوژمن هاتە بەرچاو. دارو بەردم کرد بە جاسوس باوەڕم بە چاکەو ڕاستی و خێر نەما. لاوێکی کەم ئەزموون بووم، لەمردن ئەوەندە باکم نەبوو خەفەتی ئەوەم ئەخوارد کە دونیا بەشەڕو بە خراپە داگیرکرابێ. ماتەمینی ئەیگرتم ئەوانەی بەسووکم ئەهاتنە بەرچاو بتوانن سەرکەون و بە فەوتانی من بڕوا بە هەستی خۆیان بکەن و لەشکری شەڕو خراپە بەوان بەهێزبێ" .

ئینجا باسی ئەو کتێبە دەکات کە لە تەنیشتی جێگەکەی بووەو گرتویەتی بەدەستییەوەو لەسەر گازی پشت کەوتۆتە خوێندنەوەی کە بەتورکی بووە. ئەم کتێبە سەعید فەوزی شاعیری سلێمانی لەگەڵ هەندێکی تر بۆیناردۆتە بەندیخانەکەی . باسی نوقم بوونی کەشتیەك بووە کە هەندێ لەسەرنشینەکانی رزگاریان بووە بەهۆی ئەوەی بەسەر پارچە تەختەوە بوون، ڕەفیق حیلمی سەرئەنجامی خۆی بەچارەنووسی ئەوانەوە دەبەستێتەوە. ئەوکەشتیە (تایتانیك) بووە، وەك لە پێشەوە وتومانە، رانەوەستاوە تادوالاپەرە هەمووی بەیەکجار خوێندۆتەوەو وتویەتی " ئەبەد ئەوەندەم بێ ئۆقرەیی بەخۆمەوە نەدیوە".

بەیانی زوولە حەوشە، ئینگلیزێکی تەپلە بەسەر دەبینێت پۆلیسێکی لەگەڵدا دەبێت دەترسێ و لەدڵی خۆیدا دەڵێ ئەمە چییە، هێشتا کەس نەهاتووە بۆ سەرا؟ نۆبەچیش هێشتا لەخەودا بوون، لەچی ئەگەڕێن، ئەوا ڕوویان کردە ژوورەکەی من ؟ نزیك بوونەوە، ڕاست ڕووەو ژوورەکەی من هاتن، یاخوا خێربێ ئەوا بەژوور سەرمەوە وەستاون با هەڵسم بزانم چییان ئەوێت؟ دڵم دەستی کرد بە ترپە ترپ و ڕەنگم سوور هەڵگەڕا. هەستم

---

[*] ل ١٥٤ یاداشتی یەك بەشی دوو ئەمە یەکەمجارە باسی ماڵ و ژنی بکات ئەویش کە گەیشتۆتە تەمەنی (٢١) ساڵی، پێش ئەمە ناوی کەسی نەبردووە تەنانەت نەبینی براکەشی کە چۆتە لای بۆ کۆیە .

کرد خوێن هورووژمی برد بەرەو سەرو مێشکم ... کابرای ئینگلیز پاش رۆژ باشێکی ساردوسڕ وتی ئادەی سنگت بکەرەوە تاقە فانیلەیەکی تەنکم لەبەردا بوو، پشکنینی بۆ سنگ و پشتم کرد. هەروەها دەڵێ "لەم کاتەدا دووبارە بیری سلێمانیم کردو وتم: ئاخوا ژنو کەسو کارەکەم ئەزانن ئێستا من لە کام لاو لە چیدام ؟! ئایا ئەزانن کەوا دەمبەنە پای قەنارە؟! چونکە من ئەمزانی پیشەی ئینگلیز وایە لە پێش شەبەقدا گوناهبار ئەخنکێننو لەپێش خنکاندنیشی ئەبێ پزیشك بیبینێ " لەژێر کاریگەریی ئەو قسانەی سدیق ئەفەندی دا بیری ئەوەی نەماوە کە بەنامە داوای نۆژداریکردووە کاتێ هەستی بەنەخۆشیی کردووەو ئەمە وەڵامی ئەو نامەیە بووە. ئینجا بزانن ئەم لاوە گەنجە لە چ کێشەو ئەندێشەو دەردەسەریو مەترسییەکدا بووە لە پێناو خەباتی سیاسیو خۆبەختکردندا بۆ گەلەکەیو نەتەوەکەی، درێژەی باسی ئەم رووداوە لە ل ١٤٢-١٦٣ی یاداشتی بەرگی یەکەمو بەشی دووەمدا دەخوێنێتەوە، نۆژدارەکە رانداڵ ناردویەتیو رافیق حیلمی دەڵێ واتە بەخوتو خۆڕایی کەوتبوومە دەریایەکی بێ سنووری ئەندێشەوە.

دکتۆرەکە هەندێ دەرمانی بۆ دەنووسێتو خواردنی تایبەتی دەدەنێو بەدزییەوە رێی کتێبو کاغەزو ئەو شتانەی لێ ناگیرێت کە بۆیبچێتە ژوورەوە دەڵێ "قەرەوێڵەیان بۆ دانام لەبەر ئەوەی ئەوئەرزەی لەسەری نوستبووم تائەوکاتە شێداربوو. ئیتر کەمێك سەری رەحەت دەبێتو کاتەکەی بە خوێندنەوەو نووسینەوەکانی بەسەردەباتو دەڵێ لەو رۆژانەدا زۆر شتم بە تورکی نووسیوە .دوای رۆیشتنی دکتۆرەکە لە ستایشی یەزدانا قەسیدەیەك دادەنێ مسوەدەکەی لەسەر کاغەزە بۆرە ئەستوورەکانی زەمانی ئینگلیزبووە، لەگەڵ هەندێك هەڵبەستی تر . ئەمە لەگەڵ دیوانی (شیعرلرم) کە ساڵی ١٩٢٤ داویەتی بە چاپخانەی نەجاحو دایناوە بۆ لە چاپدان لە بەغدا لە چاپدراوە بەڵام ئینگلیزەکان فەوتاندویانە .

لەدواهەمین بەیتی ئەو قەسیدە تورکییەدا وتوویەتی:

اولما سەیدی فکرمی تحدیدە باعث محبسم (*)

شمدی تاعرش مجیدە بلکە جیقمشدی سم

---

(*) ل ١٥٨ بەشی دووەمی یاداشتی یەکەم.

# عەبدوڵلائاغای حاجی تایەر ئاغای حەویزی

لەپاشدا باسی ناودارێکی کۆیەی کردووە بەناوی عەبدوڵلا ئاغای حاجی تایەر ئاغای حەوێزی کە سەر بە شێخ مەحمودبووەو ئینگلیز چارەی نەویستووەو بزێوو زمان درێژ بووە بەڵام رەفیق حیلمی خۆش ویستووەو بیستویەتی بەتەمای ئیعدام کردنین بۆیە بریاریداوە دەربازی بکات. پاش شەوی دکتۆرەکە پیاوێکی عەبدوڵلا ئاغا بەدزیەوە ئەچێتە لای رەفیق حیلمی و پێی دەڵێ لە نیوەشەودا ولاغ و سواری بۆ دەبەنە ژێر دیواری سەراو پۆلیسەکانیش تەمێ کراون چاوی لێ بپۆشن تا دەگاتە سوارەکان و لەگەڵیاندا دەڕوات و دەیگەیەننەوە لای شێخ مەحمود. باوکم ئەم تەگبیرەی بەدڵنابێت، چونکە بەهۆی هاتنی دکتۆرەکەوە کەمێ ترسی نەماوە و چونکە هیچ بڕوایشی بە کەس نەماوە بەهۆی ئەوەوەی کە پێشتر لەبەر خۆشباوەڕیی تووشبوو بوو دەڵێ" ئەم بێ باوەڕیەشم خێری تیابوو" ئەگەر شەوێك لەوە پێش بوایە لەوانەبوو ئاگریش بوایە خۆمم تێ فڕێدایە. بەڵام ئەوشەوە هیوای رزگاربوونم تازە بۆتەوە "بۆیە وەڵامی پیاوەکەی بە سوپاسەوە داوەتەوەو تکای لێکردووە واز لەو بیرکردنەوەیە بهێنێت.

ئینجا دەڵێ رۆژی بەپەنجە ژماردووەو چاوەڕوانی پێشکەوتنی شێخ بووەو پەڕینەوەی هێزەکانی بۆ کۆیە وایزانیوە کە تا شێخ بەتەواوی سەرنەکەوێت و شۆڕش هەموو هەرێمەکان نەگرێتەوەو ئینگلیز کوردستان بەجێ نەهێڵێت ئەو لە بەندیخانە رزگاری نابێت یان لە پڕێکدا لەناوی ئەبەن، نەیزانیوە لەوەدا بەهەڵە چووە چونکە ڕزگاریی ئەو بەداخەوە بەستراوەتەوە بە گیرۆدەیی شێخەوە هەرلەبەرئەوە کە بەیانیی رۆژی هەینی مانگی حوزەیران ١٩١٩ جارچی لە بازاڕی کۆیە جاڕی داو وتی شۆڕشی شێخ توایەوە رەفیق حیلمی دەڵێ " کە ئەم پەیامە کوشندەو جەرگبڕەم پێ گەیشت گێتی بەجارێ لەبەر چاوم تاریك بوو لەدوو سەرەوە ماتەمینی دایگرتم،بۆ گرفتاریی قارەمانێکی کوردو فەوتانی خۆم" بۆ سبەینێ خەڵك چوونە سەرا بۆ چاوڕوونی راندەڵ باوکم بۆ ئەمە دەڵێ : "من لەبەر خۆمەوە ئەگریام بۆ ئەنجامی رەشی حوکمداری کوردستان و بۆ کەساسی و سیاچارەیی خۆم فرمێسکی گەرمم ئەڕژاند، ئەو رۆژە ئەنجامی شێخ ئەنجامی کوردو کوردستان بوو منیش کۆستکەوتووی لێ قەوماوی قەومی

کورد بووم چی لە دەستا بووە تا بیکەم هەر ئەوەندەنەبیٚ دەرگای ژوورەکەم داخستوو بەدەمدا کەوتم تا زەماوەندی سەرنگومکردنی لەشکری کورد تەواو بوو ".

## بەربوونی لە بەندیخانە :

لەو دەمەدا لە بەندیخانەکە ڕێیاندا خواردنو کتێبو ئاوی خۆشتنی بۆ ببەن بەڵام بۆی نەبوو ریشی بتاشیٚ. دوای گیرانی شێخ بە بریندارییی ڕەوانە بەغدا کرا لەو کاتەدا باوکم ئیتر هیوای بەربوونی نەما، کاتبی تایبەتی راندالٚ دەچێتە لای (محەمەد ئەفەندی) ئەویش دێتە لای باوکمو مژدەی دەداتیٚ کە حاکمی سیاسیو حاکمی شار کۆبوونەتەوە خەریکن بڕیاری بەردانی دەردەکەن، ئیتر ناردویەتی دەلاکیان بۆ هێناوەو سەرو ریشیان تاشیوە. ئینجا ناسیاوەکانی پۆل پۆل چوونەتە لایو مژدەی بەربوونیان داوەتیٚو دواتر کاپتن راندەلٚ دەنێرێت بە شوێنیدا بروسکەی بێل-ی پیٚ نیشاندەدات کە بۆ ئەو نووسراوەو هەندێك بەسەریدا دێتو ئینجا پێی دەڵێت دەتوانیت بچیتەوەماڵی خۆت. بیرمان دەخاتەوە دەڵیٚ شەوی پێش ئەمە گەیشتۆتە خوێندنەوەی کۆتایی کتێبی پاپۆڕەکەو دەرکەوتووە ئەوانەی بەسەر تەختەکەوە ماون رزگاریان بووەو چوونەتەوە لای ماڵو منداڵیان دەڵیٚ کە ئەمەی خوێندۆتەوە زەردەخەنەیەکی نائومێدیی گرتویەتیو بەزەیی بەخۆیدا هاتووە . کە ئەنجامی رەشی خۆی بە ئەوانەوە بەستووە !

ئیتر باسی موحاکەمەی شێخو ناردنی بۆ ئەندامان دەکاتو باسی وەزعی سیاسی ئەو کاتە دەکات.

باسی نەگەیشتنی نوێنەری شێخ بۆ لای شەریف پاشاو موئتەمەری ئاشتیو باسی واز نەهێنانی کۆمەڵە کوردییەکانی تورکیاو هەوڵو تەقەلایان دەکات بۆ سەندنی مافی کورد لە موئتەمەری ئاشتیو (١٤)بەندەکەی دەستووری ویلسنومافی سەربەخۆییو گفتی کلیمانصو سەبارەت بەوەی کە تورك ناتوانێت ئیدارەی نەتەوەکانی تر بکاتو ترسانی تورکیا لە هاندانی کوردەکان دژی تورك تا کورد دیسان بەناوی برایەتیو ئیسلامەتیەوە هەڵبخەڵەتێنو نەهێڵن هەل لەو هەموو تەقەلایانە وەربگریٚ بۆ وەرگرتنی مافی خۆی بۆیە تورك لیژنە دروستدەکەن گوایە بۆ ئەوەی بزانن کورد چی دەویٚوخۆیان بڕیار دەدەن کورد حوکمی زاتی بدرێتیٚ یان نا بەڵام هەر زوو وەزارەت دەگۆڕدرێتو وەزیری تازە ئەم بڕیارەش پووچەڵ دەکاتەوە.

لەولاوە مستەفا کەمال لە گێژاودا بووە، حکومەتی خەلیفە لە ئەستەمبووڵ و دەورەدانی کوردەکان بەناوی حوکمی زاتییەوە بۆیان، دوژمنی خۆی پیلانی سوێند خۆرەکان دژی مەترسی هەڵگەڕانەوەی کوردەکان کە (٦) ویلایەتیان گرتۆتەوەو لەدەست چوونی ئەوانە ماڵی وێران دەکات بۆیە کە هێشتا موئتەمەری ئاشتی سێڤر لەکاردا بووە هەوڵیداوە ئەویش کوردەکان هەڵخەڵەتێنێت و تەفرەیان بدات تالێی جیا نەبنەوەو ببنەوە بەدۆستی، لە ولاتی قەومی کوردا سەری بۆ رزگاری تورك بەرز دەکردەوە، لێرەدا رەفیق حیلمی دەڵێ کوردەکان لەم کاتەدا پەیمانی سەربەخۆیی کوردستانیان بەدەستەوەبووەو ودوور نەبووە ئەمە بکەن بەبەڵگە بۆ زیندوو بوونەوەی قەومی کورد بەڵام کوردەکانی ئەنادۆڵ وایاننەکردووەو بەقسەی مستەفا کەمال تەفرەیان خواردووە و ئەمیش وەك حکومەتی ئەستەمبووڵ لە پێشدا بە ناوی ئاینەوە لە موسڵمانەکان نزیك بۆتەوەو کوردی بە برای تورك داناوە وپەیمانی بە کورد داوە پاش شکانی یۆنانییەکان بێگومان بە یارمەتی کوردەکان، کوردستانێکی وا دائەمەزرێنێت ببێتە هۆی برایەتی و یەکێتی هەردوو قەومەکە بەمجۆرە کوردی ساویلکە(*) شەڕی ئیستیقلالیان بۆ تورك و مستەفا کەمال کردو مافی خۆیان فرۆشت بە قسەی هیچ و بێ بنەما(*) وئەوەبوو لە موعاهەدەی لوزاندا لەجیاتی مافدانیان بە کوردو کوردستان ولاتەکەیان دابەشکرد بەسەر سێ دەوڵەتدا کەیەکێکیان تورکیایە.

ئینگلیزەکان و هاوپەیمانانیشیان و نۆئێل -یش دەرکەوتووە ویستویانە کوردەکان دامرکێننەوە تا شەڕنەکەن و ئاژاوە نەنێنەوە چاوەڕێبکەن تا وەزعی تورکەکان بەتەواوی دەرئەکەوێت و کوردەکانیان بەتەما کردبوو ئەگەر بەدڵی ئەوان کۆتایی هات ئەوا تورك ناچار بێ سێ بەندەکەی سێڤر بەجێ بهێنێت و کورد شتێکی دەستبکەوێت. بەڵام لەشەڕی یوناندا مستەفا کەمال سەرکەوت و ئینگلیز ناچار دەستیان خستە دەستیەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان و مافی کوردیان پێشێلکرد بە هەمووان و هەموو شتێکیان گۆڕییەوە

---

(*) زابتێکی کورد لە تورکیا گێڕاویتیەوە پاش شەڕکردنی کوردەکان بۆ تورك،هەموو ئەو زابتە کوردانەی شەڕیان بۆ کردون دواتر زیندە بەچاڵیان کردون .

به واز لێهێنانی تورك له موسڵ كه نەوتی تیدابوو ئەو نەوتەی كەهەردوولا چاویان تێ بڕیبوو .

## سلێمانی پاش شکانی شێخ مەحمود

سۆن به ئەنجامی خۆی گەیشت و ئەو پرۆگرامەی كۆلۆنێل ویلسنی حاكمی گشتی عیراق پێی سپاردبوو دوای خوێن ڕژاندنێکی زۆر لە هەردوولا (ئینگلیزو كورد) جێ بەجێی كرد. سۆن بوو بە حاكمی بێ شەریكی هەرێمی سلێمانی و ئینگلیزەكان گەڕانەوە سلێمانی. سۆن دوژمنی تورك بوو بەلام ڕێی به كورد نەئەدا كه بۆ كوردستان تێبكۆشن. هەرچەند شێخ مەحمود نێردرا بۆ هیندستان بەلام بەوە نەتەوەی كورد بۆ دوا ڕۆژی كوردستان دەستی له تێكۆشان و تەقەلا هەڵنەگرت .

ڕەفیق لەیاداشتەكانیدا باسی حوكمی فەرامۆشكراوی ئینگلیزەكان بە تایبەتی مێجەرسۆن دەكات و هەڵگیرسانی شۆڕش له عەمادیەو عەقرە .

بێل ئەچێت بۆ لای فارس ئاغای زێباری، بەرزانیەكان كه ناڕێك بوون لەگەڵ زێباری دا لەمە دەكەونە گومانەوە بۆیە له ڕێگە بێل و معاونەكەی دەكوژرێن و٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٩ له هەموو لایەكی كوردستانەوە دەنگی ناڕەزایی دژی ئینگلیز بەرز دەبێت. هەرێمی سلێمانی-ش له ئیدارەی ئینگلیز بێزار بوو، سۆن له ڕووی فیزو غرورەوە ئیدارەی له دەست دەرچووبوو بۆیە وا دیاربوو كه ئەو هەرێمە دیسان شۆڕشێكی تری تیا سەرهەڵدەدات.

سۆن یەكەم كەس بووە فەرمانیداوە له سلێمانی به كوردیی ڕۆژنامە دەربچێت كه ئەویش ڕۆژنامەی (پێشكەوتن) بوو كه بەزمانی كوردیی بوو بۆیە له سلێمانیدا دەخوێندرایەوە تیاشیدا دەنووسرا هەروەها به هاندانی سۆن هەندێ نووسەر كەوتبوونە نووسینی كوردیی پەتی و پاداشتی دانابوو بۆ ئەوانەی به كوردیی پەتی دەیاننووسی بۆیە ئەوانەی له (پێشكەوتن)دا دەیاننووسی پێیان دەوترا بۆ پارەو پاداشت لەسۆن چوونەتە پێشەوەو كاریانكردووەو نووسیویانە،پێیان وابووە ئەم پرۆژەیە لەپێناوی كوردا نەبووە هێندەی دژی تورك و توركخوازەكان بووە. بەمەش دوژمنی زیاتریان بۆ سۆن پەیدا دەكرد،لەئەنجامی ئەم سیاسەتەدا سۆن بوو بە هۆی فیتنەو ئاژاوە لە

کوردستانداو بووبە هۆی بیرکردنەوە لە دامەزراندنی مەجلیسێك بۆ ئیدارەی هەرێمی سلێمانی.

## مەجلیسی ئیدارەی هەرێمی سلێمانی

کاتێ سیاسەتی ئینگلیز بە تایبەتی سیاسەتی سۆن لە سلێمانی بووە مایەی ئاژاوەنانەوە بۆیە لەوهەرێمەدا بیر لەوەکرایەوە ئەنجومەنێك (مجلسێك) دابنێن بۆ ئیدارەی هەرێمی سلێمانی،تا یارمەتیدەری حاکمی سیاسی بێت بەسەرۆکایەتی حاکمێك و١٢ ئەندام، ئەوەبوولە (١٩٢١-١٩٢٢) لە سلێمانی دامەزرا.

رەفیق حیلمی دەربارەی ئەمە دەڵێ [*]"ئەهالی سلێمانی چەند کەسێکیان هەڵبژاردووە بە مەزبەتەی جیا جیاو داویانە بە حاکمی سیاسی، گوایە ناوی رەفیق حیلمیشی تیدابووەو دەنگەکانی بۆ ئەو دراون لە ئەوانی دیکە زیاتر بووە بەلام پێش دەرکەوتنی ئەنجام ( جەمال عیرفان) کەخۆیشی یەکێك لەوانە بووە یەك دووجار چۆتەلای و پێی وتووە لە زمانی حاکمی سیاسییەوە داوای لێ ئەکات خۆی بکێشێتەوەو مەزبەتەکە وەرگرێتەوە. بەناوی خۆیشییەوە ویستویەتی رەفیق حیلمی تێبگەیەنێت کە لە گەڵ ئینگلیزدا هەڵناکاتو خزمەتی ولاتی پێ ناکرێت. دوایی کاپتن هۆڵت دەنێرێت بە شوێن باوکمداو بە تکایەکی تێکەڵ بە هەرەشە دەیەوێت پەشیمانی بکاتەوە بە بیانووی ئەوەوەی کە لە رێی تەدریسەوە خزمەتێکی باشتردەکاتو داوای لێکردووە کە مەزبەتەکە وەرگرێتەوە بەلام ئەم قسانە هەر کەڵکیان نەبووە دوایی نامەیەکی رەسمیی بە مۆری کاپتن هۆڵت-ەوە وەردەگرێت کە تیایدا نووسراوە ( لەبەر ئەوەی لەوەدا شك نییە کە لە رێگەی وانە وتنەوەوە بە لاوان و قوتابیانی ولات خزمەتتان پێ خۆشەو بە خزمەتێکی تری ناگۆرنەوە ئەو مەزبەتەیە کە ئێوەی پێ هەڵبژێردراون بۆ ئەندامی مەجلیسی ئیدارە بەکارمان نەهێناو پووچەڵمان کردەوە) لەم کاتەشدا کۆمەڵەی نهێنی دامەزراوەو چەند هەوڵیانداوە یەکێك هەڵوەشێننەوە یەکێکی تر جێی گرتۆتەوە. ئۆزدەمیر چۆتە رواندز تا عەشایەر لە ئینگلیز هەڵبگێرێتەوە . [*]

---

[*] ل٣٢ یاداشتی دوو بەشی یەك.

[*] ل ٣٤ یاداشت- بەرگی دوو بەشی یەکەم .

حوزەیرانی ١٩٢٢ ئۆزدەمیر لەگەڵ عەلی شەفیق دەچێتە رواندز تا عەشایەر لە ئینگلیز هەڵبگێڕێتەوەو ببنە تورکخواز و پارەی زۆر دەبەشێتەوەو بەکرێ چەتەی کورد دەکات بە عەسکەر. ئەگەرچی زابتو نەفەری تورکی لەگەڵ دەبێت .بە درێژی ئەم باسە لە یاداشتی–بەرگی دوو بەشی یەك دا بخوێننەوە.

لاوان کۆمەڵەیان دامەزراندووەو کەوتوونەتە وێزەی ئینگلیز. جاسوسەکان لە نیشتمانپەروەرەکان بەداخ بوون، لەلایەك ئینگلیزو لەلایەك ئۆزدەمیر ئاسایشی تێکچووە،لەبەرئەوەی مەحمود خان دووبارە سەر بەرزدەکاتەوەو بەهۆی درێژەی هەڵسانی عەقرە و عمادیەو گەلی مەزورگەو سوارە تووکەوبەهۆی کوژرانی چەند زابتێکی ئینگلیز ەوە.

## پاش بەربوونی لە بەندیخانە

بە یارمەتی (ئەحمەد ئاغا کەرکووکی زادە)ی خزمیەوە لە قەیسەریی نەقیب دوکانی عەتاریی داناوەو خەریکی کاسبی بووە.لەگەڵ ماجید مستەفای هاوڕێی مەکتەبیو تۆفیق وەهبی کەهەردووکیان تازە لە ئەستەمبووڵ هاتبوونەوە شەوانە لە ماڵی تۆفیق وەهبی کۆدەبوونەوە چونکە ئەم ماڵو ژنی نەبوو لە خانووی رەشید مەستی خاڵیدا بوو.

ئەمان گومانیان کردووە سلێمان خان جوولەکە بێت وەك ئەحمەدی عەزیزئاغا وتویەتی ، پاشان زانیویانە ڕاستە جوولەکەیەوئەم سلێمانە دواتر چۆتە لایانو رەفیق حیلمی دەڵێ لەم سلێمان–ەوە فێری قسەکردن بووین بە فارسی و زۆرتر لە من نزیك دەبوەوە هەرچەند لێی بە شك بووم .

**کینەی مێجەرسۆن لە کورد:**

هەمیشە لە پڕ خەفیە چۆتە سەر ئەو لاوە کوردانەو ئەوان بەسەرخۆشی شتیان وتووە، مێجەرسۆن لێیان خۆشبووە. خەفیەکان زیاتر لە ماجید مستەفاو رەفیق حیلمیو مەحمود جەودەت بەکین بوون. رەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا دەڵێ سۆن ویستویەتی عاقڵمان بکاتو بۆ هەل گەڕاوە، یەك دووجار چوونەتە پۆلیسخانە بەلام "تێیان هەڵنەداین" دەیانزانی لەناو خەڵکا خۆشەویستبووین.

باوکم شەوو رۆژ لەگەڵ ماجید مستەفا بووە خۆیان لە سۆن دوورە پەرێز گرتووە، کە بینیویانە لە دوورەوە خۆیان لاداوە لێی . نەیانویستووە کڕنووشی بۆ ببەن و ترساون کەتنێکیان پێ بکات. رۆژێك لوتیان بووبە لووتیەوە، گەڕۆکەکەی وەستاوەو ئەمانیش سڵاویان لێ نەکردووە .سۆن لە پیاوەکەی خورپیووە وتویە:" ئەوانە بانگکە "ئەویش بانگی کردوون. باوکم ویستویەتی بچێتە پێشەوە ماجید نەیهێشتووە، چونکە ترساوە لەوەی هەڵبچێت. سۆن پرسیویەتی بۆ سڵاوتان لێ نەکردم؟ ماجید لە وەڵامدا وتویەتی بۆ چی بیکەین؟ سۆن وتویەتی: من ناناسن؟ ماجید وەڵامی داوەتەوە بەڵێ دەتناسین.سۆن وتوویەتی کەوابوو چۆن سڵاو ناکەن؟ ئەویش لەوەڵامدا وتوویەتی هەر کاتێك هاتین بۆ کارێك یا عەریزەماندا بۆ وەزیفەیەك بۆمان مەکە و گەڕاوەتەوە بۆلای رەفیق حیلمی و رۆیشتوون. ماجید لەو دەورەدا لاوێکی خوێن گەرم و هەڵەشە بووە. لەو نیشتمان پەروەرانەبوو کە بەپەنجەی دەست دەژمێردران.

## رەفیق حیلمی و ماجید لەژێر چاودێریی دا

مستەفای حاجی برایم ئاغا مفەوەزو قۆمیسەر دەبێت، لە چایخانەی مەجۆلی خانە سنەیی بە باوکم دەڵێ ئاگاداری دەمیانبن چونکە خەفیە(جاسوس) دانراوە بۆ چاودێری کردنیان. ماجیدو مەحمود دەخرێنە بەندیخانەوە کاتێ عەونی حاجی گوروون دەبێتە مودیری پۆلیس. ئەمیش کە زانیویەتی خەریکی گرتنی کەسێکن هەواڵی بۆ ناردوون تا خۆیان دەرباز بکەن،لەوکاتەدا تۆفیق وەهبی چۆتە بەغداو بووە بەزابت لەوێ .

ئیتر باوکم، ئەحمەد ئاغای خزمی دەنێرێتە دوکان بۆ لای گوایە عەونی خەبەری داوەتێ کە نۆرەی هاتووە بیگرن. وا ئەحمەد ئاغا وڵاخی ئامادەیە پاش نانخواردن دەچن بۆ بەغدا .

### بەرەو بەغدا:

رەفیق حیلمی و ئەحمەد ئاغاو ئەحمەدی سەعەی فەتاح بە سواری وڵاخ بە رێی سەگرمەدا بەرەو بەغدا دەڕۆن. پاش سەعاتێك سەرخەوشکاندن نیوەشەو رێگا

دەگرنەبەرو بەیانی لە بێستانی گوێ چەمی شاخی ئیمام شاسوار، شووتی دەخۆن و دەچنە کفری لەوێ ولاخەکان لە ماڵی کاروانچی ئاشنای ئەحمەد ئاغا بەجێ دەهێڵن و بە شەمەندۆفێر دەچن بۆ بەغدا .

ڕەفیق حیلمی زۆر بە دوورو درێژی باسی ئەو سەردەمە دەکات بۆ درێژەی ئەو باسانە بڕواننە یاداشتی بەرگی دوو بەشی یەک و بەرگی دوو بەشی دوو .

باسی پاش جەنگی یەکەم ١٩١٤-١٩١٨ و دابەشکردنی وڵاتان و ئینتیداب دەکات و باس لەوەشدەکات عیراق چۆن بوو بە موڵکی ئینگلیزو عوصبەتولئومەم چۆن دامەزراوباسی ١٤ بەندی ویلسن و موئتەمەری ئاشتی و شۆڕشەکانی کوردو عەرەبی عیراق ١٩١٩-١٩٢٢ و شۆڕشی گەورەی عەرەبی عیراق ١٩٢٠ و موجتەهیدەکانی شیعەو کۆمەڵە سیاسییەکان دەکات [*] ئینجا دەڵێ حوزەیرانی ١٩٢٠ نوێنەری کۆمەڵەی ( حەرەسی ئیستیقلال )و ئەلعەهد لە ماڵی (حەمدی پاشای بابان) لەحەیدەرخانە کۆبوونەوە .

دیسان حوزەیرانی ١٩٢٠ کاتبی ئەوقافی بەغدا ناوی عیسا عەبدولقادر [*]بووە لە مزگەوتی حەیدەرخانە شیعرێکی خوێندۆتەوە شیعرێکی نیشتمانی ئێجگار بەهێز بووە،هەموو خەڵکەکەی هێناوەتە خرۆش و هاوار کردن بڕوخێ ئیستیعمار و هەریەکە بووە بە عیسایەك ئەمە لە وەزیفە دەرکراوەو خراوەتە بەندیخانەوەو بۆتە نیشتمانپەروەرێکی ناودار ئیتر نیشتمانپەروەریی بۆتە پیشەی گەلێك لە لاوەکان و ئینگلیز بێ دەنگ وەستاون تا عەشایەر کەوتوونەتە شۆڕش ئینجا لەپڕ داویانە بەسەر ماڵی ئەندامانی ئەوکۆمەڵانەداو گرتن و ڕەوانە کردنیان بۆ هەنجام باوکم چەند وێنەیەکی تر پیشاندەدا باسی وروژانی خەڵکی بەغداو کۆبوونەوەی کۆمەڵەکان لە مزگەوتەکاندا دەکات بەناوی مەولودەوەو باسی وتارو شیعری (مەهدی ئەلبەصیر) لە مزگەوتی حەیدەرخانە دەکات و دەڵێ جۆرە پەخشانێکە پیاو دەتوێنێتەوە(*) ئینجا دێتە سەر باسی خۆی چۆن فرمێسك بەچاویدا هاتۆتە خوارێ، بەسەرو سنگیدا ڕێچکەی

---

(١*) ل ٦٠-٦٩ یاداشت- بەرگی دوو بەشی یەك هەروەها.

(٢*) ل ٤١ یاداشت بەرگی دوو بەشی یەك بڕوانە وەسفی ڕەفیق حیلمی بۆ باسی خرۆشانی خەڵك بەو خوتبەو شیعرە.

بەستووەو هەموو گیانی  هاتۆتە لەرزین، چۆن ئەو خەڵکە لەناو مزگەوتو لە دەرەوەیدا کەوتونە هاوار و دروشم لێدان(*).

## چونی بۆماڵی کۆنە قایمقامو خرۆشانی بەغدا :

باوکم لە گەڵ هەندێك هاورێی وەك کەریمی برای ئەحمەد ئاغا کەرکووکیو هەندێك لەلاوان دەچن بۆ ماڵی مستەفا بەگ،ئاشکرایە کە چوون بۆ کۆبوونەوە لە گەڵ ئەندامانی کۆمەڵە عەرەبییەکاندا. هەر چاوەرێیانکردووە مستەفا بەگ بچێتەوە ماڵێ لەوێ نەبووە هەر سوودی نابێت لەپڕ گوێیان لە دەنگێك دەبێت هەموو ڕاست دەبنەوە ئەو وا دەزانێت مستەفا بەگ هاتۆتەوە سەیری کردووە هەموو بەرەو کۆڵان ڕایانکردووە ئەویش بە دوایاندا ڕۆیشتووە. سەیری کردووە شەقامەکانی شار خرۆشاوەو تەقو هوڕو ترسو هەرا دەستی پێ کردووە. ئینگلیز ئەو ڕۆژە دەدات بەسەر ماڵی ئەندامانی کۆمەڵەکاندا لەبەغدا ودەستدەکات بەزیندانی کردنو ڕۆژنامە داخستنو هتد (*)ڕۆژنامەی (ئیستیقلال) دادەخرێت ڕوئەسای تەحریری عەبدولغەفور بەدریو قاسم علوی دەخرێنە بەندیخانەوە.سەبارەت بەمە ڕەفیق حیلمی دەڵێ " بەوە ئەو دەنگە دلێرە تاقانە نیشتمانپەروەرەی شۆرشی ١٩٢٠ کپکرا -خنکێنرا" لەگەڵ ئەوەشدا باسی عیراق بەگشتی دەکات و هەستانی عەشایەر لە هەرێمی فوراتو دیالەو کفری بە چەکەوە بۆ سەر شارەکان و لەشکری ئینگلیزو هتد ...

---

(*) بڕوانە درێژەی ئەو باسە هەمان سەرچاوە. بڕوانە باسی (قاسم علوی) ئەمە هاورێ عەرەبەکەی پۆلی بووە لە عەسکەریەی بەغدا .

## رەفیق حیلمی و حەمدی بەگی بابان و کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد : (*)

"١٩٢٠ کاتێ کوردستان و عیراق قوڵپیان دەدا ئینگلیز بەتەمابوو حەمدی بەگی بابان بخاتە جێی شێخ مەحمود، کە ئەوکاتە دوورخرابووەوە بۆ هیندستان. حوکمی قەرەقوشیانەی مێجەرسۆن و مەسەلەی کورد هەر نەبڕایەوە، ئاگری شۆڕشی لە گشت کوردستان و لە عیراق هەڵگیرساندو سەرکەوتنی مستەفا کەمال لە تورکیا ئینگلیزی نابووتکرد" ئەمانە دیسان کەوتنەوە سەر بیری دامەزراندنی ئیدارەیەکی تایبەتی بۆ کورد سەی تەها نەهاتبوو بە دەنگیانەوە چەند مەرجێکی بۆدانابوون تا قایلبن بە دڵیان نەبووە " گەڕان بۆ یەکێك لە قەومەکەی زیاتر بۆ خۆی بکات. کە چاوی لە زیندوو کردنەوەی خانەوادەی بێ بە یارمەتی بێگانە، بۆیە حەمدی بەگی بابان بە باشترین کەس دادەنێن"

## پەیوەندیی بە حەمدی بەگی بابانەوە

باوکم دەڵێ" لەم دەورەدا لە بەغدا بووم(*) هەر ناوی حەمدی بەگم بیستبوو" ئەمە خۆی لەو کوردانە نزیك خستۆتەوە کە لە سیاسەتی کوردایەتیدا دەستیان هەبوو لەوانە تۆفیق وەهبی، عیزەتی تۆپچی، ئەورەحمان سەعیدو سەید ئەحمەدی بەرزنجی کەکاتی ئەسرارو ئەمینداری شێخ بووهەروەها ئەندامی چوونەلای (شەریف پاشا) بوو، مانگانەشی بۆ هەندێك لەوانە بڕیبوۆوە ،ئینگلیزەکان لێی نزیك بوونەوەو سەودای حوکمدارییان خستە سەریەوە.

حەمدی بەگ خۆشەویستی بەرزنجی بووەو چەندجار لای رەفیق حیلمی باس وستایشی کردووە. باوکم دەڵێ لە پێشدا دڵی نەداوەتێ دوایی تێگەیشتووە دەیەوێت لە حەمدی بەگی نزیك بخاتەوە. چەندجار بەساردیی وەڵامی داوەتەوەو نەیویستووە بچێتە لای بەڵام کە چووە بە ئینسانێکی بەرزو بەنرخ هاتۆتە بەرچاوی بۆیە پێی خۆش بووە بیناسێت. رەفیق حیلمی بە دوورو درێژی باس و وەسفی ئەم ئەمیرە دەکات لە یاداشتی

---

(*) یاداشتی دوو بەشی یەك و دوو.

(*) ل ٩٠

بەرگی دوو بەشی یەك ل ٩١ دا و لە وەسفیدا دەڵێ: تەقالیدی ئوروستوکراتی بووە، ڕووخۆش، میوان پەرست، قسە خۆش، ڕاستی، دڵ ناسکی، تۆرینۆکیو کەمێك توندی ... لە مۆلکییەی شاهانەی ئەستەمبووڵ دەرچووە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا نموونەیی بووە شارەزای ئینگلیزیو فەرەنسی بووە کەچی لەگەڵ ڕەفیق حیلمیو هاوڕێکانیدایە بەتورکی قسەی کردووە و کوردیی نەزانیوە بەڵام کەمێك تێگەیشتووە.

دوای چەندجارێك بینین ئاشنایەتی لەگەڵ باوکمدا پێشکەوتووە جارجار لە ئوتێل ڕۆیاڵ لە بەغدا دەعوەتی بۆ کردووە لە نزیك سوق الصفافیر . جێگەی سینەمای هاوینیی قاهیرە وتویەتی باسی سیاسەتی کوردستانی کردووە ویستویەتی بەهۆی باوکمەوە هەواڵی هەرێمی سلێمانیو کوردەواریی تێبگات ئەمیش بۆیگێڕاوەتەوە کە جارجار هاتوو چۆی لە گەڵ ئینگلیزەکانو مەندوبی سامیدا هەبووەو نامەیان ئاڵوگۆڕ کردووە. متمانەی بە ڕەفیق حیلمی هەبووە و جارجار لەو نامانەی بۆ خوێندۆتەوەو تێگەیشتووە کە خەریك بوون لە کوردستاندا دەورێکی پێ هەڵسوڕێنن بەڵام چۆن؟ دیار نەبووە چونکە جاریَ لە ژێر چاودێریی سیاسیدا بووە. باوکم لەم ماوەیەدا ویستویەتی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی(*) چونکە ڕێگەی بەغدا کەرکوك کراوەتەوەو پارەشی پێ نەماوە بە کومپیالە هەزار ڕوپیەی لە ئەحمەد ئاغا کەرکووکی وەرگرتووە بۆ شتومەکی عەتاریی بۆ دوکانەکەی سلێمانی . بۆ ماڵئاوایی چۆتە لای حەمدی بەگ لە ڕۆیال زیافەتی کردووەو وتویەتی دیارە دۆستایەتی بەدڵ بووە. بە تەما بووە ئیدارەیەکی سەربەخۆ بۆ کورد بە هێزی عەسکەریەوە دروست بکرێت . بۆیە ویستویەتی لە نیشمانپەروەرەکانی کورد نزیك ببێتەوە.

ویستویەتی کۆمەڵەیەك دابمەزرێنن لە ناو هەمووناندا ڕەفیق حیلمی هەڵبژاردووەو هیوای بەوبووە کە چۆتە سلێمانی واتە بە پرسو ڕای ئەو بچێت بەڕێوە،باوکم هیوای بەوە نەماوە ئینگلیز ڕاستی لەگەڵ بکەنو بەتەما نەبووە سەربەخۆیی بەکورد بدەن، بەڵام دەڵێ "دیسان هەر قسەم دا کە تێبکۆشم بۆ ئەم مەبەستەو کۆمەڵەیەك دابمەزرێنم(*)" لە

---

(*) ل٩١- یاداشتی دوو بەشی یەك

(*) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە ل ٩٤و٩٥ یاداشتی دوو بەشی دوو

کۆتایدا ئەو ویستویەتی پارەی بداتێ بەلأم باوکم قایل نەبووە ئینجا قەڵەمێکی پێ بەخشیووە بەجێی هێشتووە.

## دامەزراندنی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد

پێش دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە ڕای باوکم سەبارەت بە هەڵبژاردنی (حەمدی بەگی بابان) بۆ دامەزراندنی حکومەتی کوردیی لەسەرەوە وتویەتی مستەفا کەمال سەرکەوتووە. خەلیفە هیچی بەدەستەوە نەماوە بۆیە پەیمانی سیڤری مۆرکردووە. تورک وازی لە موسڵ نەهێناوە ئینگلیز لەبەر نەوتی موسڵ ویستویەتی بەهۆی مەسەلەی کوردەوە ساغی بکاتەوە تورک واز لە موسڵ بێنێت ئەمانیش واز لە حوکمی سەربەخۆیی کورد بێنن. بۆیە ویستویانە حوکمی کوردستان زیندووبکەنەوەو حەمدی بەگ لە جێی شێخ دابنێن. هەروەها چونکە ئینگلیز پاش جەنگی یەکەم زۆر ماندوو بووەو ترساوە کورد دیسان و عەرەبیش شۆڕشی گەورە هەڵگیرسێنن. بۆیە بە سێ مەبەست ویستویانە مەسەلەی کوردستان زیندوو بکەنەوە:

-دوور خستنەوەی کورد لە شۆڕش .

- دەرکردنی ئۆزدەمیرو تورکەکان لە ڕواندز بەهۆی کوردەوە .

- بڕینەوەی مەسەلەی موسڵ.

کوردەکانیش لەو حاڵەتەی تێیدابوون بەرەو دوو ئەنجام ڕۆیشتوون:-

یەکەم-بوونە یەك لەگەڵ ئۆزدەمیرو تورکەکان .

دووەم- شۆڕشێکی گشتی بۆ سەربەخۆیی کوردستان . ئەمانە بێگومان پێچەوانەی مەبەستی ئینگلیز بووە بۆیە دامەزراندنی حکومەتێك بۆ کورد بەرپەرچدەداتەوە. ڕەفیق حیلمی دەڵێ ئەگەر بەرنامەیەك کە بۆ ئەم کارە دانرابوو سەری بگرتایەو کوردستان بهاتایەوە ناو سیاسەتی ئەو ڕۆژەی ئینگلیز هەنگاوێکی بۆ پێشەوە دەهاویشت و ئیمڕۆ ڕۆڵی کورد لە خۆرهەڵاتی ناوەندا بەجۆرێکی تر ئەبوو ".(*)

ئینجاباسی ئەم حەمدی بەگی بابانە دەکات و بەراوردی دەکات بە شێخ مەحمود کە بۆچی هێندە بڕوای نەبووە ئەم کارە سەربگرێت و حەمدی بەگ بتوانێت حکومەتێکی

---

(*) یاداشت دوو بەرگی یەك ل ٩٧

کوردیی لەو سەردەمەدا بەرێت بەرێوە، لە کاتێکدا تەنانەت هەر سلێمانیشی نەبینیوە وکوردیی نەزانیوەو لەناو کوردا نەناسراوەو حاڵو ئەحواڵی ولاتەکەو خزم وکەسی نەزانیوە. بەلام دیسان هەر هیوای نەبڕیوەو لەسەر ئەو پەیمانە کە داوێتی بە حەمدی بەگ کە دەگەڕێتەوە سلێمانی یەکسەر هەوڵدەدات لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە کە "بە هیوای خزمەتی میللەتی کوردو مەسەلەی کورد." دەشڵێت دەمزانی ئەم کارە ئاسان نییە، لەوانەیە لە رەنجێکی بێسوود زیاتر ئەنجامێك نەبەخشێت ،سیاسەتی ئینگلیز وابوو ئیتر ئاور لە شێخ نەدەنەوە "بۆیە ویستمان خۆشەویستی شێخ نەکەین بە بەرهەڵستی خزمەتی مەسەلەی کورد و لەگەڵ هاورێ خۆشەویستەکانی کەوتینە کار "[*]

لە ماوەیەکی کەمدا کۆمەڵە هاتە چووە ناو زۆربەی لاوە نیشتمانپەروەرەکانو ئاغا، ئەفەنی، بازرگانی بابان، کاسب وهەورامانو جافو پشدەرو هەمەوەندو جەباریی هاتنە ناو کۆمەڵەکەوە. رۆڵی ماجید لەمەدا جێی نکوڵی لێکردن نەبوو لە پەرەپێدانی کۆمەڵەو هاتنی شێخانو سەیدەکانی بەرزنجەو قەرەداغو سەنگاوو سەرگەڵوو عەسکەرو سەرۆك عەشیرەتەکانی هەمەوەندو جافو پشدەرو هەورامانو جەباریی، ماجید مستەفاو مەحمود جەودەتو سەید عەبدوڵڵای حاجی سەید حەسەن بەشێکی گەورەو رۆڵێکی زۆریان هەبوو، ئەم کۆمەڵەیە کۆمەڵەیەکی سیاسی نەبوو هێشتا تەشکیلاتی رێكوپێکی بەرێو شوێنی تیانەکرابوو چونکە لە پێشدا ئەم مەبەستانەیان هەبوو:

١-بلاوکردنەوەی بیری کوردایەتیو گیانی نیشتمانیی لە ناو ئەندامە یەکگرتووەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا. بەلام بۆ ئیدارەی کۆمەڵەو رێپیشاندان بە ئەندامەکان دەستەیەك لە لاوە چالاكو نیشتمانپەروەرەکان پێکهاتن و ژمارەیان ٧ کەس بوو ئەمانە بێوچان کاریاندەکرد .

٢-بیرکردنەوە لە رێکخستنی تەشکیلاتێکی تایبەتیو دامەزراندنی لق لە هەموو هەرێمێکدا کە چەند سەرەك عەشیرەتێکی لە کۆمەڵەکەیدایە یا بەشێکی زۆری خەڵکەکەی.

٣-مەسەلەی سەرۆکی کۆمەڵە، بە پێی کردەوەو تەقەلاکانی بۆ دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە دەڵێ: زۆربەی هاورێکانم لەو باوەڕەدابوون من سەرۆکی بم یان پێویستە ببم

---

[*] یاداشت دوو بەرگی یەك ل ١٠٠

بە سەرۆك من تێمگەیاندن كە بیرم لەمە نەكردۆتەوە وتم ئەبێ لە لاوە سەرۆكێك هەڵبژێرین كە نەبێتە هۆی چەندوچوون و تێكچوون لەناو خۆماندا دوای بیركردنەوەی زۆر هەوڵمدا بیری هاورێكانم لەسەر ناوی حەمدی بەگ بابان بوەستێنم. لەمەدا تووشی ئەركێكی زۆریش بووم ماجید دۆست و هاورێی پۆلی مەكتەبم لە ئەندامە خوێن گەرمەكانی كۆمەڵەبوو بە درێژایی وەخت لە هەموو كردەوەكانما لەگەڵم بوو" .

ماجید مەحمود جەودەت، ئەورەحمان سەعید لە بەندیخانە بوون كە باوكم چووە بۆ بەغدا وكە ئەم گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی ئەوان هاتونەتە دەرێ لە بەندیخانە، باوكم دەڵێ "لە دامەزراندنی ئەم كۆمەڵەیەدا زۆر بە گەرمیی یارمەتیاندام و لە پەرەسەندنیدا دەستێكی باڵایان هەبوو" ماجید كە لە ئەستەمبووڵەوە بە (نافرەد)ی نێراوە (ئەیاستە فانورس) رەفیق حیلمی لە ئەستەمبووڵ بووە. بۆیە ئەو وێنەیەی منداڵیی كە لەوێوە ناردویەتی بۆ رەفیق حیلمی لە ل ١٠٤ی یاداشتی دوو بەشی یەكەمدا بڵاویكردۆتەوە.

بڕیاریانداوە جارێكی تریش لە ماڵی عەزمی بەگی بابان كۆببنەوەو لە دانانی(سەرۆك) بۆ كۆمەڵەو لەحەمدی بەگ بدوێن. بۆ رۆژی دوایی لەوێ لەگەڵ ئەندامان كە جێی متمانەبوون نامەیان ناردووە بۆ حەمدی بەگ تا سەرۆكایەتی قبووڵ بكات و داوا لە نوێنەری بەریتانیا لە بەغدا بكات كە سیاسەتی بەریتانیا لە عێراق بە تایبەتی لە كوردستانا بەستراوە بە ئاوڕدانەوەیان لە كوردو بە دامەزراندنی حكومەتی كوردستانەوە. ئەگەر وابكات كۆمەڵە پەیمانی لەگەڵ دەبەستێ و گفتوگۆی لەگەڵ دەكات "ئەگەر ئینگلیز بێ دەنگ بێت، كورد شۆڕشی دووەمی دەست پێ دەكات" (*)

## چونی حەمدی بەگ بۆ سلێمانی :

حەمدی بەگ بەناوی هەموانەوە دەچێت بۆ سلێمانی بەڵام بڕواننە درێژەی ئەم باسە لەم یاداشتەدا. چۆن هەروەك نەیانناسیێ و ئاگای لە كۆمەڵە نەبێت بە هیچ جۆرێك ماوەشی نەداونەتێ بەلایدا بچن وقسەی لەگەڵدا بكەن.هەروەها چۆن رەفیق حیلمی و كۆمەڵە سەریان سوڕماوەو بە پەرۆش بوون و ئەو هەموو رەنج و تەقەلایەیان بەفیڕۆ

---

(*) ل ٩٠–١١٠ یاداشتی دوو بەرگی دوو .

ڕۆیشتووەو کۆمەڵە ئیتر لەکار کەوتووەو حەمدی بەگ بە شێوەیەکی ناخۆش لە بەغداش ڕۆیشتووە.

بەکورتی کە چۆتە سلێمانی کۆمەڵەی ئاگادار نەکردووەو وەڵامی نامەکەیانی نەداوەتەوە، ئینگلیز بەرنامەیان بۆ داناوە. نەچۆتە ماڵی عەزمی بەگی خزمی. مێجەرسۆن کردویەتی بە میوانی ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا، کە نزیکترین متمانە پێکراوی سۆنی حاکمی شاری سلێمانی بووەو لە ژێر چاودێری ئەودا دایناوە هەرچی چۆتە لای هەر چاك و چۆنی ڕەسمیی لەگەڵدا کردووە. ڕەفیق حیلمی دەڵێ" ئەم حاڵە جێگەی داخی من و هاوڕێکانم بوو" لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ یەك دوو کەس سەری لێداوە. بەڕمووزو ئیشارەت ویستویەتی تێیانبگەیەنێت کە دەستبەسەرە. کەوتۆتە داوەوەو تێدەگەن کە سۆن لە پێشەوە دەستی خۆی وەشاندووە، حەمدی بەگ لە ترسی خەفیەکانی نەیوێراوە نزیکی کۆمەڵەی سەربەخۆیی بکەوێت. دەرکەوتووە کە سۆن لای مەندوبی سامی دانی خێری پیانەناوە و حەمدی بەگ هەردوو لای لەکیس چووە بۆیە گەڕاوەتەوە بەغدا وئیتر لە لایەن کوردستانەوە باسی لەگەڵ نەکراوە .

باوکم کە دەچێتەوە بەغدا دەزانێت هۆکاری ساردیی نێوان حەمدی بەگ و ئینگلیز دیسان تورك بووە. ئۆزدەمیر نامەی ناردووە بۆ حەمدی بەگ هەڵی خەڵەتاندووە گوایە موسڵ هەر دەدرێت بە تورك و ئینگلیز کورد دەدەن بە دەستەوەو جوان نییە بۆ ئەو دوای ئینگلیز بکەوێ، حەمدی بەگ وەڵامی داوەتەوە کە تورکی خۆشی ئەوێت و باسی برایەتی کوردو تورکی کردووە ئینگلیز ئەم نامەیەیان بەر دەست کەوتووەو وازیان لە حەمدی بەگ هێناوە.. بەمشێوەیە ئەو هەموو ڕەنجەی ڕەفیق حیلمی و خەباتی شەوو ڕۆژی کە ژیانی لە خۆی و ژن و ماڵی تاڵکردووەو هەڵپەی کردووە دەست بە پووشێکەوە بگرێت تا گەل و نیشتمانەکەی بگات بەمافێك کەچی بە دەسیسەی تورك هەمووی با بردوویەتی. هەرچۆن وەك چی کردووە بۆ دامەزران و بەڕێوەبردنی کۆمەڵەی کوردستان و (جەمعیەتی کوردستان) و ڕۆژنامەکەی و چۆن مستەفا پاشای یامولکی دامەزرێنەریان پێشێلیکردوون و ڕەنجی ڕەفیق حیلمی و لاوە نیشتمانپەروەرەکانی هاوڕێی داوە بە بادا .

## چونی بۆ کەرکوك لەساڵی ١٩٢١دا :

پاش ڕۆیشتنەوەی حەمدی بەگ کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان کە پڕوپاگەندەی ئۆزدەمیر کەوتۆتە وێستگەیەکی گرنگەوەو دەستەی منەوەران واتە نیشتمانپەروەران لەم ناوەداو بێ قەراری سیاسەتی ئینگلیز لە چاوەڕوانی زیاتر هیچیان پێ نەماوە. ئۆزدەمیر بەناوی برایەتی و ئاین و سەرکەوتنی کەمالییەکان بەسەر یۆناندا (١٩٢٢)و ڕۆیشتنی سۆن لە سلێمانی.. و هێزی ئۆزدەمیر بە یارمەتی پشدەری و هەمەوەندی هەڵخەڵەتاو دەگاتە نزیك سلێمانی شەڕی کوردو ئینگلیز لە ڕانیە دەست پێدەکات ئیتر ڕەفیق حیلمی و دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی سەربەخۆیی چەند هەوڵدەدەن، چونکە بیریان لە دانانی سەرۆکێك نەکردۆتەوە لە خۆیان بە ڕۆیشتنی حەمدی بەگو لەو بارودۆخەدا وردە وردە دەپوکێتەوە. دوای ئەمە باوکم دەچێت بۆ کەرکوك بۆ لای مامەکانی و نزیکەی (٥) مانگ لەوێ دەمێنێتەوە (١٩٢١ی مارت – ١٩٢١ی ئاب) سەبارەت بەمە دەڵێت "هەرێمی سلێمانی تا ڕواندز بەرەو شۆڕشی گەورە چووە، کە گەڕاوەتەوە سلێمانی ناو شار بە دڵی ئینگلیز بووە، لە دەرەوە عەشایەر وروژاوەو هێزی ئینگلیز لە دەربەندی ڕانیە بەرامبەر بێچووە شێرەکانی کورد لە(٢٣)ی ئۆغستۆسی (١٩٢٢)دا شپرزە بوون .

هەروەها دەڵێ کە لە کەرکووك چووبوو بۆ سەردانی مامەکانی، لەوێ بیستبووی ئینگلیز زۆر شکست بوون و لە ڕانیە ٢٣ ئاب ١٩٢٢ لە باشوورو باکوری عیراقدا گڕی شۆڕشی بەرزبۆتەوە. حکومەتی بەریتانیا لەو ساڵەدا لە ئیستگەیەکی گرنگدا وەستاوە. لەبەر سەرئەنجامی جەنگی یەکەم باری ئابووری خەڵکەکەی پەشۆکاوە، بۆیە ویستویانە خۆیان لە شەڕو شۆڕ دوور بخەنەوە. لە قاهیرە کۆنگرە دەگرن بۆ باسکردنی مەسەلەی کوردو عەرەب تا بزانن بیری شۆڕشگێڕەکانی کورد یەکدەگرێ لە گەڵ عەرەبدا یان بۆ کوردیش حکومەتێکی تایبەتی دابنێن. هەستیانکردووە کە بە تەنیا بەچەك و تەقەمەنی ئیدارە ناچێتە سەر.

لەم کۆنگرەیەدا فەیسەڵ کراوە بە مەلیکی عیراق (٢٣ ئاب ١٩٢١) کوردەکان دەگیان بۆ نەداوە، لە باشوور شۆڕش بۆ لابردنی ئینتیداب هەڵگیرساوە، (کۆکەس) بە ناوی

نەخۆشیی مەلیکەوە حوکم دەگرێتە دەستو رۆژنامەکان دادەخاتو نیشتمانپەروەران دەخاتە زیندانەوە .

شکستی ئینگلیز لە رانیە پێویستیەکی هێنایە ئاراوە کە مەسەلەی کوردستان زوو بەئەنجام بگات. کۆکەس بڕیاردەدا سوپاکەیان لە سلێمانی بکشێنەوە بۆ بەغدا بۆیە نامەیەك بۆ دایکی دەنووسێ کە ئەمە زۆر ئازایانە بە یەك رۆژ گەیشتۆتە بەغدا لێرەدا باوکم بۆ نوکتە نوسیویەتی دەڵێ "ففی الهجاء ما جربت نفسی ولكن ف الهزيمه كالغزال " [*] ئینجا دەڵێ حکومەتی فەیسەڵ-یش لەوانە نەبوو رێ لە شۆڕشی کورد بگرێ، بۆیە سلێمانی بە جارێ بێ حکومەت بووە، رواندز کەوتە بەرهەڕەشەی هەڵمەتی ئۆزدەمیر . بۆیە گەورەو ناودارانی سلێمانی لە ئەعدادی زەمانی عوسمانی کۆدەبوونەوە بە ناوی (مەجلیسی میللی) لە ژێر ئاڵای سەرەکی شێخ قادری حەفید برای شێخ مەحمودا بۆ پاراستنی شار لە ئاژاوەو بەڕێوەبردنی ئیشو کاری خەڵكو بەرهەڵستی تورك تا بەیارمەتی عەشایەری کورد نەچنە سلێمانی. لەم بارودۆخەدا کە کۆمەڵەی سەربەخۆیی هەڵدەوەشێتەوە ئەندامەکانی وەك ماجیدو تۆفیق وەهبی دەڕۆن بۆ بەغدا .

## بروسکەیەك لە کەرکووکەوە :

لەو کاتەدا کە ئەندامانی کۆمەڵەی سەربەخۆیی بڵاوەیان لێ کردبوو هەر یەکە بەلایەکداو چوبوونەوە سەر وەزیفەی میریی . تۆفیق وەهبی بووبووەوە بەزابت لە سوپای عیراقداو ماجید بانگکراوە بۆ سەرا بەڵام قائیل نەبووە بەو وەزیفەیە، مەحمود جەودەت کراوە بە ئەندازیاری بەلەدیە وازیهێناوە، رەفیق حیلمی بروسکەیەکی بۆ هاتووە لە کەرکووکەوەو کەچووە خۆی دەڵێ ئەوەندەی نەمابوو ببم بە وەکیلی ئەحمەد ئاغا [*] دواجار بە کاتب (بەڵام ئەم کارەی نەکردووە، بە جوانی نەزانیوە پێی بڵێن کاتبی یا موحاسیبی فلان).

---

[*] ل ١٢٦ یاداشتی دوو بەرگی دوو .

[*] ئەحمەد ئاغا کەرکوکی کە خزمی رەفیق حیلمی بوو گەلێك جار باسی ئەمەوەی کردووە کە یارمەتیداوە یەکەم ملیۆنێری ئەو کاتە بووە رەفیق حیلمی زۆر خۆش ویستووە زۆر جار دەستی گرتووە وقەرزی داوەتێ.

باوكم كە لە كەركووك بووە لەو ڕۆژانەدا لە (شوكری عەبدولواحید)ەوە بروسكەی وەرگرتووە كە تیایدا نووسراوە:" نازری مەعاریف لە كەركووك تۆی داوا كردووە بەبێ وەستان وەرە ،چاوەڕوانتە" شوكری بە منداڵی ناسیوە .. كاتێ ئەم لە ئامادەیی عەسكەریی عوسمانی بووە لە بەغدا ئەو لە قوتابخانەی سوڵتانی بووە و لە كەركووك چاوی پێكەوتووە. ئینگلیزەكان كە چوونەتە كەركووك كردوویانە بە بەڕێوەبەری قوتابخانە نازر ناوی فازیل بووەو دیاربووە ویستویەتی باوكم بكات بەمامۆستا، لەو وەختەدا مامۆستا وا بە ئاسانی دەستنەكەوتووە.سەبارەت بەوەی ئەو نازرە چۆن ناوی باوكمی زانیوە باوكم لە یاداشتەكانیدا دەڵێ " من ئافەرۆز كرابووم‌و لە دائیرەكانی میریدا ڕێی هاتووچۆم نەبوو لە كاروباری میریدا دامەزرانم بە شوكریی نەدەكرا هاوڕێكانم وای بۆ چووبوون كە ئەمە بۆ دوورخستنەوەم لە سلێمانی كراوە، منیش بەرەو ئیفلاس ئەچووم هەرچی پوول‌و پارەم هەبوو خەرجم كردبوو، تەنانەت خشڵەكانی خێزانەكەشم فرۆشتبوو واتە ژیانێكی سەخت‌و تاڵم ڕائەبوارد(*).

دیسان باسی یارمەتیدانەكانی ئەحمەد ئاغای كەركووكی كردووەوكە (مستەفا)ی مامی مردووەو بێ وەكیل ماوەتەوە ویستویەتی بیكات بە وەكیل بەڵام باوكم قایل نەبووەو بەڕاسپاردنی ئەو قادر ئاغای برازای خۆی پێ كردووە بە وەكیل . ماوەیەكیش ویستویەتی حساباتی سلێمانی بداتە دەست باوكم، بەڵام وتویەتی لەبەر ناوو ناتۆرەی خەڵكی ئەمەشم ڕەتكردەوە.

---

(*) ئەمە لەوجارە كەمانەیە كە تیایدا باسی ژیانی تایبەتی خۆیدەكات‌و ناوی ژنەكەی دەهێنێت. ئەویش تا پیشانییدات كە لە ناچاریدا ئەوكارەی وەرگرتووە .

## ویستویەتی (قیرائەتخانە ) بکاتەوە

رەفیق حیلمی دەڵێت" پێش تەلگرافەکەی شوکری، لەگەڵ هاورێکانما دەمانویست قیرائەتخانەیەك بکەینەوە، لاسایی نیشتمان پەروەرەکانمان دەکردەوە کە قوتابخانەیان کردۆتەوە بۆ فێرکردنی منداڵان".

هیچیان لەدەست نەهاتووە بیکەن بۆیە هەوڵیانداوە هەرچۆنێك بێت شتێك بکەن، بەن بەهۆی راهێنانی لاوەکان لەگەڵ خوێندنەوەی گۆڤارو کتێب و رۆژنامەو بڵاوکردنەوەی زانستی و شارەزایی لەمێژوو ئەدەبدا ئەگەر ئەم بیرۆکەیە سەری بگرتایە هەنگاوێکی گەورە دەبوو بۆ خزمەتی وڵاتەکەمان. تۆفیق قەزاز هانیداون و پەیمانی داونەتێ دوکانەکانی لای چاپخانەی حسە کەر-یان بۆ ئامادەبکات.

مەحمود جەودەت لەم کاتەدا ڕاستبۆتەوە وتویەتی ڕاوەستن با بچم ئیستعفا بکەم " داخەکەم ئەم بیرەشمان سەرینەگرت و نەهاتە دی ".(*)

رۆژێك لە سلێمانی لە گەڵ هاورێیەکی وەك نوسیوویەتی زۆر خۆشەویستی کە ناوی عەزیزی حاجی ساڵح بووەو لەگەڵ برازای ئەحمەد ئاغا لە ڕێگا تووشی کاپتن بێل-ی ئاشنای کۆنی دەبێت کاتێك کە لە لەندەن گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بۆتە حاکمی سلێمانی رەفیق حیلمی نەچۆتە لای بۆیە ویستویەتی خۆی لێ لابدات بەڵام ئەو ڕێگەی لێ دەگرێت و لێی دەپرسێت چی دەکات چی دەوێت بچێتە لای تابۆی بکات لە وەڵامدا باوکم دەڵێت کاسبی دەکەم و کارەکەم باشەو هیچم پێویست نیە. بێل لەمە دڵگیر دەبێت ئینجا لێی دەپرسێت: هەواڵی یوسف بەگی ئاشنات دەزانی ؟ ئەمیش وتویەتی داخەکەم مردووە بەڵام لە ڕاستیدا بە نهێنی لەناو براوە چونکە دژی ئینگلیز بووە، بەمەش کاپتن بێل ویستویەتی رەفیق حیلمی بترسێنێت چونکە سەرکەشبووە.

---

(*) ل ١٣٦ یاداشتی دوو بەرگی دوو .

## دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانەی زەفەر لە کەرکووک :

رەفیق حیلمی دەڵێت:" بۆ بروسکەکەی کەرکووک پرسی بە ماجیدو مەحمود جەودەت کردووە ئەوانیش وتویانە هەل لەدەستمەدە ". بۆیە ولاخی لە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ داواکردووە لەگەڵ ئەم ئەحمەدبەگەدا پێکەوە قوتابی بوون لە مولکیەی سلێمانی بە منداڵیی و باوکیشیان هاوڕێ بووە لە ئۆردوی عوسمانی. ئەمە لەگەڵ پیاوێکی خۆیدا رەوانەی کردووە بۆ کەرکووک لەرێگا لای رەشید جەودەت کە لە تاسلوجە خێوەتی هەڵداوە لایداوە. لەو ولاخی وەرگرتووەو ئەوی تری ناردۆتەوە، ئێوارە گەیشتووەتە چەمچەماڵ، سەعید چەلەبی لەوێ بەڕێوەبەری مالیی و شێخ محەمەدی بەرزنجی دادوەر شەوێك لەوێ بەقسە خۆشەکانی دادوەر پێدەکەنن و بەیانی چەلەبی فەتحوڵلا کەرکووکیی لەگەڵ ناردووە بۆ کەرکووک .

نازر چووە بۆ موسڵ، بەڵام شوکری ڕاسپاردووە بە گەیشتنی رەفیق حیلمی دەستبکات بەوانە وتنەوەو بە بروسکە هەواڵ بنێرێت بۆ نازر فازیل. بەو جۆرە باوکم لە کەرکووک لە قوتابخانەی ( ظفر) دەبێتە مامۆستای بیرکاریی و زمانی تورکی .

لە موسڵەوە فازیل بە بروسکە فەرمانی دانانی بە مامۆستا ناردووە. ١٩٢١/٣/١٦ جگە لەوە هەر (مەدرەسەی عیلمیە) هەبووە (ظفر)ییە دوای گرتنی کەرکووک بە یادی سەرکەوتنی ئینگلیزەوە ناودەنرێت . مامۆستاکانی ئەم قوتابخانەیە کە بەڕێوەبەرەکەی شوکری بووە ئەمانە بوون (رەشید عاکف هورمزی، ساڵح قازیی بۆڵشەویك، سەعدوڵلای کوڕی موفتی دەروێش ئەفەندی، ئەورەحمانی مەلا مەحمودی مەزناوەیی زاناو عەلامەی کورد، شەوکەتی عەبدوڵلا ئەفەندی ئەمە مامی رەفیق حیلمی خۆی بووەو وێنەیەکی ئەو مامەی داناوە وتویە بۆ یادگار چونکە مامی بە منداڵی یارمەتی خۆیی و براکانی داوە .

## ڕۆژنامەی (النجمه) ئەستێرە :

ڕۆژنامەی (النجمه) بە زمانی تورکی بووەو لە کەرکووک دەرچووە حکومەتی داگیرکەر (ئیحتیلال) دەریکردووە، هەر ئیعلانی تاپۆو بەیان و تەبلیغاتی حکومەتی تێدابووە. جارجار هەندێ شیعرو باسی بە تورکی بلاوکردۆتەوە زیاتر هەر مامۆستاکان تیایدا نووسیویانە ، لە ژێر چاودێریی شوکری بەڕێوەبەردا بووەو پارەیەکی باشی لەسایەیدا

دەستکەوتووە. جێی متمانەیانبووەو نەیهێشتووە هەر وتاریٚ بۆنی سیاسەتی لیٚ بێت لەوڕۆژنامەیەدا بلاٚوبکرێتەوە. رەفیق حیلمی دەڵێت "بەلاٚم من هەرچۆنیٚ بوو خۆمم تێومردا بوو" لە پێشدا شیعرێکی تورکی تیا بلاٚودەکاتەوە زۆر لە هاوڕێکانی پێیان خۆشدەبێت. ماجید نامەیەکی ستایشی بۆ دەنێرێت خۆیشی لەسەری دەڕوات، جارجار شیعرو وتاری تیادا بلاٚودەکاتەوە. ڕۆژنامەکە ڕواج پەیدا دەکات، شوکری ستایشەکانی پیٚ خۆش دەبێت بەلاٚم ڕۆژنامەکە تا ئەو ڕۆژە سەروتاری نابێت، ئیتر رەفیق حیلمی ناهێڵێت بیٚ سەر وتار دەربچێت، بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە یاداشتی دوو، بەرگی دوو، ل ١٢٤و١٤٤ لەو ماوەیەدا دۆستی ئینگلیز کەم بوون و ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوولْ سەرچاوەی باس و هەواڵ بوون. ئەوڕۆژنامانەی هاتونەتە کەرکووك پڕبوون لە باسی تورك و کەمالیەکان. باوکم لە بەغداوە ڕۆژنامە فەرەنسیەکانی بۆ هاتووە لەبەر ئەوە باش ئاگای لە هەواڵی تورك و ئەنادۆڵ و کردەوە ناڕەواکانی سۆن بووە.

## وەلاٚمی ئینگلیز بۆ نووسینەکانی لە ( النجمه )دا :

ئینگلیزەکان تا ماوەیەك لەباوکم بیٚ دەنگدەبن بەلاٚم کە خەڵك چاویان دەکرێتەوەو زمانیان دەپژیٚ و دەکەونە ستایشی تورك و جنێو دان بە ئینگلیز و ناوی رەفیق حیلمی بە تایبەتی بە هۆی (النجمه)ەوە دەنگ دەداتەوە، لە دیوەخانەکان هەر باس باسی (النجمه) و وتارە بە هێزەکانی باوکم دەبێت ئیتر شوکری بانگی دەکاتە ماڵی خۆی (*) و پێی دەڵیٚ ئەگەر واز لەو باسانە بهێنێت خەلاٚتدەکریٚ و ئەگەرنا ئەوا سزادەدرێت و دەریدەکەن ئەویش لەوەلاٚمدا دەڵیٚ ئەی ئەگەر وانەکرد؟ دەڵیٚ دەتنێرن بۆ هیندستان ئەمیش دەڵت ئینجا باشتر، سەفەرێکی خۆڕایم دەستدەکەویٚ بۆ هیندستان !

---

(*) درێژەی ئەم باسە ل ١٤٨ یاداشتی دوو بەشی دوودا بخوێنەرەوە.

سزادانی

دوو رۆژ دوای ئەم مشتو مڕە بە نامەیەکی رەسمیی میللەر موفەتیشی ئیداری پێی نووسینی لێ دەگرێ دوای چەند رۆژێك بە بروسکەیەك فەرمانی گۆڕینی وەردەگرێت بۆ مامۆستای قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت لە سلێمانی لە ٢٠ ئۆغستۆس ١٩٢١دا . محەمەد بەشقە کە موفەتیشی مەعاریف دەبێت لە کەرکووك و نوێنەری نازر دەبێت کەبە رەفیق حیلمی دەڵێ بڕۆ ئەم دەڵێ ناچم بۆ سلێمانی، نوێنەری نازر پێی دەڵێت: بچێت باشترە،ئیتر دواجار بە قسەی دەکات و رۆژی دووەم لە بەغداوە بروسکەیەکی تری بۆ دێت و لە وەزیفەکەی دەردەکرێت.

## پاش دەرکردنی لە قوتابخانەی ظفر

رەفیق حیلمی دەڵێ "بەھەڵەدا چوبووم، ئینکاریی ناکەم لەوەدا کەلەسەر تورکم دەکردەوە بە هەڵەداچووبووم.[*] ئێمە لە عیراق ئاگامان لە نیشتمانپەروەرەکانی کوردی تورکیا نەبوو، کۆمەڵە سیاسیەکانیان پەیوەندییان نەکردبوو بەوانەی عیراقەوەو نوێنەریان نەناردبووە لای شێخ . هەوڵی ئینگلیز بۆ دانانی سەیدتەهاو حەمدی بەگ بەهیچ چوو بوو . لای من مەسەلەی کورد لە عیراقدا لەو رۆژەدا براوبۆوە. کوردی تورکیا لەوێ لە گەڵ کەمال دا بەپێی پەیماننامەیەکی میللی بۆ پاراستنی نیشتمان و یەکێتی کوردو تورك و شانبەشانی کەمالییەکان شەڕیان لەدژی یۆنان کرد. خەلیفەی لاواز- کەمالیش سوارە کوردەکانی خستبووە خەتی پێشەوەی شەڕو هەزاران نامەی دەنارد بەناوی کوردەوە بۆ کۆنفڕانسی ئاشتی و لەونامانەدا دژی خواستی شەریف پاشا سەبارەت بەداخوازیی کورد بۆسەربەخۆیی بوو بەمشێوەیەش توانی یاریی بە عەقڵی کورد بکات.[*]

بە سیاسەتی ژیرانە گرەوی بردەوە، هەڵبژاردنی تازە مەبعوسان سێیەکی کورد بوون. کوردەکانی نزیك خستەوە لەخۆی تا لە تەقەلا بۆ کوردستان سارد ببنەوە و

---

[*] رەفیق حیلمی ئەم باسە درێژە بۆیە دەکات چونکە گلەیی لێکراوە بۆ ئەو کاتە لەسەر تورکی کردۆتەوە.

سوێندخۆرەکانیشی لە مەسەلەی کورد پەشیمانکردبۆوە. پەیمانی سێڤر بە هۆی عیسمەت ئینۆنۆوە هەڵوەشابووەوە. بەهەنجەتی ئەوەی شەڕی تورك و یۆنان تەواو بوو تورك هیچ تەگەرە دروستنەکات ئەگەر کورد داوای ئیدارەیەکی تایبەتی سەربەخۆی بۆ کوردستان کرد. بەڵام ئەوەبوو هەر ئەوەندە کورد یۆنانی بۆ کردنەدەریێ هەرچی ئەفسەروپلەدارەکانی کورد هەبوون بە دەستی کوردەکان بە کوشتی دان و زیندە بە چاڵی کردن.

باوکم دەڵێ" مامی گەورەی تۆفیق ئامان هاتەلام کەپیاوێکی پارەداربوو پێی وتم بەتەنگەوە مەبە تۆ بۆ وەزیفە دەستنادەی کاغەزت بۆ ئەنووسم بچۆ لە بەغدا (٢٠٠٠) روپێ وەربگرەو شتومەکی پێ بکڕەو دوکانی پێ دابنێ". دوایچەند رۆژێك دەچێ بۆ بەغدا خەریکی کەل‌وپەل کڕین دەبێ، رۆژێك حەمدی بەگ دەچێت بە شوێنیداو دەیبات بۆ ئوتێل باسی نووسینەکانی رۆژنامەی (النجمە)ی لەگەڵ دەکات و تێیدەگەیەنێت کە ئەو لەوە زیز بووە لە سەر تورکی کردۆتەوە " باوکم دەڵێ "بۆچوونەکانمی نەچووبوو بە دڵدا، منیش پرسیارم لێ کرد بەوە رەنجاو سەغڵەت بوو هەستایە سەرپێ و ئیتر زۆر بە ئەدەبەوە لێی جیابوومەوە" پاش چەند ساڵێك لە لەندەن گەڕابووەوە رەفیق حیلمی بینیبوو لای شوکری سەروو ڕیشی وەکو کلووی بەفر سپی بووبوون ئەمیش زۆر داخی خواردبوو کە کوردێکی وابەکزی ببینێت .

## بینینی فازیل لەسەر پردی مۆد لە بەغدا

رەفیق حیلمی فازیل دەبینێت و سڵاوی لێ ناکات وادەزانێ نایناسێتەوە چونکە هەر یەك جاربینیویەتی، بەتورکی قسەی لەگەڵ دەکات. باش تێی ناگات. سەلیم حەسون پێی دەڵێ بە فەرەنسی قسەی لەگەڵ دەکات و لێی دەپرسێت لە قوتابخانە چی ئەڵێیتەوە ؟ وتویەتی بیرکاری و هەندەسەو تورکی، کاغەزێك دەخاتە بەردەمی دوو پرسیاری عیلمی تێدایە بەزمانی فەرەنسی باوکم هەر بەوزمانە وەڵامی دەداتەوە بەدڵی فاریل دەبێ، پێی دەڵێ تۆ هەر مامۆستایی بکە بۆ سبەینێ هەواڵی باوکم لە رەمزی کەرکوکیی مامۆستا دەپرسێ و داوای دەکات تا بچێت بۆفەرمانگە بۆلای . ئەمیش باوکم دەدۆزێتەوەو پێی دەڵێ فازیل دەیەوێت بتبینێ بەڵام باوکم قایل نابێت بچێت بۆلای.

ئینجا سلێمانەکەی سلێمانی کە جوولەکە بووە ئەویش پێی دەڵێ فازیل داوات دەکات، تکای لێدەکات بچێت چاوی پێی بکەوێت، هەر دەڵێ ناچم، پاش ئامۆژگاریی کردنی دەچێت، فازیل زۆر بەشیرینی بەپیریەوە دەچێتو پێی دەڵێ ئەو لەسەر داوای ئیدارەی کەرکووک داوای لابردنی کردووە لە وەزیفەکەیو لێی دەپرسێ بۆ نەچوویت بۆ سلێمانی؟باوکیشم دەڵێ لە ماڵەوە نەخۆشم هەبووە، ئەویش دەڵێ جێی داخە لە کاتێکدا دەبوو پارمەتی بدرێیت لە وەزیفە دەرکراویت. رەفیق حیلمیش وتویەتی شایەنی داخخواردن نیەو سوپاستان ئەکەم، باوکم دەڵێ دیاربوو " ئەیویست دامنێتەوە بە مامۆستا، هەرچیم وت کەڵکی نەبوو وشەکانی زۆر جوانو پیاوانە بوون لەدەمی نازرێکی ئینگلیز دەردەچوون بەرامبەر بە موعەلیمێکی دەرکراو، چاوەڕوانی ئەمەی لێ نەدەکرا. شەرم گرتمیو بەڵێنمدا کە بچمە سلێمانی. داوای ئەو لیستەی کرد کەناوی مامۆستاکانی کەرکووک بۆ پلە بەرزکردنەوە نوسرابوون یەکەم ناو ناوی من بوو وتی تۆ ئەبێ بە مامۆستایی خزمەتی زانستی قەومەکەت بکەیت" .

فازیل محەمەد باشقە لە باوکم دەپرسێت کەی دەگەڕێیتەوە بۆسلێمانی دەڵێ سبەینێ، فازیل پێی دەڵێ ئەتوانی لەگەڵ من تا کەرکووک بڕۆیت چونکە ئۆتۆمبێل کەمو گرانە، قایل دەبێت واتە هەر (٢١) رۆژ لە وەزیفەدا نامێنێتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانیو دیسان ئەکەوێتەوە باسی شۆڕشی عەرەبەکانی عیراق لە ١٩٢٠. ل ١٥٧-١٨٠ی یاداشتی دوو بەشی دوو

٢٤ی حوزەیرانی ١٩٢١ فەیسەڵ کە بووبووبە مەلیکی عیراق لە بەغدا پێشوازیکرا بە شکۆداری.

ئینجالەلاپەڕە ٢٠٢ی هەمان سەرچاوەدا رەفیق حیلمی باسی چۆنێتی سەرکەوتنی تورکەکان دواتر باسی کۆنگرەی لەندەنو باسی کورد دەکات .(*) هەروەها باسی دەکات لەکۆنگرەی٢١ی شوباتی ١٩٢٢ و مەسەلەی کوردو ئەرمەنی لە تورکیا ئەویش لەلاپەڕە

---

(*) نوێنەری مستەفا کەمالو خەلیفەی ئەستەمبووڵ بە فروفێڵ وایان پیشاندا کە کوردو ئەرمەن وەک تورک مافیان هەیەو خۆیان داوای سەربەخۆیی ناکەن ( لە پێشەوە نوێنەریان دانابوو لە مەجلیسی میللی تورک) و بەبەرتیل دەمکوت کرابوون و ئۆزدەمیر مەزبەتەی بە ناوی کوردەوە ناردبووبۆ کۆنگرە کە برای تورکن وهتدو شەڕی ئەرمەنو کوشتاریان گوایە کوردی نەفام کردویەتیو فەرەنساو ئیتاڵیا پشتی تورکیایانگرت بۆیە (٣) بەندەکەی سیڤر هەڵوەشێنرایەوە.

(٢٠٥)ی هەمان سەرچاوەدا دوای ئەوەی ئینگلیز هیوای بە تورکیا نامێنێت‌و بەرامبەر بەشۆڕشی کوردو عەرەب سیاسەتیان دەگۆڕێت لەبەرکارهێنانی هێزەوە بۆ ڕێککەوتن. بۆیە شێخ لە هندستانەوە دەهێننەوە بۆ عیراق‌و فەیسەڵ دەکەن بە مەلیك‌وبەنیازن شۆڕش دابمرکێنەوە.

بەڵام لە هێنانەوەی شێخ بە سستی جوڵانەوە، بۆیە ئاژاوە لە کوردستان دوایی نەهات‌و ئاگری شۆڕش بە هاتنەوەی شێخ نەکوژایەوە بەڵکو هێندەی تر کڵپەی سەندو گڕیگرت. (*)

---

(*) یاداشتی چوار بەرگی دوو بەشی دوو، واتە بڕوانە باسی کۆنگرەی لەندەن ل ٢٠٤

# کورتە باسی هەرێمی سلێمانی پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە هیندستانەوە

-ئینگلیز لە رانیە دەرکراوهەربۆخۆشیان لە سلێمانی رۆیشتن.

-دەسەلاتی ئۆزدەمیر لەناو عەشایەرەکاندا پەرەی سەندبوو.

-تورکخواکان نیشتمانپەروەریان بە دوژمن دائەناو بەچاوی ئینگلیز تەماشایان ئەکردن.

-نیشتمانپەروەرەکان بە تورکخوایان وتووە ( جلخوار)

-نیشتمانپەروەرەکان لەلای ئینگلیزیش دوژمن بوون

-حوزەیران ١٩٢٢ ئینگلیز لە رانیە چوونەتە دەرەوە سلێمانیان بە فڕۆکە بەجێ هێشتووەو بەرەو بەغدا چوون.

-ئاژاوە بەتەواوی کەوتۆتە کوردستانەوە ، هەڕەشەی گەڕانەوەی ئۆزدەمیرو تورکەکان بۆ سلێمانی ئەوەبووکە گوایە نیشتمانپەروەرەکان دەکوژن بێگومان رەفیق حیلمی یەکێك بوولەو نیشتمانپەروەرانە لەسەردەمێکدا کەخەلکیی هیوایان نەمابوو چونکە نیشتمانپەروەر باوی نەماوە.

## کۆمەلەی کوردستان :

ئا لەم بارودۆخەی کوردستاندا مستەفا یامولکی لە ئەستەمبوولەوە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی بۆ بەرپەرچدانەوەی پرۆپاگەندەی تورك‌و پاراستنی سلێمانی لە هەلمەتی ئۆزدەمیرو تازەکردنەوەی گیانی نیشتمانیی کورد. بە ئومێدی دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ و ئەمەش پێویستی بە کۆمەلەیەکی کوردیی بوو.

## کۆمەلەی کوردستان و رەفیق حیلمی :-

رۆژی (٢١ی تەمموزی١٩٢٢) پاش وەرگرتنی مۆلەت لە حکومەتی سیاسیی، مستەفا پاشا یامولکی لەمزگەوتی سەید حەسەنی‌موفتی کۆبۆتەوە بۆ هەلبژاردنی نهێنی ئەندامانی دامەزرێنەری ئەم کۆمەلەیە .

یەکەم دەنگ لە دوای مستەفا پاشا بۆ رەفیق حیلمی دراوە و [*] کۆمەڵە ناوی نراوە ( جەمعیەتی کوردستان) لە هەمان کاتدا مستەفا پاشا مۆڵەتی دەرهێنانی رۆژنامەی وەرگرتووە. رۆژێك پاش ئەم هەڵبژاردنە لە٢٢ی تەممووزدا مستەفا پاشا نامە دەنێرێت بۆ رەفیق حیلمی و ئەم نامەیە ماوە ئیمزای سەرۆکی جەمعیەیی کوردستانی لەسەرە دەربارەی ئەوەی کە بۆتە ئەندامی جەمعیەتەکە.

یەکەم کۆبوونەوەی جەمعیەت لە ماڵی میرلیوا مستەفاپاشا دەبێت لەو کۆبوونەوەیەدا ئەم بڕیارانە دەدرێن: رۆژنامەیەك دەربکەن بەسێ زمان بێت (کوردی ، فارسی، تورکی) بەناوی (بانگی کوردستان)، ئەوەبوو یەکەم ژمارەی لە (٢٢ئۆغستۆسی ١٩٢٢)دا دەرچوو باوکم نووسینی لەبەشە کوردیو فارسیەکەیدا هەبووەو سەرپەرشتی بەشە تورکیەکەشی کردووە.

کاتێکیش کە کراوەتەوە بە مامۆستای نموونەیی قوتابخانەی سەعادەتو لە بەغدا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی (کاپتن هۆڵت) تەماشای کاروباری مەکتەبەکانی کردووە، ئینگلیزیش بە دوایەمین پۆل وتراوەتەوە. هۆڵت مامۆستای هەبووە، لەو قوتابیانەی پێشکەوتوون جێگەی بەرزیان وەرگرتووە .

---

(*) بۆ درێژەی باسی ئەم کۆمەڵەیە بڕوانە یاداشتی رەفیق حیلمی بەشی پێنجەم لاپەرە ٤٨٦. بۆ رۆژی دامەزراندنیو دەنگەکانو هەڵبژاردنی ئەندامان بڕوانە گۆڤاری ( رۆژی نوێ) ژمارە ٧ ساڵی ١٩٦٠ ژمارە تایبەتی شێخ مەحمود. هەروەها بڕواننە کتێبەکەی جەمال خەزنەدار کۆکراوەی رۆژنامەی (رۆژی کوردستانو بانگی کوردستان). بڕوانە سەبارەت بەو کۆمەڵانەی کە لە دامەزرێنەریان بووە ڕەنجی زۆری داوە بۆ دامەزراندنو پەرەپێدانیانو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان کەچەندین گیرو گرفت هاتۆتە ڕێی لەو ڕێگەیەدا رەفیق حیلمي هەر ئەندام نەبووە لەم کۆمەڵانەدا وەك کۆمەڵەکانی کوردستانو سەربەخۆیی کورد کە دایمەزراندووە تا ببێتە پشتگیریی ئەگەر لە جێی شێخ مەحمود کرا بە حوکمداری کوردو کوردستان.
دەبینن لە یاداشتەکانیدا بە تایبەتی یاداشتی دوو بەشی یەكو دوودا ولەبەشی پێنجەمیدا باس لە هەردوو کۆمەڵەکەو بەسەر هاتو ئەنجامیان دەکاتو باسی ئەو کۆمەڵانەی کەدامەزرێنەرو ئەندامیان بووە دەبینن چۆن ئەم لاوە کە تا ئەوکاتەش نەگەیشتووەتە تەمەنی ٢٣-٢٤ ساڵیی . ئەم هەموو ئەرکە سیاسیەی لەئەستۆدابووە لە جیهانێکی پڕلە جەنگو ئاژاوەداو پێبەپێی هەستانو دانیشتنو گفتوگۆ و کارو نووسینو وەرگێران بۆ گەورە کاربەدەستانی حکومەتی بەریتانیا لە هەرێمی کوردستانیعیراقداو بۆ شێخ مەحمودی حاکمی کوردستان. هەر لە ساڵی (١٩١٨-١٩٢٤) بێ ئەوەی کەس بزانێ کەسو کارو ژنو ماڵی لە کوێ بەجێ هێشتووەو چۆن ژیاونو بێ ئەوەی هیچ باسیان بکات.

## کۆمەڵەی کوردستان

لە گۆڤاری( رۆژی نوێ)ی ژماری ٧ی ساڵی ١٩٦٠دا ژمارەیەکی تایبەتی باسی شێخ مەحمود دەکات و لەلاپەرە ٣٥دا نووسراوە:

رۆژی ٢١ی تەمموزی ساڵی ١٩٢٢ی زایینی لەسەر داوای حاجی مستەفا پاشا کۆبوونەوەیەك لە مزگەوتی سەید حەسەن کراو داوای دامەزراندنی کۆمەڵێکی کرد بە ناوی (جەمعیەتی کوردستان)ەوە . ئەم کۆمەڵەیە پێکهات بە سەرۆکایەتی ئەم کورد پەروەرانە:

(١)حاجی مستەفا پاشای بامۆکی

(٢) رەفیق حیلمی

(٣) ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ

(٤) ساڵح ئەفەندی قەفتان

(٥)حاجی ئاغا فەتحوڵڵا

(٦) فایەق بەگی مارف بەگ

(٧) عیزەت بەگی وەسمان پاشا

(٨) ئەدهەم ئەفەندی یوزباشی

(٩) ئەحمەد بەهجەت ئەفەندی یوزباشی

(١٠) شێخ محەمەد ئەفەندی گولانی

(١١) شێخ عەلی ئەفەندی سەرکار

(١٢) عەلی ئەفەندی باپیر ئاغا (شاعیر)

(١٣) عەبدوڵڵا ئەفەندی محەمەد ئەفەندی

(١٤) شوکری ئەفەندی عەلەکە .

## رۆژنامەی ( بانگی کوردستان ) زمانیحاڵی

## کۆمەڵەی کوردستان

یەکەم ژمارەی رۆژنامەی (بانگی کوردستان) لە ٢٢ی ئابی ١٩٢٢دەرچووە چواردە ژمارەی لە سلێمانیو سێ ژمارەی لە بەغدا ساڵی ١٩٢٦ دەرچووە .

لەم ژمارانەدا (رەفیق حیلمیو عەلی کەمال باپیر ئاغاو شێخ نوری شێخ ساڵح) شیعرو وتاریان تیادا بڵاوکردۆتەوە. بەرهەمی ئەدەبیو کۆمەڵایەتیو سیاسیی لەخۆگرتووە هەر یەك وەك وتراوە جێ پەنجەیان لە بواری خزمەت کردنو گەشەکردنی ئەدەبی کوردیو کاروانی رۆشنبیریی کوردیدا دیاربووە. (*) باوکم جگە لە نووسین لێپرسراوی بەشی تورکیو فارسیش بووە .

## مستەفا پاشای یاموڵکی دەچێت بۆ سلێمانی

لە ئەستەمبووڵ خەلیفە، مستەفا پاشا دەکات بە لێپرسراوی دیوانی عورفی بۆ سزادانی نیشتمانپەروەرەکانی تورك. کاتێ مستەفا کەمال سەردەکەوێتو خەلیفە وەحیددەدینو دەستەو تاقمەکەی هیچیان بە دەستەوە نامێنێو مستەفا پاشا بە خنکاندنو بەدارو فەلاقەی دیوانی عورفی ( نمرە ١) لە ئەستەمبووڵ نیشتمانپەروەرەکانی تورکی پێ تەمێناکرێ کۆڵدەدات، لە کوردستانی عیراقیش شێخ مەحمودی حوکمدار بەدیل دەگیرێو دەنێردرێ بۆ هیندستان خەڵك بۆ رزگاربوون لە حوکمی ئینگلیزو لەجەوری دەستو پێوەندەکانیان پەنایان ئەبردە بەر شەیتان ئینجا مستەفا پاشا گوریدایە بەرخۆی بەهیوای بزواندنی کوردەکانو بەرپاکردنی شۆڕشێك لە کوردستاندا بۆیە بەپەلە گەڕابووەوە بۆ سلێمانی(*)

مستەفا پاشا جەمعیەتی کوردستان دادەمەزرێنێتو رۆژنامەی (بانگی کوردستان) کە دەبێتە زمانحاڵی ئەم کۆمەڵەیە دەردەکات.

---

(*) بڕوانە باسی رۆژنامەی کوردستان نووسینی مامۆستا جەمال محەمەد ئەمین چەند دانەیەکی رۆژنامەکەمان لایە. دوایی بە درێژی باسی نوسینەکانی رەفیق حیلمی ئەکەین .

(*) ل ٥٠و ٥١ یاداشتی ٢ بەشی یەك

## جەمعیەتی کوردستان ٢١ی تەمموزی ١٩٢٢

دامەزراندنی ئەم جەمعیەتەو دەرچوونی رۆژنامەی (بانگی کوردستان) بە پێنووسی رەفیق حیلمی خۆی لە یاداشتەکانیدا وەك سەرەوە نووسراوە.

پاش باسکردنی هەواڵی کوردستان سەبارەت بەوە نوسیویەتی چی بەسەر هاتووە کاتێ ئۆزدەمیر هاتووە بۆ رواندزو ئینگلیزی لەوناوە دەرکردووە بە یارمەتی عەشایەری کوردو ئینگلیز نەویستەکانەوە. هەروەها باسی هەڕەشەی داگیرکردنی سلێمانیو سزادانی نیشتمانپەروەران و لاوازیی ئینگلیزو هەستانی عەشایەری عەرەبو سەرکەوتنی مستەفا کەمالو تنازولی سوڵتان وەحیددەدینو راکردنی مستەفا پاشا یامولکی لە تورکیاوە بۆ سلێمانی،کردووە، چونکە لەوێ (رەئیسی مەجلیسی عورفی) بووە لای خەلیفە لەدژی مستەفا کەمال. لەم کاتەدا مستەفا پاشا بە پێویستی زانیوە کۆمەڵێکی کوردیی دابمەزرێنێ بۆ بەرپەرچدانەوەی پرۆپاگەندەی تورکو پاراستنی سلێمانی لە هەڵمەتی ئۆزدەمیر و بۆ تازە کردنەوەی گیانی نیشتمانیو هۆشی میللی کورد واتا دانانی رێگا چارەی تەقەلایەکی تازە بۆ دامەزراندنەوەی کوردستانی سەربەخۆ.

ئەم باسە زوو کەوتە سەرزمان، ئینجا مستەفا پاشا مۆڵەتی لە حکومەتی سیاسیی سلێمانی وەرگرت لە (٢١ی تەمموزی ١٩٢٢) پاش نوێژی هەینی لە (مزگەوتی سەید حەسەنی موفتی) خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە مستەفا پاشا وتارێکی دوورو درێژی بەکوردی خوێندۆتەوە. دوایی بەهەڵبژاردنی نهێنی، ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە هەڵبژێردراون. بە پێی ژمارەی دەنگەکان بەریز ئەمانە دەرچوون:

١- رەفیق حیلمی - نووسەری ئەم یاداشتە.

٢-ئەحمەد بەگە تۆفیق بەگ کە دوایی بوو بە پارێزگاری سلێمانی.

٣-فایەق بەگی مارف بەگ ، خزمی سەعید پاشای باوکی شەریف پاشا.

٤-شێخ عەلی سەرکار، خاڵی حەپسە خانی نەقیب.

٥-شێخ محەمەد گولانی، لە زاناکانی سلێمانی بوو.

6-ساڵح ئەفەنی قەفتان، لە تاقمی بازرگانانی سلێمانی بوو هەروەها لەزابتەکانی دەوری عوسمانی بوو ماوەیەك لەئامادەیی، مامۆستای مێژوبوو.

٧-سدیق ئەفەنی عەلەکە، لە مەسیحییە کوردەکانو بازرگانە ناودارەکانی سلێمانیی‌و برازای کەریمی عەلەکە وەزیری مالیەی حکومەتەکەی شێخ بوو.

مستەفا پاشا کە خۆی دامەزرێنەری کۆمەڵەکەبوو کرا بە لێپرسراوی کۆمەڵەکەو ناونرا (کۆمەڵەی کوردستان)، لەگەڵ وەرگرتنی مۆڵەتدا کۆمەڵەکە مۆڵەتی رۆژنامەیەکیشی وەرگرت.

مستەفا پاش رۆژی ٢٢ی تەمموز واتە رۆژێك پاش دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە دەربارەی ئەوەی کە بووم بە ئەندامی (جەمعیەتی کوردستان) بە ئیمزای خۆی نامەیەکی بۆ ناردم ئەو نامەیە تا ئێستاش لام ماوەتەوەو لەناو نووسراوەکانی ئەو دەورەدا هەڵمگرتووە.

ئیمزاکەی

رئیس جمعیت کوردستا

متقاعد میر لوا (مستەفا)

باوکم دەڵێت "بۆ یەکەمجار لەماڵی مستەفا پاشا کۆبووینەوە. لەناو بڕیارەکانی تریشدا بڕیاری ئەوەدرا کە رۆژنامەکەمان بەسێ زمان (کوردی - فارسی- تورکی) بێت‌و ژمارەی یەکەمی (بانگی کوردستان) لە ٢ئۆگستۆسی ١٩٢٢ بڵاوکرایەوە من (نووسەری یاداشت) بێجگە لەنووسینی بەشێکی کوردی[*] و فارسییەکەی بە تایبەتی. سەرپاکی نووسینەکانی بەشی تورکیشم خرابووە ئەستۆ " ل ٧١

هەروەها دەڵێ " من کە کرامەوە بە مامۆستا لە مەکتەبی نموونەیی سەعادەت‌و گەڕامەوە بۆ سلێمانی [*] کاپتن هۆڵت معاونی حاکمی سیاسیی بوو تەماشای کاروباری مەکتەبەکانیشی دەکرد . جگە لەمە لە مەکتەبی نموونەیی سەعادەت-یش وانەی

---

[*] تا ئێستا کەس لە باسی رۆژنامەی (بانگی کوردستان) ئەم راستییان نەوتووە چۆن‌و کێ جگە لە مستەفا پاشا دامەزرێنەرو بڵاوکەرەوەی بانگی کوردستان بووە ئەوەتا رەفیق حیلمی کە لێپرسراوی بەشێکی کوردیەکەی بووەو دوایی باسی حیساباتیشی‌و داخستنی دەکات تائێستاش هەر بەسەر زاری وتراوە بەشداریکردووە لە نووسیناو سەرپەرشتی فارسی‌و کوردی کردووە.

[*] تەماشای لاپەرە (١٤٩-١٥٦)ی بەشی چوارەمی یاداشت بکە.

ئینگلیزی به پۆلی دوایین دەوتەوە. بەلام ئەم وانەیە وانەیەکی تایبەتی بوو. دەتوانم بلێم کە قوتابییەکانی ئەم پۆلەش لە رووی ئەم وانەیەی (هۆلت) ەوە چووبوونە ریزی قوتابییانی تایبەتیەوە. وانەی وای هەبوو دوو سەعاتی پێوە دەبوون لەبەر ئەوەی ( هۆلت) وانەکانی خۆی خستبووە دوای هەموو وانەکانەوە . لەو قوتابییانە هەندێکیان پێشکەوتن و لە حکومەتا جێگەی بەرزیان بۆخۆیان گرت.

عومەری سادق ئەفەنی یەکێ بوو لەو قەتابیانە. دوایی لە سوپای عیراقدا بوو بە زابت بەلام لە( شەری ئاوباریك)ی نێوان سوپای عیراق و شێخ مەحمودا کوژرا.

ئینجا کە من لە بەغداوە گەرامەوە بۆ سلێمانی و چوومە مەکتەب هەر ئەو رۆژە رەشید زەکی بابانی بەرێوەبەر ناردمی بۆ لای هۆلت کە چووم پێی وتی (هیوام وایە لەمەودوا لە سیاسەت دوور بکەویتەوە. خەریکی وانە وتنەوەو پێگەیاندنی قوتابییەکانت بی و لەم رێیەوە خزمەتی ولاتەکەت بکەی! .. منیش لە دلی خۆمدا وام نیازبوو کە توخنی سیاسەت نەکەوم و سەری خۆم کز بکەم، لەبەر ئەوە ئەو رۆژە کە (جەمعیەتی کوردستان) دامەزرا من بەتەما نەبووم بچمەوە کۆری سیاسەتەوە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە لە کاتی هەلبژاردنی ئەندامدا بۆ ئەنجومەنی ئیدارە ناوی من وەکو لەمەوبەر باسم کرد بە مەزبەتەیەکەوە درابوو بە حکومەت بەلام بە نامەیەك بە ئیمزای هۆلت پووچەلکرایەوە.
ئینجا لە رووی دژایەتیکردنی هۆلت یان حکومەتی سیاسیەوە بەرامبەر بە من رۆژی کۆبوونەوەکەی مزگەوتی سەید حەسەن لەسەر ئارەزووی یەك دوو هاورێ بەبێ مەبەستێکی تایبەتی و تەنیا وەکو سەیرکەر چووبوومە مزگەوتەکە . ئەوەم بە بیرا نەهاتبوو کە ناوی منیش بێتە ناو ناوان و بکرێم بە ئەندام . بەلام لە ئەنجامی کۆکردنەوەی دەنگەکانا بە زۆرترین دەنگ، بووم بە ئەندامێکی (جەمعیەتی کوردستان) بە پێویستم زانی بچمە لای هۆلت چونکە ویستم جارێ لە بارەی ئەم (جەمعیەت)ەوە لە بیری حکومەت بگەم. لەلایەکی تریشەوە بۆ من لە بیری هۆلت گەیشتن بە تایبەتی پێویست بوو. دەبوو بزانم کە دەربارەی هەلبژاردنی من بۆ کۆمەلەیەکی وا ئەلێ چی؟ داوام لێ ئەکات ئەمجارەش خۆم دوور بخەمەوە یان نا ؟ واتە ئەم ویست بۆم دەربکەوێ کە ئەم (جەمعیەتە) لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بە ئاشکرا پشتیوانی ئەکرێ یان هەر دووراو دوور چاودێریی دەکەن و بە هۆی مستەفا پاشاوە دەیبەن بەرێوە؟ بۆ ئەمەیش بیانووم بە

دەسـەوەبوو چـوومە لای هۆڵـت. لـە گـەڵ چـاوی بـەمن کـەوت نەیهێشـت قسـەبکەم ئـەو هەڵیدایێو وتی "پیرۆزبێ! بەڕاستی ئەم باوەڕە کە خەڵك بە تۆیان هەیە جێی پیرۆزباییە، هیوام وایە بتوانی خزمەتی نەتەوەکەت بکەی!" من وەڵامـم دایەوە وتم : بەم وشانەتانا دیارە کە ئەم جەمعیەتە سیاسیی نەبێ! چونکە پێم ناڵێی خۆمیان لێ دووربخەمەوە، وتی باوەڕ ناکەم کە (جەمعیـەت) شـتێکی وا خراپـەی لێ پەیدابێ، ئیتر ماوەی نـەدام لـە گـەڵی درێــژەی بـدەمێ، بـە بیـانووی ئـەوەی کـەکاری هەیـە دەسـتی گوشـیمو بەیەکـەوە لـە ژوورەکەی هاتینە دەرەوە. دوای ئەمە من بەدووررو درێژیی بیرمکردەوە لە تێکەڵبوون بەم کۆمەڵەیە یان دوورکەوتنەوە، گەلێ شتم بە بیردا هات. بەڵام لە ئەنجامدا وام بەباشزانی لە (کۆمەڵە)کەدابم، بەلامەوە وابوو کـە کـەڵکی خزمـەتم پێوە مـاوە بـە پێـی رەوشتێك کە بۆ خۆم کێشاومە دەتوانم بەڕێوەبچم".

"مستەفا پاشا خۆی هەڵسوڕێنەری (بانگی کوردستان ) بوو هـەر چـەند لـە نووسـیندا زۆری بەربەسـت ئەهێنایـە رێمـان دیسـانەوە کـەمو زۆر نووسـراوی باشـم ئەخسـتە رۆژنامەکـەوە بـە کـوردیو بـە تـورکی چـەندم پێکـرا بـۆ کوردایـەتی چیم بـە باشـزانی نووسیمو بڵاومکردەوە لەو رۆژنامەیـەدا بە تایبـەتی قینم لـە جلخوازەکـان ئـەبۆوە، لەبەر ئەوەی کە ئەوان قینی زۆریان لە کوردایەتی بوو من لەم کردەوەیەو لە نووسین دەربارەی کوردایەتی تاقەیەكو نەشئەیەکم وەرئەگرت .

مستەفا پاشا داخەکەم، زیاد لە پێویست سڵی لە ئینگلیزەکان ئەکردەوە. لەبەر ئەمە لای کـوردە خوێنگەرمـەکان و نیشـتمانپەروەرەکان ئەوەنـدە جێـی متمانـە نـەبوو، جلخوارەکان بە پیاوی ئینگلیزیان ئەزانیو زۆریان ئەبوغزاند . لەمانە جێی داختر زمانی ناڕەحەتی خۆی بوو، لەو رۆژەوەی هاتبووە سلێمانی نـاوو شـۆرەتی دەرەوەی پووی لـە کزیی کردبوو. هـەموو سلێمانی هەریەکـەی بەجۆرێ لـە خـۆی زیزکردبـوو تۆراندبوونی، واتە رەوشتێکی وای نەگرتبووتا لە خەڵکی سلێمانیی بباتە پێشەوە .

لە بیرو باوەڕیشدا لە گەڵ کەس رێنەئەکەوت، بەشتی ئەوتۆوە ئەنووسا کە بۆ مناڵیش نەئەشیا پێوەی بنووسێ ل ٤٩ هەر چەند میرلیوا یەکی ئەرکانی حەرب بوو بـەڵام خـۆی وا نەئەنواند خاوەنی رۆشنبیرییەیەکی بەرز بێو بەتەنگ دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکانەوە نـەبوو تاکـە رەوشـتی هـەرە باشـی ئـەوەبوو کـە کوردییەکـەی پـەتی بـوو لـە کاتێکـا لـە

دەوڵەتی عوسمانیدا جێو شوێنی بەرزو بەڕێزی هەبوو بە کوردییەکی پەتی بێ فیزو هاوشاریی پەروەر ناسرابوو، ناوی دەرکردبوو. لەکاتی تەنگو چەڵەمەدا فریای گەلی کوردو خۆولاتیەکانی دەکەوت. لەبەر ئەمە ئەوانەی ئەیانناسیو ئاگاداری رابووردووی بەشکۆی بوون بەڕێزەوە تەماشایان ئەکردو دەورەیان ئەدا.." هەرچەند پێشبینی زۆرتر ئەکرا بەڵام (جەمعیەتی کوردستان) و رۆژنامەکەی کەمو زۆر خزمەتی کوردایەتیو مەسەلەی کوردیان کردو بە هۆی (بانگی کوردستان)ەوە بوو کە پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە هیندستان سلێمانی چووبووەوە دۆخی جارانو بووبووەوە بە ناوچەی جووڵانەوەی کوردایەتیو بەرزبوونەوەی ئاوازی نیشتمانپەروەران.

چونی مستەفا پاشا [*]بۆ لای سمکۆ [*] کە سمکۆ بەگژ ئێراندا چووبوو پاش ئەوە دەستێکی خراپی لە نەستووریەکان وەشان بوو، مارشەمعونی کوشت بوو ئیتر (٤٠,٠٠٠) ئاشوریی رایانکرد بۆ عیراق بۆ بەعقوبە. لە ئێران سمکۆ هەموو ورمیە (رەزاییەی ئەمڕۆ) و بەشێکی زۆری تەورێزی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە ئەهالی ئازربایجان ترسانو هەڵاتن هەروەها خەڵکی سابلاغو سەردەشت. هەندێکیان هاتن بۆ سلێمانیو باسی زەبرو زەنگی تورکیان دەکرد. لەم کاتەدا جەنگی تورکو یۆنان پەرەی سەند لە ئاسیای بچووکدا، بۆیە بزووتنەوەی سمکۆو هێرشی بۆ سەر ئێرانو سنووری تورکیا تورکەکانی خستبووە مەترسییەوە، بە تایبەتی کە مستەفا پاشا چوو بۆ لای دەترسان لەوەی بزوتنەوەکەی بەهۆی کۆمەڵە سیاسییە کوردییەکانەوە رەنگێکی تر وەربگرێو بە بارێکی تردا وەربگەڕێ. نەشیان ویست بە پەلە بجووڵێنەوەو دەست بۆ سمکۆ درێژ بکەنو لە پێشدا خۆیان لێ نزیک خستەوە بە ناوی دیارییەوە هەندێك چەکیشیان بۆ ناردو وردە وردە هەڵیانخەڵەتاندو سمکۆ ئیتر بەلای تورکەکانا نەچوو، پاش شکاندنی هێزی ئێران تورك بە جارێ کەوتە مەترسییەوەو دەستی خۆی وەشاند، بەدزییەوە شەوێك دەستەیەك سواری گورجوگۆڵی کردە سەر لە نیوە شەودا دایان بەسەر ناوچەی لەشکرگای سمکۆدا گەلێ پیاوماقووڵ و ژنێکیش کوژران، خوسرەوی کوڕی

---

(*) تورکەکان بە مستەفا پاشایان وتووە نەمرود بەهۆی رەئاسەتی دیوانی عورفیەوە لە ئەستەمبووڵ لەبەرکردەوەکانی.

(*) ئیسماعیل خانی شکاك ، سمکۆ سەرۆکی عەشیرەتی شکاك بووە.

بەدیلگیراو غەزنەیان تالانکرد. خۆیو برایەکی لەگەڵ دەستە سوارێك کشانەوە بۆ دەوری رواندز ،لە سلێمانیەوە هەندێك زابتی نیشتمانپەروەر چووبوون بۆ یارمەتی بەلام بە هۆی ئەم رووداوەوە بە نائومێدیی گەڕابوونەوە. (*)

ئینجا رەفیق حیلمی باسی پروپاگەندەی جلخوارەکان ئۆزدەمیر دەکات کە تورك موسڵ دەگرێتەوەو بەرەو سلێمانی دێت لەسلێمانی بەهەوڵدانو مەزبەتە دروستکردن داوای گەڕانەوەی شێخ کراوە مستەفا پاشاو شێخ قادرو حەپسەخانی نەقیب لەمانەدابوون. ئینگلیز لە ترسی ئۆزدەمیر رایانکردووە بۆ بەغدا، سلێمانی بێ حکومەت ماوەتەوە بە سەرۆکایەتی شێخ قادر کۆبوونەوەیەك بۆ دانانی (مەجلیسی میللی) بۆ پاراستنی شارەکە رێکخراوە، سیخوڕی ئۆزدەمیر هەوڵی تێکدانی کۆمەڵەکەیانداوە. (کەریم بەگی فەتاح بەگ) کەپیاوی ئۆزدەمیربووە لەگەڵ چەند نەفەرێکی تر دەچنە ناو کۆبوونەوەکەو مستەفا پاشا دەگرنو لەسەرا حەپسی دەکەن . کەریم بەگ وتویەتی ئەمە لای تورك تاوانبارە ئەینێرێتە لای ئۆزدەمیرو ئەمەش بەواتا فەوتانی دێت.

بەلام (مەجلیسی میللی) هەر دادەمەزرێت بە سەرۆکایەتی شێخ قادرو ئیتر پاراستی سلێمانی هەمووی دەکەوێتە دەستی ئەمەوە، دەستەی لاوانی نیشتمانپەروەر لە گەڵ حەشاماتێکی گەورەی ئەهالی دەدەن بەسەر بەندیخانەی سەراداو مستەفا پاشا دەبەنەوە بۆ ماڵی خۆی (*)

چونی مستەفا پاشا بۆ لای سمکۆ و هاندانی بۆئەوەی بچێتە سەر تورك، تورکەکانی شێت کردووە.

---

(*) کە لە سوید سیاسەتی دەولیم دەخوێند نووسیبوویان کورد لە خۆیان ئازاتر نییە بەلام دڵ سافو پاكو ساویلکەو خۆش باوەڕنو ئەمە یەکەم دەردی سەرییانەو هۆی نەگەیشتنیان بە میواکانیان ئەوەتا راستە سمکۆیەك کە ئازایانە زۆرشاری ئێرانی گرتووە بە دەستەیەك لەسوارەی تورکو بەئاسانی هەڵخەڵەتاوە.

# مەسەلەی موسڵو حکومەتی دووەمی شێخ

هەر ئەوەندە باسدەکەین کەچۆن شێخ دێتەوەو دەبێتەوە بە حوکمداری سلێمانی چونکە ئەمە دیسان پەیوەندیی هەیە بە ژیانی سیاسیی رەفیق حیلمییەوە کەسیاسەت هەموو ژیانی بووە .

بە هیچ جۆرێك مستەفا کەمال ناشکێتو تورك دەکەوێتە داوای موسڵ- ئینگلیزەوە لەبەر ئەمە بیر لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیی دەکاتەوەو بڕیاردەدات شێخ مەحمود بنێرێتەوە بۆ سلێمانی. جڵەوی ئیدارە لەدەست ئینگلیز دەردەچێت سلێمانی نادرێتە حکومەتی ساوای عیراق، هەرچەندە هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی مەندووبی سامیدا بووە . کوردستان پێویستی بە ئیدارەیەکی نەتەوەیی بووە، هەموو کورد لە ئینگلیز هەڵگەڕاونەتەوەو داوای ناردنەوەی شێخ مەحمودیانکردووە داوای دامەزراندنی حکومەتی کوردییانکردووە. ئینگلیز بەتەمابوون حکومەتی شێخ مەحمود ئۆزدەمیرو هێزە تورکەکە لە رواندز دەربکات. مستەفا پاشا دەستی هەبووە لە هاتوچۆی نێوان ئینگلیزو بەرەی شێخاندا.

## پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود زەماوەندی
## هەڵکردنی ئالأی کوردستان(*)

رەفیق حیلمی دەڵێ: پێش ئەوەی ئینگلیزەکان لە سلێمانی دەربچن ئەو چۆتە کەرکووك بۆ کۆکردنەوەی ئابوونەی ( بانگی کوردستان) لەوێ بیستویەتی ئینگلیزەکان بە فرۆکە ڕایانکردۆتە بەغدا کە ئەم دەیەوێت بگەڕێتەوە وادەزانێت (جەمعیەتی کوردستان) دەبێت ئیتر زیاتر بکەوێتە کار. لەو کاتەدا هۆی گواستنەوەی لە کەرکووك بڕراوە .لە تەمووزی ١٩٢٢دا باوکم لەگەڵ سەید ئەحمەدی هەنجیرەدا دەگەڕێتەوەبۆ سلێمانی، ئەمە بۆ هەواڵی گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە بەغداوە بۆ سلێمانی چۆتە ماڵی کەریمی حاجی ئەولا برای ئەحمەد ئاغا، مەجلیسی میللی سلێمانی ناردوویەتی بۆ کەرکووك، حەشاماتێکی زۆر ڕژاونەتە ناوشاری سلێمانی بۆ پێشوازیی شێخ مەحمود، لێرەدا باوکم باسی بیروڕای دەکات سەبارەت بە جەمعیەتی کوردستانو ڕۆڵی لەم کاتەدا . وایزانیوە کۆمەڵە ئیتر دەبێت بە جۆشو خرۆش بکەوێتە کار، نەهاتووە بە بیریدا ئەمە لە خۆیەوە ناجوڵێتەوە، ئینگلیزەکان کە لە سلێمانی بوون دەستیان هەبووە لە جەمعیەتەکەدا. بەڵام نەیزانیوە کە ئەوان نەبن ئیتر کۆمەڵەکەش لەکار دەکەوێ. رەفیق حیلمی دەڵێ دوای ئەمە زانیم (جەمعیەت) و ئەو کۆمەڵانە بە ئیشارەتی بێگانەکان دائەمەزرێنو نابێ بەتەمای خزمەتو چاکەیانبم. ئەمانە گەلێ جار بەهۆی بێگانەو کاربەدەستانیانەوە دائەمەزرێن کە سیاسەت بە کاسبی دائەنێن. ئەندامانی پاکی نیشتمانپەروەری ئەو جەمعیەتانە بەهەڵەدا چوون کە باوەڕ بەڕووی دەرەوەی خەڵکی دەکەن یان بە تەمادەبن بە زۆرانبازیی لە گەڵ بەرهەڵستکاراندا کەڵکی قەومییان ببێ. باوکم وایزانیوە لە ڕۆژی دامەزراندنی حکومەتی کوردا کۆمەڵە قۆڵی لێ هەڵدەکاتو تێدەکۆشێ کە چی بڵاوەیکردووەو لە کار کەوتووە، مستەفا پاشا ئیتر بەلای کۆمەڵەدا نەچووە. "بانگی کوردستان"یش لە جیاتی ئەوەی دەنگی کورد بە هەموو جیهان بگەیەنێت ، گیانی میللیو بیری کوردایەتی بڵاوبکاتەوە هەر بە جارێ بێ دەنگ بووەو پەیڕەوی قسەی خاوەنەکەی کردووەو کشاوەتەوە دواوە. رەفیق حیلمی ویستویەتی

(*) بڕوانە درێژەی ئەم باسە لەگەڵ باسی ئەوکۆمەڵانەی ڕەفیق حیلمی کاریتێداکردوون.

ئابوونـەکان بنێرێتـەوە بـۆ کـەرکووك بـەڵام مستەفاپاشـا نەیهێشـتووەو ئابوونـەکانی لێ وەرگرتووە بە پسووڵە (وەسڵ).

بـاوکم تەقەلایـداوە بـۆ پێشخسـتنی (بـانگی کوردسـتان)و بڵاوکردنـەوەی بـە دەسـتوورێکی نـوێ بـەڵام سـەری نـەگرتووە دەڵـێ کـە وتومـە ئابوونـەکان دەنێرمـەوە نەیهێشـتووەو وەسـڵی لێوەرگرتـووم ئـەو وەسـڵانەش مـاون لـەناو شـتەکانی ڕەفیـق حیلمیدا.

باوکم وەك ئەندامێکی دڵسۆز زۆر هەوڵیداوە لەگەڵ پاشاو سەرۆکی ئەنجومەنی میللی دا کـە ڕۆژنامەکـە بمێنێـتو خزمـەت بکـات بـەڵام سـوودی نـەبووە، بۆیەدەرکـەوتووە ئەمجارەش هەل لەدەست دەرچووە.(*)

بناغە بۆ حکومەتی کوردیی دانەڕێژراوە، "بەڵکو لەسەر حیسابی کوردو کوردستان نواندنێکی شانۆیی نوێ بەدەستەوە بووە"واتە ڕەفیق حیلمی هەرپێش گەڕانەوەی شێخ مەحمودو حکومەتەکەی بۆ دووەمین جاری لەگوماندابووە کەسەر ناگرێو هەرواش بووە وەك لەمەودوا دەیبینین.

پەردەی یەکەمی شانۆییەکە ڕەفیق حیلمیشی هەڵفریواندووە بۆیە دەڵێ "وایلێکردم هەست بەشـتێ بکـەم، تـەزووی شـادی بـە لـەشمابێ، خـوێنێکی گـەرمو خـۆش بـە دەمارەکانما بکەوێتەگەڕ" بڕواننە وەسفی هەستی خۆیو باسی ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردسـتان؟ کـاتێ لـە مـاڵی سـەرۆکی ئەنجومـەنی میللـی شێخ قـادری حەفیـد بڕیـاردرا گۆنگرەیەکی گشتی ببەسترێ کە بەدەستوورێکی ڕەسمیی ئاڵای میللـەتی کوردی تیادا هـەڵبکرێ. بۆئەمـەش هەزارکـەس لەمزگـەوتی گـەورە کۆبوونەتـەوە ئینجا وەك بـە ڤیـدیۆ وێنـەی ئـەو کۆبوونەوەیـە گیرابێـت ڕەفیـق حیلمـی باسـی ئـەو حەشاماتەیکردووەو چۆن

---

(*) بڕوانن ڕەفیق حیلمی چ ڕەنجێکی داوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵانە وەك سـەربەخۆیی کورد بۆ حەمدی بەگی بابانو (جەمعیـەتی کوردستان) ی مستەفا پاشا و بانگی کوردستانو ڕۆژنامـەکانی تریش، چ ئومێدێکی هـەبووە پێیـان بۆ خزمـەتی کورد کەچی کە باس دەکرێت هـەر دەڵێن ئەندام بووە یان لـەو بڵاوکراوانـەدا نووسیوویەتی.

لەم دواییەدا کوڕاسێکم بەرچاو کەوت چەند ژمارەیـەکی ڕۆژنامـەی (بانگ حـەق) و (ئومێدی ئیسـتیقلال)ی تیادا دانرابوو. وابزانم ئەمە کاتێ بووە کە( بانگی کوردستان) ڕاگیراوەو ئەمە لە جێی ئەو دەرچووە بـەڵام دیارە هەرچەند ژمارەیەکی لێدەرچووە.

ڕێکخراون و چی کراوە. لەدەوری حەوزی ناو مزگەوت لە پێشەوە ڕیزی قوتابیان یەکەم ئەڵقەبووە ئینجا ئەڵقەی خەڵکەکە لە دەوریان کچ و کوڕ سروودی میللیان خوێندوە بە دەنگێکی خۆش باوکم سەبارەت بەمە وتوویەتی :پیاوم ئەویست فرمێسکی شادمانی نەڕێژێ ؟!

دواتر باسی خۆی دەکات و دەڵێ "من بەسەر دونیاوە نەمابووم، لە ئاسمانی خەیاڵ پەرپازیم ئەکردو ئەفڕیم، لەپڕ سەرکەوتمە سەر کورسی یەك و هەر لەبەر وتارێکی دوورو درێژم خوێندەوە وشەکان وەك تەرزە لەدەمم هاتنە دەرێ، بەڵام تەرزەیەکی وا بەڕاستی کە لە ناوەندی وتارەکە موچڕکێکی سارد بەلەشمدا هات. دانەکانم کەوتنە چۆقەچۆق، ئەژنۆکانم هاتنەلەرزین. ئەوەندەی نەمابوو لە کورسی یەکە بکەومە خوارەوە! بەڵام دانم بەخۆمدا گرت و هەر چۆنێ بوو وتارەکەم گەیاندە دوایی."(*) ئینجا ئاڵای کوردستان وردە وردە بەرز بۆوە لەگەڵ دەنگی ئاوازو مۆسیقادا.

ڕەفیق حیلمی دەڵێ" ئیتر لەو ڕۆژەوە چاوم بە شێخ قادر نەکەوتەوە" دواتریش نەچۆتە لای و لێی نەپرسیوەتەوە چونکە لێی زیز بووە.

کەنیشتمانپەروەرو زابتەکان دوور خراونەوە، عەشایەر خراونە پێشەوە (بەحوکمی سیستمی دەرەبەگایەتی) بەڵام مەجلیسی میللی ڕۆڵی باشی هەبوو لەڕووی ئاسایشەوە.

---

(*) بڕواننە ل ٥١٢- ٥١٣ یادداشتی (٥).

# گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانیو بە پیرەوەچوونی

## ( حوکمدارێتی دووەم )

دەبووایە شێخ مەحمود لە بەغدا بە گفتوگۆی (مندوبی سامی) و (مەلیك فەیسەڵ) بکرایە بە (رەئیسی مەجلیسی میللی) بەڵام ئەمەیان گۆڕی بە ناوی ( حوکمداری کوردستان) چونکە شێخ ئەوەی تریانی بەدڵ نەبوو.

پێش هاتنەوەی، دەستەیەك زابتی لەگەڵ نێردرا کە هەستی نەتەوەییو نیشتمانیان بڵاوکردبووەوە.سەبارەت بەدەستەی مامۆستایانیش رەفیق حیلمی دەڵێ: ئێمەیش چیمان پێکرا کردمان، گۆرانیی بە پیرچوونەوە فێری خەڵك کرا ئەهالی عەشایەر تا کفریی یان تا بەغدا بە پێ یان بە سواریی نزیکەی (٢٠)هەزار سواری کورد رژانە ئەو دەشتە، شێخ دەرکەوت بە شکۆیەکی شاهانەوە لە (٣٠)ی ئەیلوولی ١٩٢٢ گەیشتە سلێمانی. باوکم پێی وابووە کە ئەگەر ئەوکاتە هۆی پێویست ببوایە بۆ تۆمارکردنی دیمەنی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانیو بکرایە بە شریتی سینەمایی هەریەکە لەودیمەنانە تابلۆیەکی رەنگینو بەنرخ دەبوو. بەڵام وا بزانم باوکم خۆی بەو وەسفە جوانە بەو پەخشانە نایابەی جێی ئەو ئامێرانەی تۆمارکردنی گرتۆتەوە کە ئاواتی خواستووە لەوکاتەدا لەوڵاتەکەماندا هەبوونایە،بڕوانن چ تابلۆیەکی بۆ نەخشاندووین (*).

بۆ وێنە دەڵێ "چۆن لە بیرم بچێتەوە؟! لە لایەکەوە گریانی خۆشیو هەلهەلەی شۆڕە ژنی مێخەکبەند لەملو هەیاسە لەپشت لەولای تڕەوە گوڵبارانو قریوەی کچۆڵە خنجیلانە ئێسك سووکە پەنجە خەناوییەکان. فرمێسکی شادی بە چاوەکانما ئەهێنایە خوارەوە، ئەمەش بیرچێتەوە! ئەی ئەو رۆژە کە سلێمانی بووبوو بە رۆژی حەشر! هەزاران پیاووژن بەچەپڵە رێزانو دەنگی هەربژی و کچو کوڕ بە بەرگی نەورۆزەوە، گۆرانی نیشتمانی چریکەی نێرانەی زابتەکانی کوردو سیرەی هەڵکێشانی شیرە بریقەدارەکانیان تەقو هوڕی دەمانچەو هتد ... لەگەڵ ناڵەو گرمەی تۆپ، گوێی کەڕ

---

(*) بڕواننە درێژەی ئەم وەسفە ل ٥١٦-٥١٨ یاداشتی پێنجەمی هەروەها بڕواننە باسی نووسینی پەخشانی رەفیق حیلمی لەبەشی دیکەی ئەم کتێبەدا.

دەکرد، هەموو ئەمانە لەهۆشیان دەبردی کە لەژێر سێبەری شیرو تفەنگدا حوکمداری کورد گەیشتە پێشەوە! دەنگی نێری شێرانەی زابتێك عەسکەرەکانو مامۆستاو قوتابییەکانی بۆ سلاوی حوکمدار وریاکردەوە! دووبارە چەپڵە ڕێزانو گوڵباران تێکەڵ بە ئاوازی شیرینی رەنگی قوتابیان بوو"!

لەو رۆژەدا شێخ مەحمودو نۆئێل(*) بۆ ماوەیەك لەحەوشەی ماڵی میرزا فەرەج حەسانەوە قوتابیانو گشت ئەهالیو سەرەك عەشایەر ڕیزبوون شێخو موستەشاری سیاسیی لەسەر پێپلیکانەکان وەستان.

دیسان لەوێشدا رەفیق حیلمی سەردەکەوێتە سەر تەختەبەندێکی بەرزو دەستدەکات بەقسەکردن و وتارێکی دوورو درێژی دەخوێنێتەوە. بە درێژایی وتارەکە چەپڵە ڕێزان بەردەوام دەبێت. بە تایبەتی قوتابییەکان خوێنیان هاتە جۆشو حەماسەتیان کاری کردەسەر ئەهالیو عەشایەر، باوکم دەربارەی ئەم وتارەی دەڵێ" لەوەدا نەمابوو وشە بە تەرازووی سیاسەت بکێشم، باسی رۆڵی سەرەکیی شێخم دەکردو لە هەڵەکانی ئینگلیز دەدوام، توانجم تێدەگرتنو تانووتم لێدەدان (*)بە کورتی ئەم وت: "لەسەر ئینگلیزەکان پێویستە ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەنەوە کە جاری پێشوو کردیان، ئەبێ بەڕاستی پشتی شێخ بگرنو هەر لە گۆشەی مەبەستو قازانجی خۆیانەوە تەماشای ڕووداوەکان نەکەن(*) ئەبێ باشبزانن کە فریودانی شێخو کورد بەئەنجامدا زیانی بۆ ئینگلیز زیاترە" ئینجا بایداوەتەوە سەر خۆمان واتە سەر کورد وتویەتی"لەسەر خۆشمان پێویستە کە قازانجی نەتەوەکەمان بخەینە بەرچاو ودەستبدەینە دەستی یەكو ماوەی ئەوە نەدەین فریومانبدەن، بمانکەن بە کوتەکی دەستیان ئەمیش بۆ خزمەتی سیاسەتو قازانجی بێگانەکان" کە ڕوانیویەتی بینیویەتی نوئێل تەواو گرژبووە بەلام شێخ پێی خۆشبووە ئەگەرچی لێوی کرۆشتووە لەبەر نۆئێلو هیچی نەوتووە.

---

(*)رەفیق حیلمی نوسیوویەتی: "یارمەتی نۆئێل-م دەدا بۆ وەرگێڕانی قەیدەکانی مالیەو گومرگ لە تورکیەوە بۆ فەرەنسی بەتەما بووم لە گەڵی بچم بۆ کوردستانی تورکیا ".

(*) ل ٥٢١ یاداشتی پێنج

(*) ٥٢١ هەمان سەرچاوە

## دەبێت بەرەئیسی تەشریفاتی شێخ مەحمود

لە لایەن (مەجلیسی میللی)و لیژنەی بە پیرەوەچوونی شێخەوە رەفیق حیلمی کراوە بە (رەئیسی تەشریفات) کەدوای تەواوبوونی وتارەکەی دوای شێخ و نوئێل دەکەوێت و لە گەڵیاندا دەچێتە ئەو ژوورەی کە بۆ زیارەت و چاوپێکەوتنی حوکمدار رێکخراوە.

## وەسفی چاوپێکەوتنی شێخ لەگەڵ خەڵکی

خەڵکەکە پۆل پۆل چوونەتە ژوورەوە بە پێی ناونیشان ، رەفیق حیلمی پێشکەشی حوکمداریکردوون یان دەستیان گوشیوە یان ماچیانکردووە. حەشامەت هێندە زۆر بووە ماوەی گفتوگۆ نەبووە. تۆفیق وەهبی سەبەتۆلکەیەکی ئاوریشمی تایبەتی پڕ لەگوڵی داوەتە دەست باوکم لەگەڵ دوو گوڵەباخ،گوڵەکان بۆ یادگاریی ئەو رۆژە بەسەر زۆربەی خەڵکدا دابەشکراون و دوو گوڵەباخەکەش بۆ حوکمدارو نۆئێل بوون کە حوکمدار بە سوپاسێکی گەرمەوە بەرۆکی بۆ راگرتووە بەڵام نۆئێل بە روویەکی ترش و گرژەوە بۆی روانیوە ورەنجاویی خۆی بۆ دەرخستووە. رەسمی تەشریفات زۆری کێشاوە تا ئێوارەیەکی درەنگ.. نۆئێل لەسەر کورسییەکی رەق نزیک دەرگاکە هەر هەستاوەو دانیشتۆتەوە.

شێخ تا (١٠) رۆژ پاش مەراسیمەکە چووە خەڵوەتەوە. رەفیق حیلمی دەڵێ بەتەمابووم دوای مەراسیم لەشێخ دوور بکەومەوە. بەڵام حوکمدار نەیهێشتووەو ئەمری پێکردووە لای بمێنێتەوە.(*)

## پێوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود لە سەردەمی حوکمدارێتی دووەمدا :

وەك وتمان لەسەرەوە دوای مەراسیم شێخ مەحمود ئەمری بە رەفیق حیلمی کردووە لای بمێنێتەوەو بە جێی نەهێڵێت .(*) ئینجا رۆژ بەرۆژ بە تایبەتی دوای نیوەڕۆ

---

(*) بروانە لاپەرە (٥٢٣) یاداشتی پێنج

(*) بروانە یاداشت ل ١٠٦– ٥٢٣ .

کـە کەسـی غـەریبیان لـەدەور نـەماوە ڕەفیـق حیلمـی چـۆتە ژووری تایبـەتی شـێخ و گفتوگۆیانکردووە. باوکم دەڵێ بە تەواویی لە مەبەستی ئەو خەڵوەتە نەگەیشتووم. بێ ئۆقرەو کـەم بـاوەڕ دەهاتـە بەرچـاوم . لەسـەر قـەرارێ نەدەوەسـتا.... لەگـەڵ ئەوەشـدا (وەزارەت) هەیئـەتی ڕوئەسـای دانـاوە .[*] شـێخ لـە پرێکـدا لـە خەڵوەت دەچێتە دەرێ و دەست دەکات بە تەماشاکردنی کاروباری حکومەت.

ڕەفیق حیلمی بە وردی سیاسەتی ئینگلیز لەگەڵ شێخدا شیدەکاتەوە بەڵام لێرەدا ماوەی درێژەدان بەم باسەمان نیە چونکە لە یاداشتەکانی باوکمدا وەك یاداشتی پێنج بەدوورو درێژی باسی ئەم قۆناغەکراوە. ئاسان نییە حەوتبەشی یاداشتی پیاوێکی وەك ڕەفیق حیلمی لەم چەند لاپەڕەیەدا کورتبکرێتەوە،بۆیە لەمەودوا هەوڵدەدەین تا بتوانین ئەوەی زۆر پێوەندیی نەبێت بە ژیانە تایبەتییەکەیەوە نەینووسین. ئەوانـەی عـەوداڵی یاداشتەکانی باوکمن لە(٧) بەرگدا لە چاپدراون دەتوانن پەیدای بکەن و بیخوێننەوە. بەداخەوە باوکم بەنیاز بووە یاداشتەکانی (١٨) بەرگ بێت بەڵام فریا نەکەوتووەو هیچی وا بەدەستەوە نییە کە کەس بتوانێت لەم چاپکراوانە زیاتر بنووسێتەوەو لە چاپیان بدات. گرنگترین قۆناغی ژیانی ڕەفیق حیلمی بەمە بۆتە نهێنی، کەس تا ئێستاش ڕاستییەکەی نازانێت تەنانەت ئێمەیش کە منداڵەکانی ئەوین، چونکە ئاگامان لێ نەبووە لە ژیانیدا چی کردووەو چی بووە، بە تایبەتی ئەو سەردەمەی سەرۆکی باڵای پارتی هیوا بووە. وەك کاك جەمال بابان وتبووی بەدەم کاك فایەق هوشیارەوە هەرچی باسی ئەو پارتەیەو چی هەبووە سەبارەت بە پارتی هیوا کە ڕەفیق حیلمی وازی لێ هێناوە بە فایەق هوشیاری وتووە لە سێ سندوقی تەختەدا بوون لە ماڵی خەزووری ڕەفیق حیلمی، فایەق هوشیارو مەحمود خەفاف چوون لەوێ بردوویانەتە ماڵی کاك فایەق و هەموویان سووتاندووە، بۆیە هیچ شتێك تەنانەت وێنەیەکی ئەندامان یان پارچە کاغەزێك یا دەفتەرێك نەماوە ولەبەشی باسی پارتی هیوادا لەم کتێبەدا هەرچی پاش ڕەفیق حیلمی

---

[*] بڕوانە ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان ژمارە (١٠)
بانگی کوردستان ماوەیەك دوای گەڕانەوەی شێخ بڵاوکراوەتەوە دوایی "ئومێدی ئیستیقلال" جێیگرتووە. ڕەفیق حیلمی بە نامەی شێخ بۆتە لێپرسراوی بۆ ماوەیەك.

دەستم کەوتووە لە نووسینی خەڵك و هەندێ وەڵامی خۆشم هەر ئەوانەم داناوەو باسکردووە بەهیوای ئەوەی بەشێك لەو کەلێنە گەورەیە پڕ بکاتەوە.

## سەرئەنجامی حکومی دووەمی شێخ مەحمود

باوکم لە کۆتایی بەرگی پێنجی یاداشتەکانیدا ئەم نامەیەی مێجەر ئەدمۆنز (موستەشاری پێشووی وەزارەتی ناوخۆی عیراق) کە لە لەندەنەوە بۆی ناردووە بڵاودەکاتەوە، کە ئەمە ڕای یەکێك لەو کاربەدەستە ئینگلیزانەی ئەو سەردەمەیەو پیشانیدەدات بۆچی حکومەتی دووەمی شێخ سەری نەگرت وەك چۆن ئەوەی یەکەم زوو تێکشکا.

لەنامەکەدا دەڵێ "بەڵام هەوای نەشئە بەخشی کێوەکانی سلێمانی شێخ مەحمودی سەر مەستکرد. لەبەر ئەمە هەر گفتێکی دابووی‌و هەر پەیمانێ لەگەڵ گەورەکانی حکومەتی بەغدا کردبووی لە بیری چووەوەو زۆری پێ نەچوو ناوی خۆی نا (مەلیکی کوردستان) و دەستی کرد بە داواکردنی شارە کوردەکانی ترو هەموو ئەو خاکەی بە کوردستان ناو ئەبرێ‌و[*] تا سنووری جەبەل حەمرین درێژ دەبێتەوە."

ئەم نامەیەی لە The middle East Jornal – The Kurds of Iraq دا بڵاوکردۆتەوە. ڕەفیق حیلمی لە کۆتایی یاداشتی پێنجدا لە (ل٥٢٩)دا دەڵێ" شێخ مەحمود لە گەنجێتیا تەنیا ئامانجێکی هەبوو ئەویش سەربەخۆیی کوردستان بوو لەبەر ئەمە لەوانە بوو کە لە ڕێی ئازادیی کوردا خزمەتی ئینگلیز بکات. بەڵام ئینگلیزەکان لە ئاستی ئەوا چاویان نەیدەبینا. ئەیانویست بە بەرتیل‌و تەماعی دونیا بیکڕن نەیان ئەزانی بیکەن بە هاوپەیمانی خۆیان. بە زۆرو بە فێڵش نەئەکرا بە مەقاشی دەست‌و بۆیان نەئەخرایە قەفەزەوە، لەبەرئەوە هێشتا بە ڕێی بەغداوە بوو دوو دڵیی کەوتبووە بەینەوە. هەر لەڕێ بووە کە ئینگلیزەکان بیریان دەربارەی گۆڕیووە بەڵام تازە کار لەکار ترازاوە، بۆیە بە ناچاریی قایل بوون عینوانی ڕەئیسی بکات بە (حوکمدار) مەلیکیشی بەتەمای ئەوەی تورکەکان دەربکات‌و مەسەلەی موسڵ ببڕێنێتەوە دانی نا بە حوکمداریی

---

[*] ئەمە بۆ ئینگلیزەکان دەستی نەداوە، ئەوان بەڕاستی بۆ کوردو کوردستانیان نەهێنابووە هێنابویان ئۆزدەمیرو ورکی پێدەرکەن‌و مەسەلەی موسڵیان لە دەست دەربهێنن لەبەر نەوتەکەی.

شێخداو پەیمانیدایە لە وێنەیەکی فراوانا (خودموختاریەت) بدرێ بە کورد، شێخ مانگێکی پێ نەچوو عینوانی حوکمداریشی کرد بە (مەلیکی کوردستان) لەتشرینی دووەمی دا١٩٢٢. ئینجا داوای سەربەخۆیی سەرتاپای خاکی کوردستانی کرد".

## بۆ مەسەلەی کورد سەرینەگرت و چۆن چارەسەردەکرا

هۆیەکی تری سەرنەگرتنی حکومەتیی دووەمی شێخ لەزاری یەکێ لەو بیانیانەوەی ئاگاداری کێشەی کورد بوون و ناوی (ئیلڤەستن)ە، ئەوە بووە کە "کورد ئازان لە توانایاندا هەیە زۆر شتبکەن، بەڵام یەکێتییان نییە، لەناو یەکتریدا دڵ پیسن و نایانەوێ سەرکردەیەك دەستبخاتە کاروباری سەرکردەیەکی ترەوە. هەرچەند کە دوژمنیان یەك بوو ، بۆ لابردنی یەکدەگرن." بۆ یەکناگرن؟ سروشتی وڵاتەکەیان شاخاوییە، بە سنووری سروشتی خێڵ و دێهات جیاکراوەتەوە، سەرەڕای سنووری دەستکرد کە بیانیی دروستیکردوون و هێندەی تر خاکەکەیانی پارچە پارچە کردووە. لە تورکیاوە سەرەتای کێشەی کورد دەستی پێ کردووەو هەر لێرەشەوە نەتوانراوە چارەسەر بکرێت. بۆ سیاسەتی تورك باشە کە بە گیانێکی پاك و دڵسۆزانە لە گەڵیاندا هەڵسوڕێن، تا ئەم مەسەلەیە بە جۆرێکی باش ببڕێتەوە. پەیماننامەی ئەتلانتیك تروسکەی ئومێدی ئازادیی بۆ کوردیش تیا بوو، پێش ئەوەی کورد داوای بکات تورك خۆی بیبەخشیایە بە کوردەکان. هەروەها کۆمەڵی سان فرانسیسکۆ تروسکەی ئازادیی و سەربەخۆیی بۆ گەلان تێدا بووکە رەنگ بوو بۆ کوردیش قسەی لێبکرێ. دیسان تورك دەبوو بیبەخشیایە تاکورد نەریتی نەتەوەیی خۆی بپارێزێت. چاکترین رێگەچارە ئەوەیە بێ جیاوازیی کوردی تورکیاو عیراق و ئێران و سوریا بە ئەندامی دەوڵەت بناسرێن و حورمەت لەنەریتی میللییان بگیرێت چونکە کورد بەزۆر ناکرێت بە میللەتێکی‌تر!!!"

# کارەکانی لەسەردەمی حوکمی دووەمی شێخ مەحمود دا

**یەکەم/مەعاریفی سلێمانی:** رەفیق حیلمی دەڵێ ئەو کاتە لە دائیرەی حوکمدار کاروبارێکی ئەوتۆم نەبوو (واتا پاش هاتنە دەرەوەی شێخ لە خەڵوەت) کەسەرقاڵم بکات، لە قوتابخانەی (نموونەیی سەعادەت) وانەم دەوتەوە،وانەی بیرکاریی بەڵام لەچاو پێویستییەکانی ئەو رۆژەدا باوکم نەیتوانیوە بەو جۆرەکات بەسەربەرێت. هەستی بە دەست بەتاڵیی کردووە[*] بۆیە جارێ ویستویەتی بگەڕێتەوە مەکتەبەکەی خۆی تا بەوانە وتنەوەوە خەریك بێت. مستەفا پاشا کەسەرۆکی مەعاریف بووەو دەستیکردووە بە رێکخستنی قوتابخانەکان و حەزی لە چارەی (رەشید زەکی) بەڕێوەبەری (نموونەیی سەعادەت) نەکردووە. داوای لەباوکم کردووە پێکەوە خەریکی ئەو کارەبن. لەو رۆژەدا لە سلێمانی هەردوو قوتابخانە هەبووە ئەوانیش قوتابخانەیەکی سێ پۆلیی منالآنیان کردۆتەوە و پۆلێکی تازەشیان خستۆتە سەر نموونەیی سەعادەتو ناویاننـاوە (ئەعدادی) ئەوانەی دەرچوون دەگەڕانەوە تا ئەو پۆلەش تەواو بکەن. رەفیق حیلمی دەڵێ ئەمە بۆ ئەو رۆژە کەم نەبووە چونکە پۆلی دووەم تا ئەو کاتە مامۆستای نەبوو. دواتر مستەفاپاشا ناوی ئەم قوتابخانەیە دەگۆڕێت بە (مەحمودییە) و رەفیق حیلمی ئەکات بە بەڕێوەبەری. رەشید زەکی کە مامۆستای خۆی دەبێت لەم رەفتارە دەتۆرێتو بە مامۆستای بیرکاریی قایل نابێت. ئەم سێ قوتابخانەیە زۆر دڵسۆزانە وانەیان وتۆتەوەو گیانی نیشتمانیی لاوانی ئەو رۆژە ئێجگار بەرزبووە بۆیە پەك لەسەر مامۆستا نەدەکەوتو بێ پوولو پارە وانە وتراوەتەوە. زابتە کوردەکان بە هەموو هێزیانەوە سەرقاڵبوون لاوەکانیان هانداوەو وانەیان وتۆتەوە. لە ئەعدادیدا دوو زابتی کورد ئەمین رواندزیو عەزیز قەزاز وانەی (مەشقیسەربازیی)یان وتۆتەوە. حەماسەتو خوێن گەرمیی مستەفا پاشای وایلێکردووە خۆی وانەی (جەبر) بڵێتەوە و رەفیق حیلمیش وانەی (هەندەسەی موجەسەمەو مثلثات) بڵێتەوەو سدیق پاشای موفەتیشی حکومەتی

---

[*] بێ گومان ئەوە لەچاو ئەو هەموو گێژەڵووکەو شەپۆلە سیاسیانەی ئەو هەموو کارە گرنگانەی حوکمی یەکەمی شێخو پەیوەندیو کاری بێ وچانی لە گەڵ کاربەدەستە ئینگلیزەکانو ئەهالیو هتدیدا... کەچی هەستی بەدەست بەتاڵی کردووە.

کوردستانیش وانەی وێنەی وتۆتەوە. ئینجا بزانن ئەمە چۆن قوتابخانەیەك بووە؟!
مستەفا پاشا ناوی دوو مەکتەبەکەی تری ناوە (قادرییەو لەتیفییە ) ئینجا رەفیق حیلمی گەراوەتەوە سەر کاری پەیوەندیی بە شێخ مەحمودەوەو سەبارەت بەمە بۆ خۆی دەڵێت: بە گەڕانەوەی بۆ ئەعدادیی بە تەواویی لە (مەلیك) دوور نەکەوتبۆوە جارجار ناردویەتی بە شوێنیداو هەندێ نامەی تایبەتی خۆی پێ نووسیوە یان پێی خوێندۆتەوە. لەبەر ئەوە بە بەهانەی وانە وتنەوە بە کوڕەکانی (رەئوف و بابە عەلی) مەلیکی کوردستان ئەمرێکی بۆ دەرهێناوەو هەموو رۆژێك دوای نیوەڕۆ بەبێ پرس و ڕا چۆتەلای شێخ. ئەمە بۆ ئەو رۆژە ئیمتیازێك بووە کە بە هەموو کەسێك نەدراوە. لەبەرئەوە لەناو پیاوە ناسراوەکانی ئەو رۆژەداو دەستو دائیرەی مەلیك خۆشی بە چاوێکی پڕ لەبەرێزەوە سەیرکراوەو هەندێکیشی ئێرەیشیان پێ بردووە!.
لەباسی قوتابخانەو قوتابیەکانیدا دەڵێ :هەموو بە گەرمی و شەوقەوە خوێندویانەو زۆرتر لە جاران ڕوویانکردۆتە چوونە قوتابخانەو بەشێکی زۆری مامۆستایان زابتی کۆن و تازەی کورد بوون، خۆیان لە زەمانی عوسمانی لێرە دەرچوون لە (ئەعدادی عەسکەریی) بۆیە حەزیان ئەکرد ئەعدادیەی مەحمودییەش لەسەر ڕێ و شوێنی ئەو بەڕێوە بڕوات، واتە بە نیزامێکی عەسکەریی بڕوات بەڕێدا. بەرگی هاوشێوەیان بۆ قوتابیەکان کردووەو بۆ قوتابییە هەژارەکان بە پارەی کۆکراوە (پیتاك)کڕراوە. دواتر باسی چالاکی و گورج و گۆڵیی قوتابخانەکەیان دەکات لەمجۆرە کاروبارانەدا تەنانەت دەشڵێت خوێندکارەکان کە کڵاوی عەسکەریی وەك ئەسکۆچەکانیان لە سەردا بووە کە لەناوچەوانەکەیدا بەسوورمە وشەی (مەحمودیی) نووسراوەو دەوڵەمەندەکان ئەمەیانکردووە بە ئاڵتوون، قوتابخانەکانی تریش یەك جل و لە جیاتی مەحمودیی ناوی قوتابخانەکانیان کە قادریی و لەتیفیی بوو لەکڵاوەکانیان دەنووسی.
ساڵح بۆریزەن کە تائەو کاتە ماوە ناردویەتی کردویەتی بە فەڕاشی قوتابخانەکەو بۆرییەکی لە دائیرەی عەسکەریی بۆ وەرگرتووە لە جیاتی زەنگ بەوە قوتابی چوونەتە پۆلەوە. تیپێکی بچووکی مۆسیقاشیان پەیدا کردووە بۆ کاتی مەشقکردن و ئەوانی تریش بە ئاوازی گۆرانیی میللی و نیشتمانیی سرودیان وتووە. خەڵکی بازاڕو ناوشار بە گەورەو بچووکەوە شوێنیان کەوتوون و چەپڵەیان لێداوەو فرمێسکی شادییان

ڕشتووه[*]. ئەم بزووتنەوەیە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە، تا ئەو ڕۆژە سلێمانی بزووتنەوەیەکی وای بە خۆیەوە نەبینیوە باوکم دەڵێ: لەو حاڵەی وا خەریکی ڕێکخستنی مەعاریفی سلێمانی بووین و لە قوتابخانەکاندا هەستی کوردایەتیمان زیندوو دەکردەوە بێگومان لەولاوە تورکخواکان دەوری حوکمداریان دابوو. شێخ مەحمود واقی ورمابوو! نەیدەزانی ڕووبکاتە کام لایان؟ لەبەر بێ قەراریو تێکەڵو پێکەڵی بیرو باوەڕیی، متمانەی بە کەس نەکردووە. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە لاپەڕە (٥٤١)ی یاداشت بەرگی شەش . دەستەیەك لە لاوەکان ئیمانیان بە ئینگلیز هێناوە گاڵتەیان بەم تەقەلای نیشتمانپەروەرانە هاتووەو ئەمەیان بە تورکخوا زانیوە، گوایە شوێن کڵاوی بابوردو کەوتوون وتورکخوا ئەوانەی سەر بە ئینگلیزیان بە سیخوڕ زانیوە.

نیشتمانپەروەرەکان کەم بوونو بێ پشتیوان بوون، بەڵام گیانی میللیان ئیجگار بەهێز بووە، زۆربەی ئەهالیو خەڵکی ڕەشۆکی بەمانەوە لکاون. دەستەی قوتابیو مامۆستایانی خوێن گەرم هۆی پەرەسەندنی بیری نیشتمانیو گیانی قەومی کورد بوون لەناو خەڵکدا.

دواتر دێتەسەرباسی شێخ مەحمودو دەورەدانی شێخ بە تورکخواکانو ئەوانەی لەگەڵ ئۆزدەمیر بوونو چۆن پێکەوە ئینگلیزیان لە ڕانیەو دەربەند دەرکردووەو هتد... هەروەها و باسی تورکەکان دەکات چۆن هاتونەتە ڕواندزو ڕۆڵی ئەحمەد تەقی چی بووە لەمەدا .[*]

## ڕۆڵی وەك نوێنەری شێخ بۆ لای ئۆزدەمیر

ڕەفیق حیلمی دەڵێ: کە خۆی لە گەڵ ئەحمەد تەقیو فەتاحی ئەمینی عەتار ( ژن برای شێخ) بە ناوی حوکمداری کوردەوە چوونەتە لای ئۆزدەمیر سەرەکی لەشکرە بچوکەکەی تورك لە ڕواندز لە ڕواندز ١٩٢٢ لەوێشەوە لە گەڵ فەوزی بەگو ڕەمزی بەگ (قایمقامی

---

[*] ئای ڕەفیق حیلمی چیت کردووە بۆ ئەم میللەتە! کوا ئێستا زیندوو ببویتایەتەوەوهەمان هەستی نیشتمانیت لە ناوقوتابخانەو گەنجاندا بڵاوبکردایەتەوە .

[*] ل ٥٤٣ یاداشتی شەش. ل ٥٤٤ هەمان سەرچاوە بڕواننە ل ٥٤٦ بۆ درێژەی باسی ڕۆڵی ئەحمەد تەقی لە چوونی تورك بۆ ڕواندز.

کۆنی تورك ) لە کۆیە بۆ گفتوگۆ سەبارەت بە مەسەلەی کورد لەگەڵ گەورەکانی حکومەتی ئەنقەرە چوونەتە تورکیا .

گوایە ئەحمەد تەقی رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە چوونی تورك بۆ رواندز لەبەر سەرنەگرتنی کاروبار لەگەڵ ئینگلیزدا. کوردەکانی ئەو ناوە نرخیان نەدابوو بە تەشکیلاتی قەومیو باوەڕیان بە ئینگلیز نەبووە لەبەر پڕوپاگەندەی (تورك و ئیسلامییەت) ئەحمەد تەقی رۆڵی لەوەدا هەبوو کە تورك بڵێ کورد ئینگلیزی ناوێ دەیەوێ لەشکری تورك بچێتە رواندز. دەیانەوێ بچنە لای سمکۆو لە گەڵیدا کۆبوونەوە بکەن ئەو ئەڵێ ئیستا هەل لەبێهێزیی ئێران وەربگرین باشترەو یارمەتی کوردی ئەوێ بدەین. بەهاری ١٩٢١ مانگی مایس لەشکری تورك و ئەحمەد تەقی تا شەمدینان دەچن و لەوێ ئەحمەد تەقی دەچێتەوە لای سمکۆ وهتد... (*)

بە گەیشتنی تورك بە رواندز بۆ کاروباری ئەوێ تەشکیلاتێك دەکرێ بە پێی دەستووری کەمالییەکان بەناوی مەجلیسی میللی و ئەحمەد تەقی دەبێتە نائبی مەجلیسی میللیوناوچەی هەریروباتاس-یش دەگرن و دەسەڵاتیان تا (زێبار، عەقرە ، رانیە، دەربەند) تەشەنە دەکات، ئینگلیز دەستدەکەن بە جوڵانەوە بەڵام دەشکێن. شێخ ئەحمەدی بارزان و ئەهالی عەمادییە لە گەڵ کوردەکانی رواندز هاوڕا بوون.

ئۆزدەمیر دەگاتە رواندز، هەموو ئاغا کوردەکان پشتگیریی دەکەن و بڕیاردەدەن بچن دەربەند بگرن. ئینگلیزو بابەکری سەلیم ئاغا لە دەربەند دەرکران. ئینگلیز سەری لێ شێوا نەیدەزانی بۆ کوێ بڕوا، چووە گردە بڵویز ئەمانە ماندووبوون کە دایان بەسەریانداو گشت کەلوپەل و چەکەکانیان کەوتە دەست کوردەکان، بە ژێر سێبەری فڕۆکەوە بە کۆیەدا چوونە هەولێرو بە فڕۆکەش لە سلێمانییەوە رۆیشتن بۆ بەغداو دەنگی گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی بڵاوکرایەوە.(*)

لەسەر نوێنەری تورك ئۆزدەمیر لە رانیە دەچێتە دەرێ و بۆ شێخ مەحمودی بەجێ دێڵێ . بەڵام ئینگلیزەکان لەسەر وشەی خۆیان لە کۆیە نەچوونە دەرێ پەلپیان بە شێخ

---

(*) ل ٥٥٠ گەیشتنی تورك بە رواندز

(*) ل ٥٥٨-٥٥٩ عەباس ئاغا بە (چەپمەن) دەڵێ لە داخی ئێوە تورکمان هێنایە کوردستان

مەحمود گرت تورکەکان لە رواندزیش دەربکات. ئەمە یەکێك بوو لە هۆیەکانی رێکنەکەوتنی شێخ مەحمودو ئینگلیز.

## شێخ مەحمود چۆن فریودراو راکێشرایە ژێر باڵی ئۆزدەمیرو تورکەوە؟[*]

جێی گومان نییە کەشێخ مەحمود حەزی کردووە ببێت بە( مەلیکی کوردستان) بێگومان حەزیشی دەکرد خزمەتی کورد بکات، بەڵام هیوای نەمابوو بە ئامانج بگات. ئۆزدەمیریش لەم کاتەدا بە وەستایی لە گەڵی جووڵاوەتەوە هەر چەند باوەڕی بە ئۆزدەمیر نەبووە، بەڵام دەترسا ئەو سیاسەتە هۆی دۆڕاندنی هەموو شتێك بێت.

## سمکۆ دەچێت بۆ سلێمانی

سمکۆ کە تورکەکان هەڵیان خەڵەتاندبوو، لە ژێرەوە وەکو مار پێوەیاندا بەشەو هێرشیان بردە سەرو چەند کەسێکیان لێ کوشتن و خۆی و برایەکی گەیشتنە رواندز، ئینگلیز زانیبوویان خەریکە لەگەڵ شێخ مەحمود رێکبکەوێت، هەوڵیاندا بەینی شێخ و تورکەکان تێکبدەن ئەو کاتەی شێخ دوورخرایەوە بۆ هندستان ماڵ و منداڵی شێخ چوونە لای سمکۆ بۆ ئێران و دەستی باوکانەی بۆ درێژکردن . ئینجا شێخ دەیویست کە سمکۆ ماڵی وێرانبووبوو خێزانەکەی لەناوبرابوو چاکەی بداتەوە، ئینگلیز پێیان خۆش بوو سمکۆو شێخ رێکبکەون بەو ئومێدی تورك بکەنە دەرەوە. بۆیە ماوەیاندا سمکۆ بچێت بۆ سلێمانی، سمکۆ ماوەیەك لە ئێران وەك دووەمین شای لێهاتبوو ئەو لەناو کوردا قارەمانێکی میللەیی بوو .

## چونی سمکۆ بۆ سلێمانی

سمکۆی سەرەك عەشیرەتی شکاك سەردەمێك لە ئێران بە شای دووەم لە قەڵەمدراوە. تورك خیانەتیان لێکردووەو شەو بە دزیەوە چوونەتە سەری ماڵ و منداڵیان تەفروتونا کردووە، خۆی و برایەکی بەسەلامەتی گەیشتوونەتە رواندز. سمکۆ پەیوەندییەکی باشی

---

(*) بۆ ئەم باسە بڕوانە ل ٥٦٠و بەرەوژوور لە یادداشت بەرگی شەشەمدا. بۆ درێژەی باس بڕوانە هەمان سەرچاوە ل ٥٧٦-٥٧٧

لەگەڵ شێخ مەحمودا هەبووە. ماڵو منداڵی شێخی بردۆتەلای خۆی کاتێ شێخ دەرکراوە بۆ هندستان بۆیە شێخ بانگی دەکات بۆ سلێمانی ئینگلیز پێی خۆش دەبێت بەڵکو بتوانێت شێخ لە تورك هەڵگێڕێتەوە. ئەهالی سلێمانیو گشت کورد سمکۆ بە قارەمانێکی نەتەوەیی کورد دادەنێن بۆیە شار دەخرۆشێ چاوەڕێی سمکۆ دەکەن بە تایبەتی کوردە نیشتمانپەروەرەکان، بەهیوابوون ببێتە هۆی گۆڕینی سیاسەتی شێخ بەڵکو تای تەرازووی شێخ سەربکەوێت،مستەفا پاشا لە هەموو کەس زیاتر شاد بووە. بەتەما بووە سمکۆ شێخ بەرەو ئامانجی خۆی بەرێتو سیاسەتی ئینگلیز بچێتە سەر، ئاژاوە بگاتە کوردستانی تورکیا بۆ شکاندنی مستەفا کەمال،لە یاداشتەکانیدا رەفیق حیلمی باسی رۆژی گەیشتنی سمکۆ بۆ سلێمانی دەکات بڕوانە دیسان چۆن تابلۆیەکمان لەپەیڤی جوان لەمبارەیەوە پێشکەش دەکات بڕوانە ل٥٧٨ ی یاداشت بەرگی (٦) . ئەمە بۆیە دەنووسینەوە چونکە لەپەخشانە جوانەکانی رەفیق حیلمییە هەروەها باسی کوردە کە خوێنی گەرمی نەتەوایەتی دێتە جۆشوخرۆش لە کاتی رووداوی نەتەوەییو نیشتمانییو بەبینینی قارەمانێکی کورد!

## رۆژی هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی لە پەخشانێکی رەفیق حیلمیدا (*)

رۆژی هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی سەرتاپای سلێمانی بە جارێ لە ماڵ هاتنە دەرەوە، زۆربەی سوارە عەشایەرەکانی دەورو پشت چووبوون بە پیریەوە، شاری سلێمانی وەك بووك رازابۆوە. لەناو ئاهەنگێکی گشتیو زەماوەندێکی میللیو نەتەوەیدا. بەرەو پیرییەکی زۆر شیرینو شاهانەی لێ کرا. شەوێك پێش گەیشتنی ، شاری سلێمانی چەشنی شارە مێروولە ورووژا. دەرزیت بهاویشتایە نەئەکەوتە سەر ئەرز، تا رۆژ بۆوە خەو لەچاوی زۆر کەس نەکەوت (*)شتێکی کە سەیربوو ئەوە بوو تورکخواکانیش لە کەیفابوون، بەڵکو ئەوان لە کورد پەروەرەکان زیاتر بە نەشئە بوون ئەوان بە هیوای

---

(*) لە لاپەڕە ٥٧٩- یاداشت بەرگی شەش

(*) بێگومان خۆی یەکەم کەس بووە نەنوستووە هەمان پەڕەو سەرچاوە- بڕوانە باسی خۆیو قوتابیو فێرکردنی سرود بەو شەوە.

سەرکەوتنی سیاسەتی تورك بوون. رۆژئاوا بوو کە لە مستەفا پاشاوە کاغەزێکم وەرگرت.

## رۆڵی لە ئاهەنگی پێشوازیکردن لە سمکۆ دا

مستەفا پاشا لە نامەکەی ئەو ئێوارەیەدا نوسیبووی "هەر بۆئەم شەو سرودێکی میللی جوان رێکبخە وقوتابییەکان فێربکە بێن بۆ ئەوەی کە لە پێشوازی سمکۆدا پێشکەشی بکەن" باوکم دەڵێ" چوومە قوتابخانەی ئەعدادی شەو بوو بە رۆژ، لەبەر ئەوەی بە ئاسانی قوتابییەکان کۆکرانەوە. تا ئەوان کۆبوونەوە سرودێکم ئامادە کرد" رەفیق حیلمی دوو سروودیی هەیە وابزانم ئەم سرودەی باسی دەکات ئەوەیانە کەبەناوی (وەتەن بەجەنەت ناگۆرینەوە)یە هەروەها دەڵێ" تا نیوەی شەو لەگەڵ دەستەیەك قوتابیی مەشقمانکرد لەسەر سرودەکەو هەموو شتێ جێبەجێ بوو، قوتابییەکان لەخۆشیاندا نەیاندەزانی چی بکەن؟ پێیان عەرزی نەئەگرت. دواتر بۆ سەرخەوێك چوونەتە ماڵەوە تا بۆ سبەینێ کە جەژنی کوردبووە و چوون بەپیر پاڵەوانێکی کوردستانەوە ئامادەبن، بەیانی پێش هەتاو کەوتن شاری سلێمانی وردو درشتی، بە پیاوو ژنەوە رژاونەتە کۆڵانەکان، قوتابیانی مەکتەبەکان، لەو کۆڵانانەندا کە دەچوون بۆ ماڵی (شێخ مستەفا،[*] کۆڵانەکەی ماڵی شێخ قادری حەفید) لەگەڵ عەسکەرو پۆلیس بەرامبەر بەیەك ریزیان بەستبوو، بۆ راگرتنی خەڵكو رێکخستنیان، زابتە کوردەکانو مامۆستاکان چالاکانە لە هاتوچۆدا بوون، خەڵك تا ئەدەهات زۆر دەبوونو لەو دەشتو کۆڵانەدا جێیان نەدەبۆوە، تەلارو پێش هەیوانو بەر پەنجەرەی خانوەکانو سەربانی مزگەوتی گەورەو دوکانو بازاڕ جمەی دەهات! دێهاتەکانی لادێکانی نزیکی سلێمانی بەجارێ رووبانکردبووە ناوشار لە دوای ئەمانەو چاوەڕوانییەکی بێ ئۆقرە، نزیکی نیوەڕۆ ئوتومبێلی شێخ قادر دەرکەوت. خەڵکەکە جارێکی تر خرۆشانو بەیەکدا هاتن . مامۆستا خوێن گەرمەکانو زابتە چوست وچالاکەکان گورج بوونەوەو چوون بۆ لای قوتابیانو عەسکەرەکان، ئیتر بۆ سڵاو چاوەڕوانی ئاماژەیەك بوون.

---

(*) لێرەدا جێ بۆ سمکۆ چاککراوە.

ڕیزی قوتابیان بەرامبەر بە ڕیزی عەسکەرەکان وەکو دوو خەتی ڕاستی بە ڕاستە کێشراو وەستابوون چاویان بڕیبووە دەمی زابت و مامۆستاکانیان. لەپڕ ئوتومبێلەکە هاتە پێشەوەو دەرگاکەی کرایەوە، بەتەنیشت شێخ قادرەوە بالای بەرزو قەدی شمشالیی سمکۆ دەرکەوت پلنگی کوردستان لە بەرگی عەسکەریدا بە وێنەی ژەنەڕالێك دەهاتە پێشەوە (*).

چاوێکی بەو خەلکەدا خشاندو بۆ سلاو هەردوو دەستی بەجارێ بلندکرد ئیتر لەگەل هەلهەلەو چەپلە ڕێزانی ژنان لە لایەکەوەو گولبارانو دەنگی (بژی بژی) لە لایەکی تریشەوە، گرمەی تۆپ دەستی پێکرد. فرمێسکی شادیی بەری چاوی نیشتمانپەروەرەکانی گرتبوو. بۆ ماوەیەك لە هۆش خۆیان چوون، لە مێژووی ڕۆژە پیرۆزە گرنگەکانی سلێمانیدا لە ڕۆژی گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە هیندستان دەچوو. ئەو ڕۆژە دووەم ڕۆژی شادیی شاری سلێمانی بوو پاش ڕۆژی گەڕانەوەی شێخ.

ئەو قوتابیو عەسکەرانەی لە پێشوازیی سمکۆدا وەستابوون چاوەڕێ بوون بە بەردەمیاندا بڕواو بیانپشکنێ، ئینجا سمکۆ بە هەنگاوێکی ڕێكو لەسەرخۆ بەرەو ئەوان جوولایەوە، لەو ساتەدا لەشاهێ لەو شاهانە ئەچوو کە لە بیرو خەیالی کوردا ئەژیان. قوتابیان لەگەل سرودی بەخێرهاتنا دەستیان کرد بە گولبارانو عەسکەرو پۆلیس بە تفەنگە بریسکەدارەکانیانەوە لە سلاوا وەستان، وێنەی ئەو ساتەی سمایل خان و دەستە سوارە پرچەکەکەی شکاك ئەشیا کە بچێتە لاپەڕەکانی مێژووی کوردەوەو سمکۆ هەرچەند خۆی بەرگی عەسکەریی لەبەردابوو بەلام لەگەل ئەوەشدا نیشانەی ڕەگەزی کوردایەتی ئەو بەجێگەیەکی بەرزەوە ئەبینرا کە کلاوەکەی سەری بوو ئەو کلاوێکی کوردانەی شکاکی لەسەر نابوو چەند هەورییەكو مشکی بەدەوری ئەم کلاوەدا پێچابۆوە ئەو پیاوانەی لە گەلیشی بوون بە بەرگی کوردیی شکاکییەوە لە کوردستانی باکوورەوە دیارییەکی بەنرخ بوون واتا دیمەنێکی شیرینی براکانی ژووروویان بۆ هێنابووین. مستەفا پاشا دۆستی دێرینی سمکۆ بە وتارێکی گەرمو بەهێز داستانی دوورو درێژی

---

(*) بڕواننە ئەم وەسفە بێ هاوتایە وردە کە هیچ خالێکی بەجێ نەهێشتووە هەر وەك نەخشەیەکە، تابلۆیەکە، سیناریۆیەکە ئامادەکرابێت بۆ دەرهێنانی فیلم کوا خوا بکا ئەمانە هەمووی بکرانایە بە فیلم.

ئەو بەچکە شێرەی بۆ گێڕانەوە. مێژووی پاڵەوانیی و نیشتمانپەروەریی سمکۆو ئەو کارەساتانەی بۆ هۆنینەوە کە لەم ڕێیەدا بەسەری هاتووە .

ئەو ترسی لەلای تورکەکان دروستکردبوو چونکە مستەفا پاشای دوژمنی خۆیانیان باش ناسیووەو بەخۆڕایی ناوی (نەمرود)یان لێ نەناوە. هەر لەبەر ئەوەش بووە تورکەکان شەو هەڵیانکوتابووە سەر سمکۆ . چونکە مستەفا پاشا چووبووە لای کە ڕووی لە ئێران پێ وەرگێڕێ و بچێتە سەر تورك".

تورکەکان زانیویانە سمکۆ بۆ سەربەخۆیی کورد خەباتی کردووە. کوڕەکەی بەردەدەن و پارەو موڵکی دەدەنەوە دەچێتەوە تورکیا... تورکەکان بە فڕوفێڵ تەفرەی شێخ مەحمودیش و سمکۆش دەدەن، تا بیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

لێرەدا بڕواننە ل ٦٠٤ی یاداشتی ڕەفیق حیلمی بەرگی شەشەم بۆ نامەی شێخ بۆ ئۆزدەمیر کە چاوەڕێی نامەیانە، تاڕێ و شوێنی پێویستی بۆ دابنێن. هەروەها دەنووسێ سەرۆکایەتی (جەمعیەتی کوردستان) کە کاتێ لە هیندستان بووە دامەزراوە بە شێخ سپێراوەو ئەویش بە شانازییەوە قبووڵی کردووە. پەیمانی داوە لە خزمەت و یارمەتی دریغی نەکات.

## رەفیق حیلمی نوێنەری شێخ مەحمود لە ئەنقەرە

باوکم ئەمجارە رۆڵێکی تازە وەردەگرێت لە خەباتی سیاسیدا بە ئاواتی سەربەخۆیی گەل و نیشتمانەکەی لە سەردەمی حوکمدارێتی دووەمی شێخ مەحمودا، کە پاش تاقیکردنەوەی دڵسۆزیی و راستی و چالاکی و ئامادەیی خۆی (شێخ مەحمود و سمکۆی شکاک) بڕیاردەدەن رەفیق حیلمی وەك نوێنەری شێخ مەحمود لەگەڵ دوو ئەندامی تر بچێت بۆ راوندز بۆ لای ئۆزدەمیرو ئینجا بە پێی هەڵسوکەوتی ئینگلیزو وەڵامدانەوەی نوێنەرەکانی بۆ لای ئینگلیز، بگەڕێنەوە سلێمانی یان راستەوخۆ لەوێوە بچن بۆ ئەنقەرە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کەمال ئەتاتورك، سەبارەت بەو پەیمانانەی کە لەرێی نامەکانی ئۆزدەمیرەوە داویانە، (ئەگەر شێخ مەحمود دەست لە ئینگلیز بەربدات و دەریانبکات و ببێتە دۆستی تورك، تورك پاش شەڕی یونان و گەڕانەوە بۆ موسڵ، حکومەتی سەربەخۆ بۆ کورد دائەمەزرێنێت و خۆی وەك خدێوی حوکم دەکات و بە ویراسی بۆ وەچەکانیشی دەمێنێتەوە) هەرچەند بڕوای بە هیچ لایەك نییە نەئینگلیزو نە تورك بەڵام ناچارە لایەك بگرێت ، دوو هەیئەت دەنێرێت هەریەکە بۆ لایەك تابزانێت هەریەکە بەراستی بەتەمای چی‌یەو چی بۆ کورد دەکات؟بالێیگەڕێین رەفیق حیلمی ئەمەمان بۆ باس بکات لە یاداشتی بەرگی حەوتەدا (*).

## گفتوگۆی نهێنی پاش نیوەشەو
## لەگەڵ شێخ مەحمودو سمکۆ

رەفیق حیلمی لێرەشدا راگوزەریانە ئاماژەیەك دەدات بەژیانی خۆی و خێزانەکەی ، ئەویش دیسان بۆ دروستکردنی دیمەنێکی نوێی سیاسی، کە پەیوەندیی بە شێخ و بەجێ هێنانی کارەکانیەوە هەیە ئەمجارە وەك نوێنەری شێخ لە دەرەوەی وڵات. دەڵێت زستان بووەو خۆی و خێزانێکی سێ کەسیی (ناشڵێ ئەو سیانە کێ بوون، وا دیارە خۆی و هاوسەرو خوشکی بوون چونکە لەو ساڵەدا کە ئەو باسی دەکات هێشتا منداڵی

---

(*) بۆ درێژەی باسی سەفەری رەفیق حیلمی لە راوندزەوە بۆ ئەنقەرە بڕواننە یاداشت- بەرگی (٧) و بڕواننە کتێبی "پەخشانی کوردیی" مامۆستا عەبدولرەزاق بیمار

نەبووە) لە خانوویەکی بچکۆلەی دوو نهۆمیدا بوون، خاوەنەکەی سالْحی وەستا بستە (سالْحی چایچی یان پێ وتووە).

دەڵێ لەو کاتەدا خەڵك شەوان زوو دەگەڕاونەوە بۆ ماڵەوە بێگومان نەك هەرلەبەر بارودۆخی شارەکە بەڵکو لەبەرئەوەیش کە کارەبا نەبووەو شەقامو کوڵان تاریك بووە. خۆشی دیارە لەبەر ساردو سەرمای زستان کەمێ هەلامەتی بووەو نەچۆتە دەرێ .لە ژوورە بچکۆلە قورینەکەیدا دانیشتووە لەبەر چرادا کتێبێکی خوێندۆتەوە، تازە ژنی هێناوەو هێشتا منالْیان نەبووە، ژنەکەی ئەو کاتە نووستووە، تاقە خوشکەکەشی ، لە ژوورەکەی تردا نووستووە دەرگاکەی لەناو ژوورەکەی خۆیاندا بووە. رەفیق حیلمی هەستاوە بەبێ دەنگیی چۆتە حەوشە، هەورێکی رەش دونیای کردووە بە شەوە زەنگ نمەی باران بووە. لەبەر کشوماتی دەرزیت بهاویشتایە گوێت لێ دەبوو دەچێتەوە ژوورێو کتێبەکە دەگرێتەوە بەدەستەوە، کە لە ماڵەکەی تەنیشتیانەوە بە دەنگێکی ئەسپایی بانگی دەکەن دەنگەکە دەناسێتەوە، ژنەکەی خورشید بەگی قوڵچی گومرگ بووە کە خورشید زوو کۆچی دوایی کردووە. ژنەکەی و چەند منالێکی لە خانووەکەی تەنیشتی مالی ئێمەدا بوون دیوارێکی قوڕ جیایکردونەتەوە، لەو دەنگە دایکم خەبەری دەبێتەوە بۆیە پێی وتووە زووکە بزانە ماڵی خورشید بەگ بەم شەوە چیان لێ قەوماوە؟ ئەویش خێرا دەچێتە دەرێو زوو دەگەڕێتەوە. بەلام بە شڵەژاویی بەرەنگی بزرکاوو هەناسەی سوارەوە باوکم دەڵێت لێم پرسی ویستم بیهێنمەوە زمان،ئیتر لەوکاتەدا لە دەرگا دەدەن دایکم ئەو وەختە هاتۆتەوە زمان [*] و دەستی بردووە بۆ دەمی رەفیق حیلمی وتێیدەگەیەنێت وەلامیان نەداتەوە چونکە ماڵی خورشید بەگ پێیان وتوون ماڵی رەفیق حیلمی لەم گەڕەکە نەماون و چەند رۆژێکە گواستویانەتەوە. باوکم وتویەتی لەبەرچی؟ دایکم وەلامی داوەتەوە: ئەی سێ تفەنگچی بەمشەوە تۆیان بۆچی‌یە؟ بەڕاستی دۆخەکە وابووە ئینسان بترسێ بەلام باوکم ماوەی لێکدانەوەی نەبووە، جارێکی تر لە دەرگا دراوەتەوە. بەدەم دەرگا لێدانەکەوە (وسوو ئاغا) بانگی کردووە رەفیق ئەفەنی !منم وسووی خزمەتکارت شێخ مەحمود داوات ئەکا، ئیتر باوکم چووە

---

[*] بڕوانە چۆن وا بە وردی هیچی نەهێشتووە باسی نەکات هەر وەك بە ئومێدی ئەوەی ئەم تابلۆیانە بکرێن بە فیلم یان هەرکارێکی تر.

دەرگاکەی لێ کردۆتەوە. وسوو دوو تفەنگچیشی لە گەڵ بووە، وتویەتی فەرموو (مەلیك )
داواتدەکات.باوکم گەڕاوەتەوە بۆ پاڵتۆو چرا دەستیەکەی و دەمانچەکەی بەبێ کیف
خستۆتە گیرفانی. پورم لەخەو هەستاوە، کاتژمێر بەرەو دوانزەی شەو چووە، پورم و
دایکم کەوتوونەتە گومانەوە بۆچی بەو نیوەشەوە بۆ لای شێخ مەحمود بچێت؟! باوکم
دڵنیایان دەکاتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای وسوو.

مەلیك لە تەنیشت خانوە تازەکەی ئەو رۆژەی میرزا تۆفیق-ەوە لە خانووی میرزا
فەتاحی بەرامبەر ماڵی حاجی ئەمینی کاکە حەمە دانیشتووە کە رەفیق حیلمی
گەیشتۆتە ماڵی مەلیك گەڵێ لە پیاوە چەکدارە تایبەتەکانی شێخ سەرقاڵی ئێشکگرتن
بوون. تفەنگچی‌یەکی زۆرو عەشایەریش بەچەند جێ وەستاون یا دانیشتوون و
هەندێکیشیان لە ئاستی خۆیانەوە خەو بەلایدا بردوون. بەو جۆرە تا بەردەمی ژووری
مەلیك مەحمود تفەنگچی وەستاون بەناو ئەوانەدا تێپەڕیوەو بە ڕاڕەوێکدا چۆتە سەرێ،
لەبەردەمی ژوورەکەی مەلیکدا وسوو ئاغا لە دەرەوە بانگیکردووە "قوربان رەفیقە
ئەفەنی حازرە " لەتیفی کوری شێخ دەڵێت: فەرمو بابێتە ژوورەوە لەو کاتەدا ئەم
کوڕەی شێخ مەحمود حەوت هەشت ساڵ بووە بەڵام وریاو قسەزل و بەکاربووە چووە
بەپیر رەفیق حیلمیەوەو پێکەوە چوونەتە ژووری سمکۆ لەلای راستی شێخ
مەحموودەوەو تایەری ئەمین ئەفەنی بەو بەرەوە، بەرامبەر بە شێخ دانیشتوون.باوکم
دەڵێ "سەلامم کرد وابزانم وەڵامیان نەدامەوە، بۆ دانیشتنیش خولقیان نەکردم بەپێوە
مامەوە". ئەمە رەسم و عادەتی شێخ نەبوو ئەو هەمیشە رێزی لە هەموو میوانێك ناوەو
لەبەر منالێك هەستاوە بەردەوامیش بەچاوێکی تایبەتی سەیری باوکمی کردووە و دڵی
لەخەڵکی تر زیاتر ڕاگرتووە، تەنانەت لەهەندێ کەم و کورتیشی بوردووە. بۆ ئەو
لێبووردەیەی شێخ-یش باوکم وێنەیەك دەدات کە ئێواران وەك هەمووڵاوێکی ئەو زەمانە
کاتەکەی بەخواردنەوە و رابواردنەوە بردۆتە سەر، شێخ ئەمەی زانیوە بەڵام هیچ جارێك
ڕووی لێ گرژ نەکردووە. هەندێجار کەچۆتە لای بۆنی دەمی کردووە بەڵام هەر گاڵتەی
خۆیکردووە لەگەڵی و جارجاریش چوارینەکانی (خەیام)و شیعری (حافظ)ی بۆ
خوێندۆتەوە.ئەگەرچی ئەو شەوە باوکم لەبەر هەڵامەت هیچی نەخواردۆتەوە بەڵام شێخ

بۆنی دەمی نەکردووە، ڕووی ترش و گرژ شتێکی لە دڵا بووە. باوکم لەیاداشتەکانیدا سەبارەت بەمە دەڵێت"ئەبوو ڕاوەستم تا ئەوشتەی دڵی دەربخات".

لەپڕ ڕووی تێکردووەو لێی پرسیوە: لەکوێ بووی؟ ئەمیش وتویەتی لە ماڵەوە، وسوو ئاغا لەو دیو دەرگاکەوە هاتۆتە وەڵام وتویەتی: قوربان بەسەری تۆ لە ماڵەوە بوو.مەلیك فەرموویەتی کە وای بیستووە ئەمشەو کۆبوونەوەیەکیان بە دەستەوە بووە، ڕەفیق حیلمی وتویەتی: یەعنی چی؟ فەرموویەتی، خۆت دەیزانی و نەیهێشتووە وەڵام بداتەوە هەروەها وتویەتی تا ئێستا یەك مستەفا پاشا هەبوو لەمەودوا هەموو لێم بوون بە مستەفا پاشا! ئیتر لە وزەما نەماو ناتوانم لەمەزیاتر چاوتان لێ بپۆشم، ئەبێ یا ئێوەبن یا من! چیتان لەمن داوەو ئەتانەوێ چی بکەن؟ ماوەی باوکمی نەداوە هیچ بڵێ، جارجاریش دەنگی بەرز کردۆتەوەو بە هەڕەشەوە وتویەتی: بڵێ بزانم! ئەتانەوێ چی بکەن؟ بەتەمای چین؟ من بە خائن و بە دوژمنی کورد دائەنێن و ئێوە کوردن بۆ کوردستان هەوڵ ئەدەن! وانیە؟ ئێوە کوردستان دروستئەکەن یا ئینگلیز بۆتان دروستئەکات؟ مستەفا پاشای دۆستی ئینگلیزەکان بۆچی دەنگی نیەو کوردستان بە ئینگلیز دروست ناکات؟ لێرەدا دیسان ڕەفیق حیلمی تەکاندەدات قسە بکات بەڵام ماوەی نادات و دەڵێت: بڕۆن لەبەر چاوم ، هەستن بچن بۆ کەرکووك بۆ بەغدا لەوێ لەگەڵ مستەفا پاشا داوا لە ئینگلیز بکەن و کوردستانی پێ دامەزرێنن!

ڕەفیق حیلمی دەڵێ من لەم قسانە سەرم سووڕمابوو دەمم بووبوو بە تەڵەی تەقیو.کاری ڕاستبێ (سمکۆ) فریام کەوت ڕووی کردە شێخ و وتی" ماوەی نادەی؟ با ئەویش قسەیەك بکات و وەڵامت بداتەوە" ئەمە دەبێتە هەل بۆ ڕەفیق حیلمی و گوڕدەداتە بەرخۆی و دەست دەکات بەقسەو دەڵێ" قوربان ئەگەر ڕاستتان ئەوێ لەم بەزمە حاڵی نەبووم، هیچ تێ نەگەیشتم. ئینکاری ئەوە ناکەم کوردم و ئامانجی بەردەوامم سەربەخۆیی کوردستانە بەڵام خۆشت ئەیزانی کە شوێن کەس نەکەوتووم و ناکەوم. نە ئۆزدەمیر ئەناسم و نەپیاوی مستەفا پاشام، ڕاستەکە (جەمعیەتی کوردستان) هاتە ناو ناوان و بووم بە ئەندام تیایدا بەڵام ولاخ نەبووم کە ڕەشمەکەم بەدەستی خەڵکەوە بێ. من تەنیا کۆیلەی ئەو کەسەم کە کورد بێ و بۆ کورد تێبکۆشێ. پاشای من و تاجی سەری من ئەوەیە کە کورد بێ و تۆشم بۆیە خۆشدەوێ کوردی و لەو باوەڕەدام بۆ کورد

تێدەکۆشی. ئەگەر تۆ من بە کورد دائەنێی و لەبەر ئەوە لێم بەگومانی جێی شانازیە بۆم دەرمبکەیت و لەم شارە بچمە دەرەوە."(*) رەفیق حیلمی هێشتا لەقسەکردن نەبۆتەوە کە سمکۆ هەڵدەستێتە سەرپێ و ڕوو دەکاتە شێخ مەحمودو دەڵێ "عەرزم کردبووی کە لەو رۆژەوە چاوم بە رەفیق کەوتووە تێگەیشتوم کوردێکی بێ غەش و جێی باوەڕە" (*) شێخ مەحمودیش هەڵدەستێ و " رەفیق حیلمی ماچ دەکات و دەڵێ وائەزانی بەڕاستم بوو؟ بە گۆڕی (کاک ئەحمەد) سووعبەتم لەگەڵدا دەکردی " ئینجا دەستی دەگرێت و دەیخاتە نێوانی خۆی و سمکۆوە. باوکم لەدرێژەی باسەکەدا دەڵێ "ژوورەکە گەرم بوو ئەگەر چی زستانیش بوو، هێندە ماندوو بووم عارەق بە ناوچەوانمدا دەهاتە خوارەوە پیاڵە چایان بۆ هێنام خواردمەوە".

## مەبەستی شێخ مەحمودو سمکۆ لە گفتوگۆ نهێنییەکە

تابلۆیەکی تری رەفیق حیلمی، دیمەنێکی تری ئەم فیلمە مێژووییە کە بەم پەخشانە جوانە نووسیویێتیەوەو چاوەڕێی دەرهێنەرێکی هونەرمەندە بینوێنێ، بە جیهاندا بڵاویبکاتەوە، بڵێ کوردیش نەتەوەیەکی هەڵکەوتوو شکۆداربووەو مێژووی هەیەو دەوڵەت و حوکمداری هەبووە تەنانەت خاوەنی مەلیکیش بووە. هەر لە دێر زەمانەوە، ئەوە مەلیکە مادەکان و زەندی و ئەوە سەلاحەدینی ئەیوبی و ئەوە میرە بەدرخانەکانیەکان و ئەوەش حوکمدارو میرەکانی بابان و موکریان و لوڕو هتد... کە لە ژمارە نایەن بابێینەوە سەر ناوەرۆکی ئەم هەموو گفتوگۆیەی شێخ مەحمودو مەبەستی ئەو لە بانگکردنی رەفیق حیلمی بەو نیوەشەوەو دانیشتنی لەگەڵ سمکۆ کە میوانی بووە لە سلێمانی

باوکم سەبارەت بەمە دەڵێت" وەك عادەت و تەقالیدی شێخ پاش چاو شەکراو و قاوەی تاڵ خواردنەوەو هەندێ سوعبەت و گاڵتەو چاك و چۆنی لەگەڵ سمکۆدا شێخ فەرموویەتی : رەفیق! ئەبێ سوێندم بۆ بخۆی کە گفتوگۆی ئەم شەوەمان نهێنی بێ و نەچێتە دەرەوە." ئەویش دەڵێ هەر ئەو فەرمایشە بەسە کە باسی ئەو شەوە نەکاتەوە

---

(*) بزانن کوردایەتی رەفیق حیلمی گەیشتۆتە چ رادەیەك ل ٦٣٢ یادداشت (٦) .

(*) ل ٦٣٣ هەمان سەرچاوە بڕوانە هەمان سەرچاوەو لاپەڕە

دەم کەس. بەڵام شێخ بە تایەر ئەفەنی دەڵێت بچێتە ئەودیوو بۆلای میوانەکانی ئەودیوو .بۆ سبەینێ باوکم دەزانێ کە ئەوانە فەوزی بەگ تورك‌و هاورێکانی بوون. دوای ئەوە فایلێك دەداتە دەستی ڕەفیق حیلمی کەپڕە لە کاغەزو نامە، دەڵێ بیخوێنەوە. هەمووی بە تورکی بوون نامەی نێوان سلێمانی‌و ڕواندز واتا بەینی ئۆزدەمیرو شێخ بوون. سەیری نامەکان دەکات جیایاندەکاتەوە ئەوانەی بە گرنگی زانیون بۆ خوێندنەوە، لەناو پاکەتێکیشدا بە تایبەتی پێچراونەتەوە نامەیان دەربارەی شێخ لە ئۆزدەمیرەوە بۆ هەندێ لەگەورەکانی تورك یان لەوانەوە بۆ ئۆزدەمیر تیادابووەو تاقە نامەیەکی (مەلیك فەیسەڵ)یش هەر بە تورکی‌و بۆ شێخ خۆی.

لای باوکم گرنگترینیان پاش نامەکەی مەلیکی عیراق مەزبەتەی سەرکردە کوردەکان‌و وەڵامەکەی ئۆزدەمیر بووە. چونکە تا ئەو کاتە ئەویش وەك هەموو خەڵکی سلێمانی لە لایەن ئەو مەزبەتەیەوە مەرجەکانی ڕێکەوتنی نەزانیوە، ئەو شەوە چۆتە بنج‌و بناوانی مەسەلەکەوە. پاش ئەمە باسی ئەو کۆبوونەوەیە دەکات کە شێخ لەگەڵ سەرەك عەشیرەتەکاندا ئەنجامیداوە بۆ ئەوەی ئەو مەزبەتەیەی بۆ مۆربکەن کە بە ناونیشانی (ڕەئیسی هەیئەتی تەمسیلیەی کوردستانی جنوبی)یە تا بتوانێ بە ناوی کوردەوە لەگەڵ ئۆزدەمیر بکەوێتە گفتوگۆی سیاسی‌و دانانی ئەو مەرجانە کە لەوانەیە ببێتە بنەمای دۆستایەتی کوردو تورك‌و هۆی ڕێکەوتنی ئەم دوو نەتەوەیە بەکجاریی. ئەم مەزبەتەیە (٢٦) سەرۆك عەشیرەت مۆریکردووە بۆ ناوەکان بڕواننە یاداشتی ل (٦٣٦-٦٣٧) و بۆ ڕێکەوتنەکەو نوێنەری شێخ مەحمود بڕواننە یاداشتی (٧).

ڕەفیق حیلمی دەڵێ "شێخ دەیویست سوێندی بۆ بخۆم کەس بە گفتوگۆکەمان نەزانێ پێم وت ئەگەر باوەڕت هەیە کە ئینسانێکی ڕاستم‌و خاوەن شەرەفم پێی ناوێ سوێند بخۆم ئەگەر بەبێ شەرەفم بزانی نرخی سوێندم ئەبێ چی بێ؟" شێخ دەوەستێ بەڵام سمکۆ دێتە جواب دەڵێ "تکام وایە باوەڕ بە ڕەفیق بکەی" ئینجا شێخ بە دوورو درێژیی باسی فیداکاریی خۆی دەکات کە لە ڕێی کوردایەتیدا نواندویەتی‌و ئەو کارەساتانەی بۆ

گێڕاونەتەوە لەم رووەوە بەسەری هاتووە [*]. باسی چوونی بۆ بەغدا دەکات پێش رۆیشتنی ئینگلیزو ئەو پەیمانەی مەندووبی سامی و مەلیك فەیسەڵ دەیدەنێ کە حکومەتێکی کوردیی دابمەزرێنێ. بەڵام لەو رۆژەوە هیچیان دیارنەبووەو شێخ لە مەبەستیان نەگەیشتووە، هەر داوایان لێ کردووە تورکەکان لە سنووری عیراق بکاتە دەرەوە شێخ وتویەتی تا ئەمان یارمەتی پێویستی نەدەن بەتەما نیە خۆیان بە خۆڕایی بۆ بخاتە ئاگرەوە، تورك بە ئاسانی دەرناکرێن و ئەگەر نەیتوانی دەریانبکات کێ فریای کورد دەکەوێ؟ [*]شێخ داوای بۆچوونی رەفیق حیلمی دەکات لەسەر ئەم مەسەلەیە. ئەویش دەڵێ ئەم قسانەی شێخ بە جێ بوون و هەر گوێی لێگرتوون، هەرچەند گومانیشی هەبووە لە راستی ئینگلیز. ئینجادەڵێت شێخ چی وتووە جوان و بەجێیە، بێ ئەوەی ئینگلیز پەیمانی خۆیان لە بابەت ئامانجی کوردەوە بەجێ بهێنن بەگژ تورکدا چوون لەبەرژەوەندی شێخ و کورد نابێت. لە گەڵ ئینگلیز تا بتوانن و سەربگرێت لەسەر بناغەی راست رێککەوتن بۆ شێخ جوانترەو بۆ کورد بەکەڵکترە. پێشی وتووە کە لە بەینی تورك و ئینگلیزدایە، هەریەکە دەیەوێ بەلای خۆیدا بیبات. بەڵام نابێ فریو بخوات، دەبێ بەوردی مەسەلەکە بیخاتە سەر سەنگی مەحەك و وانە لە رابوردوو وەربگرێت و لە مێژوودا رەوشتی سیاسی دەوڵەتەکان بزانێ و بە تایبەتی بزانێت ئامانجی خۆی چییەو ئەیەوێ چی بکات و بزانێ ئەوان بارودۆخیان چی‌یە؟ بەرامبەر ئەو

---

[*] یاداشت ٧ ل ٥٩ – ئەمانە بۆیە دەنووسین تا بزانن تا چ رادەیەك شێخ مەحمودو سمکۆش متمانەیان بە رەفیق حیلمی کردووە و بەشداریکردووە لە بیروڕای سیاسی و لە رێکخستنی نەخشەیەك کە لەسەری بڕۆن لەگەڵ ئینگلیزو تورك بۆ گەیاندنی نەتەوەی کورد بە ئامانجی سەربەخۆیی و لە دەستنەدانی هەل.

[*] ئەمە بۆ وەڵامی ئەوانە باشە کە لە خۆڕایی دەکەونە رەخنە گرتن لە شێخ مەحمود گوایە ئاگای لە کاروبارو سەردەم نەبووە نەیزانیوە هەل لەکیس نەدات. نەیزانیوە چۆن هەڵسوکەوت بکات هتد... شێخ ئەوەتا هەموو بارەکانی لێکداوەتەوەو ئاڵوگۆڕی کردووە بەڵام لە نێوان دوو ئاگردا بووە ئینگلیز (بەریتانیای عوزما) و سیاسەتی و ئیستعمارو بەرژەوەندییەکانی و تورکیاو دوژمنایەتی لەگەڵ کوردو مەسەلەی موسڵ و هتد... و بێ دەسەڵاتی کورد بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوو دەوڵەتی گەورە کە چەکو سوپای بە هێزو زۆریان بووەو نەبوونی پشتیوانی بۆ کوردو شێخ. هۆکاربوون ئەوانەی خۆیان لەو سەردەمەدا هەر لە دایك نەبوون ئێستا دادەنیشن و توانج دەگرنە ئەوانەی ئەو کاتە لەناو ئاگری جەنگدابوون و چەندجار چوونەتە جەنگەوەو بریندار کراون و گیراون و دادگاییکراون و حوکمی ئیعدام دراون و نەفی کراون بۆ هیندستان و هتد... خەڵك بە پێوەری ئێستا کاروباری ئەو سەردەمە دەپێون. راستە وتویانە: "ئێر ئاگای لە برسی نی‌یە"

ئامانجەی بەڕاستی بەرژەوەندیی تورك‌و سیاسیەتی حكومەتەكەیان لەگەڵ ئامانجی كورد ڕێك ناكەوێت، چونكە حكومەتی تورك سەربازەكانی لەشكری لە سیاسیەكانی زیاتر كار دەبەن بەڕێوە، بۆیە وڵات بە دیموكراسی‌و سیاسەت ئیدارە ناكات‌و نایەوێت پیاو خەیاڵی حكومەتی سەربەخۆی ببێت لە وڵاتەكەدا هەڵكەوێت.ئەوهەردەم هەوڵدەدات ئەمانە بفەوتێن، بەریتانیا سیاسەتی ئەوێ شەڕنا لەبەر ئابووری وڵاتەكەی، هەر بۆ پاراستنی سوودی ئابووری‌و بازرگانی شەڕ دەكات‌و كە ئەمری بۆ هاتە دیی حكومەتی وڵاتی داگیركراو دەداتە دەست خۆیان تا مەسرەفیان نەكات [*]بۆیە باوكم بەشێخ دەڵێت: "ناتوانیت لەگەڵ تورك ڕێكبكەویت‌و ڕێككەوتنی وا بناغەی ڕاست نیە" . شێخ دەڵێت "ڕاست ئەكەی منیش جارێ بڕیارمنەداوە لە گەڵیان ڕێكبكەوم، ساردیی ئینگلیز وایلێكردووم كە توركەكان لە خۆم نەسەڵمێنمەوە" وەك ڕەفیق حیلمی دەڵێ ئەو شەوە لەم بابەتەوە لە بەینی خۆی‌و شێخ‌و سمكۆدا زۆر گفتوگۆ كراوە، لەئەنجامدا شێخ هاتۆتە سەر ئەو باوەڕەی تەقەلا بدات ئینگلیزەكان بخاتە سەر بیری بەجێ هێنانی پەیمانەكەیان‌و تێیان بگەیەنێ كە دامەزراندنی حكومەتی كوردو سنووری كوردستان دەبێت پێش هەموو شتێك بێت.

باوكم نوسیوویەتی كە شێخ ویستویەتی بڕوای پێ بكەم ئەگەر ئینگلیز مەبەستی بێ ئامانجی شێخ وەك سەرەوە جێبەجێ بكات ئامادەیە خۆی بەختبكات لە ڕێی سنووری ئەم وڵاتەوە هەوڵدەدات خاكی كوردستان پاك بكاتەوە لە تورك.

كاتێ شێخ فایەلی ئەو نامانەی لەگەڵ تورك ئاڵوگۆڕكراون دەیداتە دەست ڕەفیق حیلمی، ئەویش دەیانخوێنێتەوەو دوا نامەی ناخاتەوە ناو فایلەكە چونكە شێخ دەڵێ ئەو نامەیە لەگەڵ دەستەیەكی تر كاغەزدا لەگەڵ هەیئەتی كورد بدەبە (ئەنقەرە) دواتر ئەمە درا بە گەورە بەرپرسانی حكومەتی تورك. باوكم خۆی یەكێك بوو لە ئەندامانی ئەو هەیئەتە كە چوو بۆ ئەنقەرە بۆ موزاكەرە لە گەڵ حكومەتی توركدا، ناوەڕۆكی ئەو نامەیە نرخێكی سیاسی زۆر گرنگی هەبوو بۆ دوارۆژی كورد، بە تایبەتی لە شەقامی ژیانی شێخ مەحموودا.

---

(*) ل ٦٣ یاداشت بەرگی حەوت .

١. به پێی ئەو نامەیە ئۆزدەمیر چەند نامەیەکی ناردووە بۆ (مستەفا کەمال )و حکومەتەکەی هێناوەتە سەر بڕیاردان بۆ دامەزراندنی خودموختارییەکی کوردیی لە کوردستانی عیراقدا لەژێر چاودێری حکومەتی تورکو والییەکی سەربەخۆدا وەك خدێویی ئەم ئیمتیازەش بدرێت بە شێخو نەوەی نێرینەی پشتاو پشتی .

٢. ئۆزدەمیر وتویەتی لەشکرێکی گەورە ئامادەیە پەلاماری موسڵ بدات ئەگەر پەیمانی لۆزان بێ شەڕ موسڵیان نەداتێ.

٣. ئۆزدەمیر بە زمانی لووس داوا لە شێخ دەکات هەیئەتێ لە کورد کە متمانەی پێیان بێت بینێرێتە ئەنقەرە [*] بۆ راستی پەیمانەکە و بۆ گفتوگۆ لە بابەت رێیو شوێنێ کە حکومەتی ئەنقەرە دایدەنێ بۆ دامەزراندنی ئەو خودموختاریەتەی کوردو پەیمانی نێوان هەردوو لا، گوایە لەوێ زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەم هەیئەتەن.

پاش گفتوگۆی دوورو درێژ لەسەر ئەمە رەفیق حیلمی دەڵێ: بڕیارماندا کە شێخ بۆ راگرتنی دۆستایەتی لەنێوان خۆیو ئینگلیزدا هەوڵ بدا ئەو هەیئەتەی ئۆزدەمیر داوایکردووە بینێرێتە تورکیاو هەیئەتێکیش بنێرێتە کەرکووکو بەغدا، تا لە مەبەستو بیری تەواوی ئینگلیز بگات. هەیئەتەکەی ئەنقەرە لە پێشەوە بچێتە رواندز لەگەڵ ئۆزدەمیر گفتوگۆ بکات، ئینجا بە ئەمری شێخ بڕوات بۆ ئەنقەرە.باوکم دەڵێت" مەبەستمان لەمە ئەوەبوو ئینگلیز وریا بکەینەوە کە موستەعدین دەست بۆ تورك درێژ بکەین تا نەرم ببن لەگەڵ هەیئەتەکەی لای خۆیانو وا بکەن هەیئەتەکەی لای ئۆزدەمیر بگەڕێنەوە".

## چونی بۆ ئەنقەرە

باوکم زۆر بە وردی رۆژ بە رۆژ چی بینیوە لە هەموو لایەکەوە لە دەفتەردا نووسیویەتیەوەو بۆ خستوینەتە سەر لاپەڕەکانی بەرگی حەوتەمی یاداشتەکانی، بەڵام بە داخەوە ئەمەی تەواو نەکردووە. لە ناوەڕاستی سەفەری گەڕانەوەیدا لە ئەستەمبووڵەوە بۆ سلێمانی[*] وەستاوە تا ئێستا هەر چەند گەڕاوین لەناو شتەکانیدا

---

[*] ل ٦٥ یاداشتی (٧) ئەو هەیئەتەی کە شێخ داوای لە رەفیق حیلمی کردووە ببێتە ئەندامی (واتە لەوانە بووە کە متمانەی پێ کردوونو بۆ ئەم مەبەستەی سەرەوە چۆتە ئەنقەرە) .

[*] ئەم باسە بە دوورو درێژی لە یاداشتی رەفیق حیلمی بەرگی حەوتەمدا ل ٦٦٠ تا کۆتایی بخوێنەوە.

هیچ دەفتەرێکی وامان نەبینیوە کە باسی کۆتایی ئەم سەفەرە بکات. هەروەها هیچمان بەرچاو نەکەوتووە کە بتوانین بەکاری بهێنین، هیچ نەبێت بۆ نووسینەوەی کەمێکی تر لە یاداشتەکانی، لەلایەك نووسیویەتی بەتەما بووە (١٨) بەرگ یاداشت بنووسێتەوە، ئایا ئەوانەش لەو سێ سندوقەدا بوون کە کاك جەمال بابان لەسەر زاری کاك فایەق هوشیارەوە وتبووی لە ماڵی خەزووری رەفیق حیلمی بوونو کاك فایەقو مەحمود خەفاف بردویانەو سوتاندوویانن. گوایە نووسراوەکانی پارتی هیوا بوون ئەو کاتەی رەفیق حیلمی سەرۆکی باڵای بووە؟!

بڕوانە پەخشانەکەی مامۆستا عەبەورەزاق بیمار لە کتێبی( پەخشانی کوردی)دا کە باسی ئەم پەخشانەی باوکمی کردووە. وەك نموونەیەك بۆ پەخشانی زانستیانەو جوانی گەشتو گەڕان دایناوە. بزانە چۆن هیچی نەهێشتووە باسی نەکردبێت سەبارەت بەو سەفەرەی بۆ ئەنقەرە . ئاووهەواو دیمەنی سروشتی بێ هاوتاو کەسێتیو کەسایەتی هەر کەسەی لەگەڵی بوون یا بینونی تەنانەت جلو بەرگو کەلوپەلو خواردنو کردنو هەڵسوکەوت و پلەی شارستانییەتیان لە هەر شارەو وڵاتەو شێوەی رابواردنیان لەهەر لایەك، میوانخانەو چێشتخانەو هۆی گواستنەوەو ڕێگەوبانو وەرزو سەرماو بارانو تۆف لە هەندێك جێگەو ئاوو هەواو دیمەنی جوان لە هەندێك شوێنی تردا بڕوانە باسی پەرینەوەیان لە زینوی شێخو ساردو سەرماو قوڕو چڵپاوو بەفرو ڕێگەی سەخت ! بڕوانە چۆن لە گشت شتێك ورد بۆتەوە تەنانەت چۆن ئاوو گۆشتیان لە کاسەدا لێناوەو بە چەندیان فرۆشتووە هەروەها نرخی هەموو شتێك. بڕوانە وەسفی منداڵی هەژارو بێ غیرەتیی ئەوانەی بەکاریان هێناون! وەسفی لێقەوماوی جەنگەکانو ئابووریانو برسێتیوهەژارییان ... بڕوانە چۆن فرمێسکی بۆ ئەمانە ڕشتووە بە درێژایی ئەو ناوچە لێقەوماوانە، ئەوانە کوردو ئەرمەنی بوون بڕوانە باسی چایخانەکان لە گەلێك جێگە کە وەك حەمامی ژنان بووە جێگەی دانیشتن نەبووە پەرپووتو بێ کەلوپەل بووە باسی هەندێك شاری وەك تەورێزو میوانخانەکانیو وەسفی دەعوەتی شابەندەری رووس بۆیانو هتد... بڕوانە وەسفی شاری ئەنقەرە پایتەختی ئەتاتورك چەند چۆڵو هۆڵو بێ دەنگ بووە. بە پێچەوانەی شاری تەورێزە... ئەمە بەڕاستی دەشێت بکرێتە فیلمێکی مێژوویی لە گەڵ وەسفی گەڕانەوەی شێخو سمکۆدا...

## ڕێگەی سەفەرەکەی وەك نوێنەری شێخ مەحمود بۆ ئەنقەرە

سێ ڕۆژ پاش موزاکەرەو ئەو هەموو گفتوگۆیە لەگەڵ شێخ مەحمودا بە حزووری سمکۆ ، لە ٢١ شوباتی ١٩٢٢ (ڕەفیق حیلمیو فەتاح ئەفەندی[*] ویوزباشی ئەمینی عەتارو ئەحمەد تەقی) بەیانی پێش هەتاو کەوتن لە ماڵی (وسوو ئاغا) کۆ دەبنەوە. لەوێوە بێ ئەوەی کەس بزانێ [*] لەگەڵ چوار سواری تر ڕووەو ڕواندز دەکەونە ڕێ.

یەکەم شەو لە ماڵی عەباسی مەحمود ئاغا لە ڕانیە دەمێننەوە سێ فڕۆکەی ئینگلیز بەسەر سەریانەوە دەڕۆن لە شاخەکانەوە بەلای قەندیل دا دەڕۆن بۆ ڕواندز. لە ڕواندز ئۆزدەمیر پاشا لە ماڵی حاجی نەورەس ئەفەندی میوانداریان لێ دەکات.

ڕەفیق حیلمی زۆر بە وردی ڕەوشتی جوانی ئۆزدەمیر باس دەکاتو دەڵێ خۆمانم بیر کەوتەوە کەیەکێکی وامان پێویست بوو. چۆن بۆ خزمەتی وڵاتەکەی لە پلەی خۆی هاتۆتە خوارێ بۆ ناو خەڵکەکەو لە خۆی نزیك خستونەتەوە پێنج فەرزە وەك سۆفیو نوێژ کردن...

## لەگەڵ ئۆزدەمیر پاشا ( عەلی شەفیق )

ڕەفیق حیلمی وەك وتمان باسی ئۆزدەمیر دەکات.دەڵێ زیرەك وریابووەو ئەهالی هەڵخەڵەتاندووە بە هاتنە خوارەوەی لە پلەی بەرزیو نوێژو سۆفێتی ... ئینجا دەڵێ: بە گفتوگۆکانی لە گەڵ ئەوانو بەرابەریکردنی ئەمە لەگەڵ ئەهالیو ساوێلکەو نەخوێندەواران تێگەیشتم کە ئەمە بە بلیمەت دەژمێردرێت. هەر چەند لەژێر ڕیشەکەیەوە کەدەمڕوانیە بریسکەی چاویو وردیی بیری گومانم نەدەما کە نوێنەرێکی زۆر بەهونەرە. خەڵکەکەی لە ئینگلیز هەڵئەگەڕانەوە. سفرەو خوانی عەشایەرانەی بۆ سەرەك عەشیرەتەکان دادەناو دەبووە هاوڕێی گەلێکیانو هتد...[*]

---

[*] ل ٦٦ یاداشتی ٧ ، فەتاح ئەفەندی – برای ژنەکەی شێخ مەحمودبووە.

[*] لە نامەیەکی بچووکی شێخ مەحمودا بە مۆری خۆی بۆ ڕەفیق حیلمی نووسیوە کە نابێت بە هیچ شێوەیەك تەنانەت ژنەکەشی بەم سەفەرە نهێنیە بزانێ. بۆیە پاش ئەو ماوە درێژە ئەگەڕێتەوە ماڵی خۆی لە سلێمانی نازانن لە کوێ بووەو چی لێهاتووە تەنانەت بەتەماشی نامێنن .

[*] ل ٦٨ یاداشت ٧ بۆ درێژەی باسی ئۆزدەمیر .

باوکم دەڵێ لە لایەن ماڵی شێخ مەحمودەوە هەندێ دیاریان بۆ خانمی ژنی ئۆزدەمیر پێ بووە دیارییەکان زێڕبوون لە لایەن مەلیکەوە بۆ ناودارەکانی رواندز تۆپە تاقەو چەفتەی سورمەی نایابیش نێردرابوو.

بەم چوونەی رەفیق حیلمی و هاوڕێکانی بۆ لای ئۆزدەمیر هێندەی تر لای خەڵك شیرین بوون و ئۆزدەمیر لە خۆشی ئەوە زۆر بە کوڵ و بە دڵ خزمەتی رەفیق حیلمی و وەفدەکەی دەکرد.[*] بەڵام، باوکم دەڵێ ئێمە دڵمان لە لایەکی تر بوو بیرمان لە شتێکی تردەکردەوە، بیرمان لەوەدەکردەوە لە دوای چونمان بۆ رواندز ئینگلیزەکان چۆن دەجوڵێنەوە لە گەڵ شێخ مەحمودا؟ سلێمانی دەکەوێتە چ وەزعێکەوە؟ لەگەڵ ئۆزدەمیرو تورك.

ئۆزدەمیر وتویەتی ئەگەر ئینگلیز هێزێکی ناردە سەر سلێمانی و شێخ نەیتوانی بەرەنگاری بێتەوە، دەبێت بێتە رواندز بەخۆی و هێزەکانیەوەو لەگەڵ هێزی ئۆزدەمیر پێکەوە دژی ئینگلیز بوەستن و موسڵ بخەنەوە ژێر رکێفی خۆیان...بەمە تەقەلای دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لە عیراقدا لە ژێر حوکمی شێخ مەحموودا سەر دەگرێت.

باوکم دەڵێت فەتاح هەر دەیوت "ئەوێت ئەفەندم"[*]

بۆیە خۆی ویستویەتی لە ئۆزدەمیری بگەیەنێت کە شێخ کابرایەکی ساویلکەو خۆش باوەڕنی‌یەو بە هەموو دوعایەك ناڵێ ئامین. ئۆزدەمیر بە هەموو بارێك بردویەتیەوە سەر ئاین و موسڵمانێتی و بە ئاشکرا پێی وتووە شێخ وەك رەفیق حیلمی لێکیداوەتەوە سەودای میللەت و کوردایەتی لەسەریدانیە، موسڵمانێکی پاکەو دۆستی ئەوانە.

ئەم هەیئەتەی لای ئۆزدەمیر راسپێردراون لە رواندز چاوەڕێ بکەن تا ئەمر لە شێخەوە وەردەگرن بڕۆن بۆ ئەنقەرە یان بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی بە پێی وەڵامی ئینگلیزو سەرئەنجامی وەفدەکەی بۆ لای ئەوان چونەتە کەرکووك و بەغدا.

---

[*] ل ٦٩ یاداشت ٧

[*] بڕوانە باسی فرۆفیلی فەتاح ئەفەندی کە لە سوپای تورکدا دەبێت و ئیدیعا دەکات دەریانکردووە تومەز ناردوویانە شێخ فریو بدات دژی تورك کە گەیشتونەتە ئەنقەرە رەفیق حیلمی بەمەیزانیوە.

ئۆزدەمیر کاتێ دەبینێت رەفیق حیلمی زۆر وەڵامی دەداتەوە دەڵێ تۆ بۆ مەبەستی خۆت دەتەوێ شێخ وادەربخەیت کە کوردێکە بەتەنیا شوێن سەربەخۆیی کوردستان کەوتووە باوکم بۆخۆی سەبارەت بەم قسەیە دەڵێ "ئەمە هەر بۆ ئەوەی تێمبگەیەنێت من کوردێکی نیشتمانپەروەرم واتا دوژمنی تورکم یان خائینم " ئۆزدەمیر لەدرێژەی قسەکانیدا وتوشیەتی وابزانم رەفیق حیلمی شاعیریش هەر تۆی ، چونکە لە بیرمە لەغەزەتەیەکدا شیعرێکی (رەفیق حیلمی ) ناوێکم خوێندۆتەوە کە ئەمە چەند بەیتێکە لەو شیعرە :

مەسقەتم در مەسکەنم در مەدفەنم در

کیمسە کوردستانمە یان قمە سون

ئاقما یورسە چاغلا یانلر کورد ایچین

ئیستەمەز من بعد اصلا اقماسۆن

کە ئەم شیعرانەی خوێندۆتەوە ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان ڕوویانکردۆتەباوکم و بەرامبەر بەم پلارتێکرتنەی ئۆزدەمیر بە زەردەخەنەیەکی شڵەژاوەوە تەماشایانکردووە.باوکم دەڵێ: بۆ جاری یەکەم وەك فەتاح وتم بەڵێ قوربان (ئەڤێت ئەفەندم).

واتای ئەو شیعرە بە کوردی ئەمەیە:

"کوردستان جێگەی لە دایك بوونمە، نیشتمانمە، گۆڕمە

لەبەر ئەوە نامەوێت کەس بە تیلەی چاو تەماشای بکا

ئەو تاڤگانەی بە شاخەکانی کوردستانمدا دێنە خوارێ

ئەگەر بۆ کورد نەبن باهەر نەبن! پێی ناوێ ئیتر با نەیەنە خوارێ "

باوکم و هاوڕێکانی شەوێك لەسەر زیافەتی ئۆزدەمیر لە ماڵی ئەشرافێکی رواندز دەبن، باسی ئەو فڕۆکانە دەکەن کە وتویانە پێش دوو رۆژ چوونەتە شاری سلێمانی. لەو کاتەدا دوو سواری شێخ گەیشتوونەتە لایان و نامەیەکیان داونەتێ بینیویانە فڕۆکە ئینگلیزەکان هەڕەشەیان لە لەشێخ کردووە کە خۆی و هەیئەتی حکومەتەکەی لە رێگەی چەمچەماڵ و کەرکووك-ەوە بچنە بەغدا خۆیان بخەنە بەر رەحمەتی حکومەتی بەریتانیا،

شێخ لەنامەکەیدا ئەمری بە رەفیق حیلمی و هاوڕێکانی کردووە راستەوخۆ بچن بۆ ئەنقەرە، خۆی و سمکۆش تەرتیباتی خۆیانکردووە.

دوای ئەمە ئۆزدەمیر دوو نوێنەری خۆی کەفەوزی بەگ و رەمزی بەگ دەبن لە گەڵ وەفدەکەی رەفیق حیلمی دەنێرێت و دەبن بە (٥)کەس و (٤) کەسی تورکیش لە گەڵیاندا لە رێی دەربەندو زینووی شێخەوە دەکەونە رێ لەوکاتەشدا رێگەی تورکیا بەفر گرتوویەتی بەهۆی سەختی زستانەوە بۆیە بە رێی ئێراندا دەڕۆن لە ورمێ و تەورێزەوە.

تەنیا بەربەست پەڕینەوە بووە لە زیندووی شێخ تابچنە ئەو دیوی ئێران، ناوبانگی (زیندوی شێخ) کەلەنێوان رواندزو شنۆدایە بۆتە داستان. ئەوشوێنە سامێکی کوشندەی هەیە بە شێوەی ناوبانگی (دەربەندی قوتور) لەلای خەڵکی (وان) و( دەربەندی شەپکە) لە کێوە بەرزەکانی (کاربات) لە (بەڵقان). بۆیە هەر پێش دەرچونیان لە رواندز یەکی سەرو جووتێك کالەو پێتاوی کوردیی دەکڕن و ناڵ و بزمارو هتد بۆ وڵاخەکانیان دادەنێن دێهاتەکان ئاگادار دەکەن کە چی یارمەتییان پێویست دەبێت فریایان بکەون لە دەربەند، بێ زەحمەت دەردەچن، ئێوارە دەگەنە زیندووی شێخ کە کەم کەس بەزیندوویی لەوێ ڕزگاریان بووە. لێرەدا رەفیق حیلمی رای فەلسەفیی دەردەبڕێت و دەڵێ سروشت کوێر نییە چۆن لە ئەمازۆن مەلاریا بڵاوەو داری (گەنە گەنە) هەیە کە بۆ چارەی ئەم نەخۆشییە باشە. هەروەها لەو جێگە ساردو زوقم و لەم سەرە رێگە سەخت و گرنگەدا پاش (١٠) سەعات رۆیشتن کە باران و بەفر تا ئەژنۆ هاتبوون وەك پلوسك بەسەرو لەشی خۆیان و وڵاخیان و کەل و پەلیاندا هاتۆتە خوارێ تا ئەژنۆیان لە قوڕو چڵپاوی بەفرداببووە پاش ئەمانە خوا ماڵە کوردێکی میوان پەرستی هێناوەتە رێیان سەیری ئەم تابلۆ شاکارەی رەفیق حیلمی ئەمجارەشیان نەخشی کردووە بە وشەو پەخشانی بێ هاوتا، بیخوێننەوە بزانن هەست بەچی دەکەن ؟!

ئەودەڵێ، پاش ئەم سەفەرە سەختە بگەرە دیوەخانێکی پاکی بێ دەنگ گڕی ئاگری کورەی دیوەخان و زیڕەی سەماوەری وەرشاو خواردنەوەی چای لەعل رەنگ و گەرم و خۆش (*) چەند بە تام و سەعاتێکی فەرەح بەختە! لە ماڵی شێخ عەبدوڵڵا نەوەی شێخ

کـەمال [*]حەسـاونەتەوە حەسـانەوەیەك کـە بـاوکم دەڵـێ تـامردن تـامو لـەزەتی لـە بـیر ناچێتەوە. جل‌وبەرگیان بۆتە سەر هەویر لە قوڕاوی بەفردا دەست‌و پێ‌و سەریان لە ناو ئاوی گـەرمی سـوێنەدا شتووەو شێلراون، خـوێنی گـەرمیان تـێ زاوەتـەوە. چیکڵدانەیان لەبـەر سـەرماو برسـێتی کەوتۆتـە تـەمبوورە لێـدان بـەناو سـاجی گـەرم‌و نـەرم‌و کـەبابی مریشك‌و قبوڵی چەوری بە ڕووبەهەنار لێنراو لە نەغمە سازیی کەوتووە. لە ناو جێگای ئاوریشمیی پاك‌و خاوێندا خەوێکی قووڵ‌و خۆش [*]باڵی بەسەردا ڕاکێشاون، ئاگایان لە دونیا بڕاوە. بەیانیش هەروەها چاو نان‌و قاوە خراوەتە بەردەستیان ئینجا خۆیان ئامادە کردووە لە سنووری ئێران بچن بەودیوودا. ئەم گـەروە سـامناکەی (زینـووی شـێخ) ببڕن. شێخ عەبدوڵڵا و عەلائەدینی خەلان تێشویەکی زۆر بەلەزەتیان بۆ ئامادە دەکەن، خاوەنی ئەم دیوەخانەی حاتەمی‌تەیە بیست سواری لاوی وەك بێچوە شێریشیان دەخاتە پێش تا ڕێگەیان بۆ بکەنەوە لەناو بەفرەکەدا . [*]

بەوشـەوەو بـەم هـەموو خزمەتـەوە ئـەو ڕێگەیەشـیان بردۆتـە سـەر . هـەروەها باسـی دوعـاکردن دەکـات کـاتی بـەفرو سـەرماو بـاران بۆئـەوەی هـەتاو دەربکـەوێت ئـەمان بـە پێچەوانەوە لـەو ڕێگـە ساردو سـەرماو تۆفانـە دوعایـانکردووە هـەتاو دەرنەکـەوێت نـەك

---

[*] لە نامەیەکمدا بۆ ماڵەوە کاتێ لە گەڵ باوکم‌و دایکم لە دەربەندی نزیك خەلان بووین، باوکم بە سەردانی ئەو جێگایانەی لەم سەفەرەیدا بۆ ئەنقەرە چوبووە ئەوێ کە لەو جێگایانـەدا یاداشتەکانی بنووسێتەوە. وەك بەم وەسفی ماڵی ئەم شێخ عەبدوڵڵا یەدا دەردەکەوێت کە ئەو پیاوە بەماڵ‌و باخ‌و باخاتەکانی لە خەلان لەوانەیە هەمان شێخ عەبدوڵڵا بێت یا وەچەی ئەو بڕوانە ئەو نامەیەی کە دەیخەمە ئەم کتێبەوە. چونکە لە هەمان کاتدا باسی ماڵی (شاکر مجرم) یشم کردووە کە ئەویش لەو سەفەرەی ڕەفیق حیلمیدا باسکراوە.

[*] تێبینـی :- بـاوکم کـاتێ یاداشـتەکانی دەنووسـیەوە مـن‌و دایکـم‌و بـرا بچـووکەکەمی بـرد هـەر لـە هەولێرەوە بە ڕێگەی بێخاڵ‌و گەلی عەلی بەگ‌و دەربەندو شاخەکانی دەوری دەربەندەکەدا بردینی و لە وێدا خزمێکمـان کـەپری بـۆ هەڵـدابوو نزیـك چـایخانەو ئـوتێلێکی هـاوینی شـاخەکەوەو ئاوی دەربەندەکـە لـە خوارەوە هاژە هاژی بوو، پاشان بردینی بۆ حا جی هۆمەران‌و لە دێیـەکی سـەر شاخەکە بردینـی بـۆ ماڵـە ئاغایەك، باخ‌و باخات‌و حەوزو ئاو وفەرش‌و دۆشەك لە دەوری‌و چاو سەماوەرو دار میوەی قەیسی‌و سێو بەسەرمانەوەو خاوەنی ئەم ماڵ‌و دیوەخانە ناوی شێخ عەبدوڵڵا بوو ئایا ئەمە بووە ئەو ماڵـە یـان یـەکێکی وا بووە ئەوە نازانم. هەروەها بردینی بۆ ڕواندز بۆلای شاکر مجرم وەك دیارە ئەمە بۆ یـادی ئـەو جێگایانـە بووە کە پێشتر پیاڕۆیشتبوو. بۆئەوەی یاداشتەکانی بنووسێتەوە.

- بڕواننە باسی ئەم گەشتەی ڕەفیق حیلمی لە گەڵ من‌و دایکما لەم نامەیەمدا بۆ ماڵەوە

بەفرەکە بتوێتەوەو بڕوخێت بەسەریاندا. ئینجا دیسان بەپەخشانێکی جوان باسی هەورو هەتاو لە پشتییەوە دەکات کە وەك چاوشارکێ تاوێ خەریك بووە دەرکەوێ و ون بۆتەوە لە گەڵ ئەوەدا دڵیان لەترسدا بووە نەك دەربکەوێ . دەڵێ وەك ئاسك بە گورجی و لەش سووکی رێگەکەیان بڕیوەو تا نیوەڕۆ ئەوەندەیان نەماوە لە سنووری عیراق بچنە دەرەوە بۆئەوەی شەویان بەسەردا نەیەت لە زینووی شێخ کە ورچیشی تیدا نەژیاوە. لەو کاتەدا هەتاو گۆشەیەکی روخساری نازەنینی دەرخستووە بڕوانە چییان بەسەر هاتووە ئەوەتا رەفیق حیلمی دەڵێ: "خوا بەبەشی هیچ کەسێکی نەکات لە ماوەی سەعاتێکا هەتاو بەنێونیگا کارێکی بەسەر هێناوین لەناو دەریای لیتەو قوڕاوی بەفراو .. بەدەم ناگێڕێتەوە ."(*)

لەکۆتایدا دەڵێ" بە یارمەتی خوا، تەنگمان بە زینووی شێخ هەڵچنی" بەسەر تەپۆڵکەیەکدا سەردەکەونە سەرەوە لەسەرو ئەوەوە دەشتی ئاوداری (شنۆ)یە بای نەسیمێکی ساردو بۆنخۆش لێیاندەدات ئیتر دەچنە ئەو دیوی ئێران دوو رۆژ ئەسپەکانیان بە دوای خۆیاندا راکێشاوە چونکە ئەو ئەسپە بەستەزمانانە لە عەزرەتا میزی خوێناوییانکردووە. ئینجا خۆیاندەدەن بەزەویداو ئەمانیش تۆزێ لە تێشوەکە دەخۆن و خۆیان دەدەنەوە بەسەر ئەسپەکانیاندا تا نەکەونە شەو، چوونەتە خوارێ بەرەو دەشتی پان و هەزار بە هەزاری پڕ لە ئاوی چەمەنی گوڵزاری شیرینی شنۆ و لە ژێر تیشکی گەرمی خوێن بزوێنی بزوێنەری ئافتاوی کوردستانی ئێران بە سواریی رێگە دەبڕن تا دەورو پشتی شنۆ دیسان بڕوانە ئەم تابلۆ شاکارەی تری رەفیق حیلمی بە کورتی دەڵێ" پاش شنۆ بەیەك وشە سروشت مژدەی نەورۆزی پێ بوو هێندە فێنك و خۆش نەسیم و چیمەنی سەوزبوو بە ئاورنگ و گوڵ و گوڵزار رازاوەبوو بە درێژایی رێگەکە تاڤگەو جۆگەی ئاوی بلوورین بینراون و هتد ...).

<u>شاری ورمێ</u> : پاش حەوت ڕۆژ لە رواندزەوە دەگەنە ورمێ لەم سروشتە خۆشەدا رەفیق حیلمی بیر لە کەساسی و هەژاریی هەرێمەکە دەکاتەوە "لەم بەهەشتەدا دۆزەخیەکان دەژیان.. "ورمێ نزیك دەریاچەی ورمێ یە. ئاوو هەوای و بازاڕی رێك و

---

(*) بەم وەسفەدا دیارە حاڵیان لەم رێگەی زینووی شێخەدا لە حاڵی سوپای شکاوی ناپلیۆن و هیتلەر چووەکە لە مۆسکۆوە بە سیبیریادا گەراونەتەوە .

پێکی و گشت خواردەمەنی یەکەی باس دەکات و دەڵێ ئەم شارە بازرگانیە بە چوار شورە دەورە دراوە خەڵکەکە بە تورکی و کوردی گفتوگۆ دەکەن و فارسیش دەزانن. سەردەمێک لەژێر دەسەلاتی شکاك دا بووە، لێرە شابەندەرخانەی تورك هەبووەو زۆر هەوڵی بۆ داون بەلام کوماندانی ناوچە تەگەرەی خستۆتە بەردەمیان (٣) رۆژ تەفرەیداون و ولاخەکانیان فرۆشتووە بەتەمابوون بە پاپۆر بە دەریاچەی ورمێدا بپەڕنەوە.بۆیە رەفیق حیلمی نامە دەنێرت بۆ والی و ناوی خۆی لە بیر دەچێ بیخاتە سەر لیستەی ناوەکانیان. دەیەوێ دیسان بۆ والی بنووسێتەوە فەوزی بەگ بەسەر خۆشیی زۆری لەسەر دەڕوات نایەوێ ئەمە بکات لێیان دەبێ بە شەڕ، لەسەر ئەمە باوکم زۆر لە فەوزی بەگ دەدات شابەندەری تورك ئاگای لەمە دەبێ پیرۆزبایی لە باوکم دەکات بۆ سەرکەوتنەکەی. فەوزی بەگ بۆ بەیانی باوکم ئاشتدەکاتەوە.

## لە ورمێ وە بە پاپۆر بۆ شەرەفخانە

والی ئەمر ئەکات بەعەرەبانە بچن بۆ ئەسکەلە بۆ سەر پاپۆری ئازادستان. بەیانی زوو شابەندەری تورك رەفیق حیلمی دەباتەلای خۆی بۆ چا خواردنەوە، دوای سەعاتێك بە پایتۆن دەچن بۆ ئەسکەلە (ئەسکەلە واتا رۆخی دەریا) پاپۆڕەوانەکە دەچێ بە پیریانەوە لاوێکی کورد دایان دەمەزرێنێت و دەستبەجێ پاپۆر دەکەوێتە جولانەوە. پاپۆڕەوان دەعوەتیان دەکات فەوزی بەگ لەسەر وەعدی خۆی ناخواتەوە.

پاپۆڕەوانەکە دەڵێ ئاوی ورمێ تاڵە ماسی تیا ناژی و پاپۆر بە کزە بایەك دەکەوێتە شەپۆل و سەرنشینان سەغڵەت دەبن. (باوکم دەڵێ ئەمە راست بووە) هێندەی پێ نەچووە شەپۆل و فەرتەنە و دڵ تێکچوون دەستیپێکردووەو چوونەتە نهۆمی خوارەوەو ڕشاونەتەوەو سەریان هاتۆتە ژان. پاش چوار سەعات گەشتوونەتە رۆخی شەرەفخانە. رۆژێك پێش جەژنی رەمەزان لە ئازادستان دادەبەزن .

## لە شەرەفخانەوە بۆ شیستەر

لە شەرەفخانە لە خانویەکدا پاش نانی نیوەڕۆ ئەفسەرێکی ئێرانی پێیان دەڵێ کوماندان داوای رەئیسی هەیئەتەکە دەکات. فەوزی بەگ دەنێرن چونکە هەر ئەو هێشتا جلی دانەکەندووە، کە دێتەوە دەڵێ کوماندان وتویە بروسکەی بۆ هاتووە گوایە رەفیق حیلمی و هاورێکانی بگرن و تەسلیمی ئینگلیزیان بکەن، بۆیە دەبێ لەوێ نەمێنن خۆیان

دەرباز بکەن، باوکم لەڕووی مەنتیقەوە ئەمە بەڕاست نازانێت و دەڵێ ئینگلیز چی دەکەن لەوێ و چ زەبرێکیان هەیە؟ بەڵام دیسان لە ترسی گەڕێکردن بڕیار دەدەن بڕۆن. ناچار لە شەرەفخانەوە بچن بۆ شیستەر بەبێ خەوتن بەو هەموو ڕشانەوەیەوە بەسواری گوێدرێژ بکەونە ڕێ یان بە پێ. ڕێگەی شەمەندۆفێر هەبووە بەڵام بەجەژن نەبووە.

دوو گوێدرێژیان بۆ بە کرێ دەگرن و دەڵێن ڕێگەکە هەر چوار سەعات دەبێت . بۆیە کەلوپەلەکانیان دەخەنە سەر گوێدرێژەکان و خۆیان بەپێ دەڕۆن لە جیاتی چوار سەعات دەبینن ڕێگەکە یانزە سەعاتە. ئەم ڕێگە دوورو درێژە بەپێ دەبڕن بەدەم ڕۆیشتنەوە ئەو کشمیش و بادەمەی لە شەرەفخانە کڕیویانە دەیخۆن(*) نیوە شەو دەگەنە شێستەر .

شێستەر دێیەکی ئێرانە بەڵام باوکم دەڵێ دێهاتی ئێران وەك ئەوانەی ئێمە نین گەورەو ئاوەدانن و لەشارو شارۆچکەی ئێمە دەچن. پاك و خاوێنن و بازاڕو دوکانی ڕێك و پێك و قاوەخانە وچایخانەو کاروانسەرایان تێدایە بەو نیوە شەوە خواردنی باش و جێی نووستن دەستدەکەوێ.. شەوێ لە ژوورێکا دەبن پاش نان و چا بە عەرەبانەی بارهەڵگر نزیك قاوەڵتی بە (میان دواب) دا بەتیژی تێدەپەڕن. لێرەدا دیسان ڕەفیق حیلمی ماتەمینی دەیگرێت و بیری شەڕی یەکەم دەکاتەوە کاتێ حیلمی بەگێکی تورك شارەکانی کوردستانی ئێران وێران دەکات و سابلاغ و بانە داگیر دەکات و سەردارەکەیان دەکوژێت و تاڵانیاندەکات دواتر ڕوودەکاتە شوێنەکانی تر. باوکم دەڵێ ئەو وەختە لە ئەستەمبووڵ دەیخوێند هەر ڕۆژە کە حیلمی شارێکی داگیردەکرد لەسەر ئەو نەخشەیەی ئێران کەبەڕووکاری کتێبخانەکانەوە هەڵواسرابوو بەیداخێکی کاغەزیان لەسەر چەسپدە کرد بەوەدا دیاربوە کەلەو کاتەدا ئاگای لە دەنگوباسی ئەم کارەساتە بووە.هەروەها دەڵێ: "لە ژێرەوە بۆ بەسەرهاتی بێ خاوەن و بێ دەسەڵاتەکان فرمێسکم ئەڕشت.لەشکرەکەی ئەم حیلمی‌یە سەرتاپای کورد بوون هەر حیلمی خۆی کورد نەبوو. ئینجا بزانن چۆن بە کورد خۆی کوردیان فەوتاندووە؟!"

---

دواتر وەسفی ئێرانی تەپلە بەسەر دەکات کە بەڕیز لەسەر فەرش دانیشتوونو نێرگەلەو چای دیشلەمەیان گێڕاوەو کڕنووش بردنو سڵاو لە هەمووان هەبووەو بەمەدا (یەنی چەری) مۆزەخانەی ئەستەمبوڵی هاتۆتەوە بە بیردا.

لەپاشاندا باسی خواردنی گۆشتاو دەکات ، باسی گۆشتاوی عەجەم کە لە گلێنەدا دادەنرا هەر گلێنەیەو بەجیا ڕیزدەکرا لەسەر ئاگردانو تامو بۆنو چێژی لەگەڵ گۆشتاوی ئێمەدا جیاوازبوو تەنانەت نرخی خواردەمەنیەکانو خواردنو جۆری لێنانیشیانی بە وردی نووسیوە کە گلێنەیەك لەوانە بەیەك تارانی بووە واتە ٢٠ فلسی عیراقی کە بە چاو نێرگەلەو میوەو بەخشیشەوە دوو تارانیی کردووە .

تەورێز: پاش گۆشتاو خواردن دەچن بۆ تەورێز لە (میان دوئاب) دوو شەقام هەبووە لە خۆرهەڵاتەوە چووە بۆ تەورێزە. شەقامی لای چەپی بۆ جولفای نێوان ئێرانو ئازربایجان لەوێدا بۆ وەرگرتنی ڤیزە پێویستیان بەوە بووە چاویان بە نوێنەری تورکو روس بکەوێت لە تەورێز، چونکە تا تەورێز بێ پاسپۆرت چوون. لەوێوە بە پاسپۆرتی تورکیو بەناوی خواستراوەوە [*] بە خاکی ئێرانو ئەرمەنو گورجستان واتا بە ئازربایجانو قەفقاسدا [*] ڕۆیشتوون بۆ تورکیا.ڕەفیق حیلمی دەڵێ بۆیە لێرەوە پێویست بووە بچنە تەورێز چونکە تا ئەوێ هەربە هۆی نارەحەت ڕۆیشتوون وەك بریچقەو زۆر ماندوو بوون ویستویانە بە هۆیەکی باشتر بڕۆن ،باش بووە لە تەورێزەوە پایتۆنێك چووە بۆ جولفا بەمە ڕۆشتوون لێرەدا بۆ یەکەمجار باسی (مەحمود)ی خاڵی دەکات کە بە درێژایی سەفەرەکەی تا تورکیاو گەڕانەوەی لەگەڵیدا بووە دەڵێ کە ئەمو پیاوەکەی فەوزی بەگ-یان لەگەڵ بریچقە ناردووە لە پێشەوەیانو خۆیان بە پایتۆنەکە ڕۆیشتوون و ئەمە یەکەم جار بووە پاش دەرچوونیان لەسلێمانی بەهۆیەکی هاتووچۆی

---

[*] پاسپۆرتەکە بەناوی خواستراوەوە بووە .
لێرەدا نموونەی ئەو پاسپۆرتەی بەناوی خواستراوەوە دراوە بە مورافیقەکەی مەحمود ئاغای کوڕی خاڵی ڕەفیق حیلمی دەیخەینە روو کە لەوێدا ناونراوە حەسن ئەفەندی

[*] د. موکەرەم تاڵەبانی کە وتویەتی "ئێمەی ڕۆشنبیران بە ڕۆژنامەو رادیۆ باسی روسیای سۆڤێتیمان بیستووە اتا ئاگایان لە بڵاوبوونەوەی شیوعی بووەو ڕەفیق حیلمی گوایە ڕۆشنبیر نەبووە چونکە نەبۆتە شیوعی و ئاگای لێ نەبووە بابزانێ کەئەو خۆی بەناو روسیای سۆڤێتیدا ڕۆیشتووەو باشتری ناسیون .

نەرمو شل بڕۆن. بانگی ئێوارەی هەفتەی دووەمی مارتی ١٩٢٢ دەچنە ناو پایتەختی شاهەکانی سەفەوی. ئینجا بڕوانە چۆن باسی ئەم پایتەختە دەکات، شاری تەورێز، شەقامی دوورو درێژی پان، هەموو هۆیەکی تازەی گواستنەوەی تیادایە خۆیان سەری پایتۆنەکەیان هەڵداوەتەوە بۆ سەیرکردنی ژنو پیاو بەرگی خۆرئاواییان لەبەردابووەو قەڵەبالغی، پلەی بەرزی شارستانێتی، بینای چەند نهۆم، میوانخانەی گەورەو گشت هۆکانی رابواردنی تێدا بووە، دوکانو بازاڕو خواردنی بەتامو چێژو پاكوخاوێن خزمەتی چاكو هتد...لەو کاتەدا تەریق بونەتەوە کە خۆیان بەراوردکردووە بەوان تا ئەو کاتە هەستیان نەکردووە چییان بەسەر هاتووە، خۆیانو جلوبەرگیان بەربادبووە بۆیە خواخوایانبووە بگەنە میوانخانەیەك تا چارێکی خۆیان بکەن کاتێ لە ڕێگە بوون ئاگایان لە جلوبەرگ نەبووەو بە جوانی سروشتەوە گیرۆدەبوون، لەوێدا خۆیان بیر کەوتۆتەوە ویستوشیانە خۆش رابوێرن بۆیە خۆشترین جێگەیان هەڵبژاردووە، لێی دابەزیوون. لە گەڕەکێك ناوی تاش مغازەلەوبووەو ئەمە هەر لە بۆیاخچی‌یەوە تا گەوهەرفرۆشیان بەدەست ئەرمەنیەکانەوە بووەو چاکترین جێگەبووە بۆ کات بەسەربردن. (*)

لەم کاتەدا ئیبراهیم بەگی مولحەقی عەسکەریی تورك لەم میوانخانەیە دەبێ وەکیلی ناردووە بۆ لایان وتویەتی لەبەر دوژمنایەتی کۆمیتەی تاشناقو ئەرمەنی لەگەڵ تورك باش نیە لەوێ بمێننەوە. لەسەر ئارەزووی ئەو دەگوێزنەوە شابەندەرخانەی تورك، خۆشیان هەستیانکردووە ئەرمەنیەکان بە گومانەوە سەیریاندەکەنو چاودێرییان دەکەن. بەڵام پاش دوو رۆژ بێزاربوون لە رەسمو قەیدی شابەندەرخانە.. لەبەر ئەوە خۆیو فەتاح ئەفەندی گەڕاونەتەوە ئوتێلەکەو لەوێ ماونەتەوە.

لە شابەندەرخانەکە سەر شابەندەری روسیی بۆلشەویکەکان سەریان لێدەدات و زیافەتێکی نایابیان بۆ دەکات لەگەڵ سەرجەم فەرمانگەکەو ژنەکانیشیان، ئینجا باوکم باسی ئەو شەوە دەکات، چییان بینیوەو کردووە دەڵێ: ژنەکان بوونەتە هاودەمی میوانەکانو ژنی سەر شابەندەر خۆی بۆتە هاودەمی رەفیق حیلمی، بەڵام نەك هەر ئاگای لەوبوویێت بەتەنیا بەڵکو لەوانی تریش بە جوانیو ناسکیو بەئەدەبیشەوە لەگەڵ هەمووانو لەگەڵ ئەویشدا هەڵسوکەوتی کردووە سەرقاڵی ئەوە بووە شەرابو قۆدگایان

---

(*) بۆ درێژەی باسی ئەرمەنیو ئێرەو کۆمەڵەکەیان بڕوانە ل ٩٤-٩٥ی یاداشت بەرگی( ٧).

دەرخوارد بدات. بەڵکو لەهۆش بچن تا بزانن ئەمانە کێن‌و بۆچی لەوێن .. رەفیق حیلمی باس لەوە دەکات کەخۆی بەزۆر گرتووە تا هیچ نەدرکێنێت وسەر شابەندەریش هێندەی خواردۆتەوە ئاگای لە خۆی نەماوە وەك منداڵ قسەیکردووە، لە ئەحمەد تەقی بەولاوە کە نەیخواردۆتەوە هیچ کەسێك هۆشی لەلای خۆی نەماوە. بۆیە جار جار بە کوردی پلاری گرتۆتە رەفیق حیلمی کە بینیویەتی ئەو ژنە جوانە خزمەتی دەکات. ئینجا لەسەر شەرەفی لینین سەر شابەندەر کەوتۆتە پێك بەیەکدادان دواتر لەسەر شەرەفی کەمال ئەتاتورك‌و بۆ رواڵەتیش لەسەر شەرەفی شێخ مەحمودو کوردەکانیش ئیتر ئاوێزەکان دەکوژێنەوەو سەر شابەندەر بە هەڵی دەزانێ دوایانبخات. رەفیق حیلمی پەست دەبێت ژنی سەر شابەندەر دەیبات بە شابەندەرخانەکەدا دەیگێڕێ لەگەڵ سکرتێرەکەیدا باوکم باسی شابەندەرخانەکە دەکات(*) ئەمانە هەموو تا بەردەرگا ئەم هەیئەتە بەرێدەخەن. سکرتێر کە ئێرانی دەبێت بە رەفیق حیلمی دەڵێ سبەینێ تۆ بۆ قاوەڵتی بە تەنیا میوانی سەر شابەندەری، باوکم ناچێت بەڵام سکرتێرەکە دوایی قەناعەتی پێ دەهێنێ بیباتە ماڵی خۆی، لەوێ بەدووروودرێژیی باسی کوردو کوردستان دەکەن واتە سکرتێر ویستویەتی بڵێ روس لەگەڵ مافی کوردن بەڵام باوکم باوەڕی پێ نەکردووە ئەوان بیر لە ئازادی کورد بکەنەوە. تا تورك لەبەر ئینگلیز پشتی تێ نەکردوون، بیریان لە کورد نەکردۆتەوە ئەویش بە مەرجێك بەرهەڵستیی بێ بەرامبەر بە ئینگلیزو کەڵکی هەبێ بۆ سیاسەتی تورکەکان.

<u>رۆشتن بەرەو ئەستەمبوڵ</u> : بڕیار بووە لە تەورێزەوە بە قەفقاسداو لە زەریای رەشەوە بۆ ئەستەمبووڵ بڕۆن. ئەریوانی ئەرمەنی‌و حکومەتی تەفلیسی گۆرجستان لەسەر رێیان بووە، ئەمانە لە ژێر چاودێریی روسیادا بوون‌و پێویستیان بە ڤیزەی روسیا بووە. لە تەورێز چاوەڕێی ئەو ڤیزەیەیان کردووە کە لە مۆسکۆوە بۆیان بنێرن، بۆیە چەند رۆژی تر لە تەورێز دەمێننەوە. بە خۆشی رایانبواردووەو گەڕاون بە شارەکەدا. رەفیق حیلمی لەگەڵ مەحمود ئاغای خاڵی دەچێ بۆ خواردنی چلەو کەبابی ئێرانی لە (کاتلیس) شفتە بێزار دەبێ، ئینجا چۆنیەتی دروستکردنی چلەو کەبابیش باسدەکات...

---

(*) ل ٩٧ یاداشتی ٧

له تەورێز جل‌وبەرگی باش دروستدەکەن، سەرو قەڵپاخی پێستو جل‌و پێڵاوی باش دەکڕن و نەورۆزی تەورێز دەبینن‌و وەسفی ئەوەیش دەکات‌و دەچێتە سەرای حکومەت‌و مەراسیمی رەسمی عەسکەریی دەبینێت.

ئینجا باسی بارودۆخی جەنگ‌و هەژاری لاوان دەکات کە بۆتە هۆی خراپەو ئیشی ناڕەوا. جارێکی تریش لە ماڵی سەر شابەندەری روس زیافەتیان دەکەن‌و سەر شابەندەری تورکیش بەهەمان شێوە. هونەرمەندەکانیشیان میوانداریياندەکەن بۆ شانۆیی کە بۆ قوتابیان پارەیان کۆکردۆتەوە وەسفی ئەوەیش بە درێژی دەکات کە لەوێش دیسان گریاوە بۆ کوردی بێکەس لە حەماسی ئەرمەنییەکان. دواشەو لەسەر حسابی خاوەنی ئۆتێلەکە زیافەت دەکرێن.

وەڵامی مۆسکۆ دێتەوە. سەعاتێك دوای نیوە شەوی (٣٠)ی مارتی ١٩٢٢ شابەندەرخانەی روس بە ئۆتۆمبیلی خۆیان رەوانەیان دەکەن، بەیانی میان دواب بەجێ دەهێڵن. فێنکیی بەهارو هەشت کەس سێ کوردو دوو تورك‌و سێ رووس بەشەقامە گەورەکەی نێوان تەورێزو جولفادا دەڕۆن.

<u>شاری جولفا</u> : ئەم شارە دەکەوێتە سەر سنووری نێوان ئێران‌و ئەرمینیای روس لەسەر رۆخی (ئاراس) کە پێی دەڵێن ئاراسی خوێناوی. لێرەدا رەفیق حیلمی شەڕی تورك‌و ئەرمەنی بیردەکەوێتەوە و دەموچاوی بەو ئاوە دەشوات. پاش پەڕینەوە بەو بەری ئاوەکەوە دەچنە جولفای روس، سنووری حوکمی روسیای شورەوی، زابتی رووسەکان سەیری شتەکانیان دەکەن‌و جانتای لۆككراو دەبینن مشت‌ومڕی ئەوەیاندەبێت بیکەنەوە، ئەمان ناهێڵن.

چەند تورکێکی ئێرانی هاوڕێی ئەو روسانەی لە گەڵیانن زیافەتیان دەکەن ئەمانە دەکەونە گۆرانی‌و زەماوەندو چەپڵە ڕێزان‌و هەڵپەڕکێ.

رەفیق حیلمی باسی بێ نرخیی پارەی روس دەکات،کە بۆیاخکردنی جووتێ پێڵاو چەند هەزار رۆبڵەو گوایە ئەوان بەو رۆبلانەی پێیان بووە بە ملیۆنێر دانراون هەروەها دەڵێ (٢٥٠ هەزار) رۆبڵی بیرچووە خەرجی بکات لە پاڵتۆکەیدا ماوە، (ئەمە راستە

بۆخۆم ئەم رۆبلانەم بینیوە بەلام بەداخەوە نازانم کەوتنە کوێوە (*) لە ناو شتومەكو کاغەزونامەکانیدا ون بوونو نەم دۆزینەوە) ئەو روسانەی لە گەڵیان بوون تا ئەوان سواری شەمەندۆفێر بوون لەگەڵیاندابوونو دواتر گەڕاونەتەوە بۆ تەورێز.

باوکمو هاوڕێکانی ئەو بەیانییە بە سواری شەمەندۆفێر لە (نەخچەوانا)وە تێدەپەڕن، نزیك قاوەڵتی دەگەنە ئیستگەی شاری ئەریوان پایتەختی حکومەتی شورەویی ئەرمەنی. ماوەیان نەبووە ئەم شارە ببینن لە چێشتخانەیەکی ئیستگەکە نانەخۆن لەبەر پاڕانەوەی هەژاری ئەرمەنی نازانن چۆن نانەکە دەخۆن دیسان لەڕێگە لە ئیستگەی (گومری) ئەحمەد تەقیو فەوزیو رەمزی بەگ-یان لێ جیا دەبنەوە. واتە دەمێننەوە رەفیق حیلمیو فەتاح ئەفەندیو مەحمودی کوڕی خالی رەفیق حیلمی. ئەوان دەچنە ئەوبەشەی شەمەندۆفێرەکەوە کەدەچێ بۆ ( صاری قامیش)لە سنووری تورکیا. ئەحمەد تەقی بۆ مەسەلەی سمکۆ دەچێتە لای ( عەلی سەعید) سەرداری لەشکرەکانی خۆرهەلاتی تورکو بڕیارە لە (گرابزون) بە رەفیق حیلمیوهاوڕێکانی بگەنەوەو بچنە ئەنقەرە.

هەر ئەو رۆژە (١١,٥)ی نیوەڕۆ دوای کەوتنەڕێ لە (جولفا)وە بە سێ رۆژ رۆشتن نیوەشەو دەگەنە تفلیس.

<u>تەفلیس</u> : پایتەختی گورجستانەو لە شارە گەورەکانی هەرێمی قەفقاسە، نیشانەی ئاوەدانیو شارستانیەتی وەك ئەوروپاییەوە دیاربووە لە ئیستگە دادەبەزن خاوەنی (ئۆتێل گراند) لە تەورێز کارتی داونەتێ کە لە هەرێمی گالاوێنکی لە (ئۆرێنت ئۆتێل) دابەزن. باسی شاری گەورەو پیاوی خراپو وەسفی جوانیی ئۆتێلەکە دەکاتو باسی خراپیی دوو غولامی بەر دەرگا کە بەسەرخۆشیی شەڕیانکردووەو دەرگاکەیان نەکردۆتەوەو (مەحمود)لە ورچی سەر قالدرمەکان ترساوە وایزانیوە ڕاستیە پاش حەسانەوە باوکم دەچێتە دەرێ بەو نیوەشەوە کەس بە شەقامەوە نابێت. برسی دەبێت هەر چەند جەژنی جۆرجی دەبێتو خەڵکەکە لە ئاهەنگ دەگەڕێنەوە. باسی شارستانیەتو پێشکەوتنی شارەکەو پاکوخاوێنیو بینای گەورەو باخچەو جێی یاری

---

منداڵان‌و هەیکەلی زۆرو ئەو پۆلیسە دەکات کە هاوار دەکات (دۆست) ئەویش وەڵام دەداتەوە (نەوارش) ئەمەشی لە هاوڕێیەکی کۆنییەوە بیستووە، کابرا دەکەوێتە قسەکردن بە جۆرجی‌و دەزانێ زمانەکە دەزانێ.

لە دوکانێکدا مریشکی سوورەوەکراو و هێلکەو پەنیرو شەراب دەکڕێ بە (٧٥٠فلس دەیخاتە گیرفانی پاڵتۆکەیەوە. لە میوانخانەکە تێروپڕ دەخوات‌و لە جێگەیەکی شل‌و نەرم‌و پاکدا دەنوێت.

بەیانی لە سەفارەتی تورکیاوە زابتێك دێت‌و دەیانباتە سەفارەت بۆلای مولحەقی عەسکەریی بیکباشی ئەرکانی حەرب (محەمەد بەگ) بەر چاییان دەداتێ‌و نیوەڕۆش قاوەڵتیان بۆ دەکات. دەیانەوێ بچنە سەفارەتخانە . پاش شەوێکی تر لە ئۆریانت دەچنە میوانخانەی (شەیتان بازاڕ) کە ئوتێلێکی میللی هەمەجۆرو زمانە جیاکانە وەك ئۆتێلی حەیدەرخانەو بازاڕەکەشی وەك شۆریجەیە لەگەڵ خاوەنەکەی (محەمەد ئەفەندی ڕێزەلی) خۆش رادەبوێرن، حەسانەوەو خواردەمەنی لەم ئوتێلە زۆرو هەرزانەو لەوێ بە (٢) تارانیی توورێکی سووری عەجایەب دەخۆن .

تفلیس نیشتمانی ستالینە، نەوتی لێیە [*] باوکم باسی تفلیس‌و قەفقاسی کۆن‌و حکایەتی جنۆکەدەکات لەم ناوەوباسی کێوی قاف‌و دێوی سپی‌و سەددی یاجوج‌و ماجوج کەلە ئاسنکراوە لەدژی وەحشی مەغۆل‌و هێرشیان بۆ سەر کێوی قاف.

هەروەها نوسیویەتی لەقەفقاس (٣٠) میللەت دەژین...

<u>**باتوم:**</u> (٨) رۆژ لە تفلیس دەمێننەوە ئینجا بە شەمەندۆفێر بەرەو باتوم دەڕۆن کە لە جۆرجیایە. لەسەر زەریای ڕەش کە نێوان تفلیس‌و باتوم (٢٤) سەعات بە ئیستگەی (گۆنالیس) دا تێ دەپەڕن، ئێوارە دەگەنە باتوم، لە ئۆتێل (بولڤار)ی ئاغا (پێترۆس) دادەبەزن. شەقامەکانی وەك تفلیسە بەڵام لەخانووی بەرزدانا سەردەمێ لەشارە گەورەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە و جێنشینی وەلی عەهد بوو دوایی بوو بە موڵکی رووسەکان و بووبە یەکێك لە سێ‌کۆمارەکەی قەفقاس.

---

[*] بڕواننە چۆن تەنانەت جوگرافیا‌و مێژوو وئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و خواردن‌و کردن‌و شارستانێتی گشت شارێکی زانیووە‌و باسیان دەکات.

باوکم لەوێ ئێواران چۆتە باخچەیەکی گشتی گەورە بۆ گوێگرتن لە مۆسیقا. باسی گرژی پیاویان و جوانی و هێمنی ژنیان دەکات و باسی حەمامی گشتی ژوور بە ژوورو زۆرشتی تردەکات...

لە (باتوم)ەوە بۆ ئەستەمبوڵ بە پاپۆر بە زەریای ڕەشدا دەڕۆن واتە لە خاکی رووسەوە بۆ تورکیا. بۆیە پاسپۆرتی تازەیان پێویست بووە. لەم پاسپۆرتەدا ناوی خواستراو بەکارهاتووە لە جیاتی رەفیق حیلمی (عەلی فایەق بەگ)و لەجیاتی مەحمود (حەسەن ئەفەندی) لە پاسپۆرتەکان نووسراوە مێژووی (٥)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٢و ژمارە (٣٥)ی لەسەرە بە هەفتەیەك ئەمەکراوە ئێوارەی (١٥)ی نیسانی ١٩٢٢ سواری پاپۆری (شیفیلد) دەبن.لەقەمارەی پلەی یەکەم دانیشتوون خواردنیشی لەسەر یەك سفرەو لە جیاتی ئاو شەراب بووە. پارەی ئینگلیزی هەر قەفتان–ەکە ئینگلیز بووە ئەوەکانی ترلەسەر یۆنان بوون نیوەشەو باوکم تووشی ئازاری سەر دەبێت و دەرشێتەوە کەس لە کابینەکە نابێ ئینجا دەزانێ پاپۆڕەکە خەریك بووە نوقم بێت وئەو ئاگای لە خۆی نەبووە. چوار سەعات لە مەترسیدابوون.

ئێوارەی رۆژی چوارەم دەگەنە (قەواق) ئەسکەلەی ئەستەمبوول لە دەمی گەرووی دەریای رەشدا گرمەی تۆپی رەمەزان دەبیسترێت .

ئەستەمبوڵ

خەلیفەی ئەستەمبوڵ هەر حوکمی ئاینیی بە دەستەوە ماوە لە ژێر چاودێریی سوێندخۆراندا بووە . ئەو شەوە تا بەیانی نەیانهێشتووە بچنە ئەستەمبوڵ بە تاریکیی لەسەر پاپۆڕەکە ماونەتەوە. باوکم ئەو دەفتەرەی تا ئەو رۆژە باسی سەفەرەکەیانی تیا نووسیوەتەوە دڕیویەتی. دیارە ترساوە گومانیان لێبکەن، بەیانی زوو دێن بۆ پشکنینی شتومەکیان و بۆپرسیار دەیانەوێ جانتای لۆککراوی ئەوکاغەزانەیان بکەنەوە ئەمان دەتوانن قەناعەتیان پێ بکەن تاوازیان لێ بهێنن.

لە قەواقەوە بۆ ئەستەمبوڵ هێندەی رێگەی کازمیەی بەغدا دوورە .

لە سەعات (٩,٥) بەیانی بە پاپۆڕەکە دەگەنە ئەستەمبوڵ نزیك قاوەڵتی لە (سرکەچی) دەچنە میوانخانەی (مەسەرەت) لە بەر فەرەسیەکان جێ نابێت دەچنە (عوسمانلی ئۆتێل).

باوكم زۆر پەرۆش دەبێ بچێت ئەو جێگایانە ببینێت كە كاتی خوێندنی لە ئەستەمبوڵ بینیونی. هەر ئەو رۆژە تا ئێوارە هەرچی بتوانێ دەیبینێت.(*) راستەوخۆ بۆ ئەو جێگەیە دەڕوات كە بۆ یەكەمجار تیایدا میوان بووە، نزیك بە سركەچی پێیان وتوە (تەختە قەڵا) وەكو (شەیتان بازاڕ)ی تفلیس بووە. ئەو كاتە لەوێ هەفتەیەك ماوەتەوە ئەمجارە ئیتر ئەو كاتەی بیر كەوتۆتەوە، باسی منداڵی و غەریبی زۆركاری لێكردووە، بە سواری وڵاخ و عارەبانە لە (سلێمانی)ەوە تا (حەڵەب) و لەوێوە بە شەمەندۆفێر تا (بەیروت)و بە پاپۆڕ لە زەریای سپی ناوەڕاستەوە بۆ ئەستەمبووڵ لە وڵات ئێجگار دوور بووە بەراوردی ئەم سەفەرانە دەكات لەگەڵ سەفەرەكەی ئێستایدا كە بە دوو رۆژ دەگەنە نیویورك بە فڕۆكە.

ئەو كاتە بە وڵاخ بەسێ رۆژ دەگەشتنە كەركوك و دە رۆژ یان هەفتەیەك دەگەیشتنە بەغدا رەفیق حیلمی دەڵێ لوت و لێویان چەور دەكرد چونكە توێكڵی هەڵدابوو پەنا ڕانیان ئازاری هەبوو هەروەها باسی یەكەم سەفەری دەكات كە(٧) رۆژ بە كەرو وڵاخ لە رێی موسڵەوەو سیانزە رۆژ بە بریچقە بە رێی حەڵەبەوەو دوو رۆژ بەشەمەندۆفێر بەرێی بەیروت و (٧) رۆژ بە پاپۆڕ بەرێی ئەستەمبوڵەوە بووە واتە لە سلێمانی‌یەوە بەدوومانگ گەیشتۆتە ئەستەمبووڵ كە چاوەڕوانی هۆیەكانی گواستنەوەی كردووە لەهەر شوێنێ لەم شوێنانە بۆیە ماتەمینی گرتویەتی كە گەیشتووە. چۆتە بازاڕ لە كتێب فرۆشێكی گەڕۆك چەند كتێبێكی توركی كڕیوە یەكێكیان ( دۆن كیشۆت) بووە دوای ئیش‌وكار

---

(*) بۆیە لەو سەفەرەدا كە لەگەڵ باوكم و دایكما بۆ لوبنان- بەیروت كردمان پاش چەند ساڵ لەدەرچوونم لە جونێر كۆلێج، لەوێ باوكم لە (بێت مەری) كە لێی ئەژیایین ئەو هاوینە، هەر دوومین رۆژ بردمی لەگەڵ خۆی بۆ ئەو كۆلیج و زانكۆو هەرچی ئەو جێگایانەی كە كاتی خوێندنم لەوێ بە گەنجێتیم بینیومن، هات لە گەڵم و دەفتەرێكی بە دەستەوە بوو چی ببینیایە تیایدا ئەینووسیەوە. هاروەها كە سەركەوتمە سەر ئەو فڕۆكەیەی یەكەم جار سواری بووم بۆ دەرەوە بۆ خوێندن دەفتەرێكی بچووك و قەڵەمێكی دایە دەستم وتی هەر لە ئێستاوە چی دەبینیت چی دەبێت بینووسەرەوە دوایی سوودی لێدەبینیت. هەر چەند سەفەرتكرد بیرت نەچێ یاداشتەكانت بنووسە منیش بەو ئامۆژگارییە بە نرخەی ئەومكرد ئێستا دوو سندوقی گەورە دەفتەری رۆژنامەم هەیە چاوەڕێم ئەم كتێبەی باوكم چاپبكرێت لەهەڵێكدا ئەوانیش بنووسمەوە. یەك دوو ساڵ جاروبار لە گۆڤاری رەنگین بە وێنەی رەنگاورەنگەوە باسی هەندێ لەو سەفەرو سەیرانانەم كردووە. وا بزانم ئەوانەی خوێندویانەتەوە بڕوایان نەدەكرد ئەمە ڕاست بێت من ئەمانەم بینیبێ، تا یەك دوو وێنەی خۆمم لەگەڵ باسی وەك دورگەكانی (هەوایی)و چاوگە گەرمەكانی (پەلۆستۆن پارك) و ئەم جێگە سەیرانەم بڵاوكردەوە.

خوێندویەتیەوە وتویە تا ئەو ڕۆژە چیرۆکی وا سەیرو خۆشو ئەنتیکەی نەخوێندۆتەوە. جاری وا هەبووە لە تریقەی پێکەنینی خۆی پێکەنیوە بە خۆی ، دوایی تێکەڵ بە عالەمی ئەو ڕۆژەی ئەستەموول بووە.[*]

تێکەڵ بوونی بەلاوە نیشتمانپەروەرەکانی کوردی تورکیا بەهۆی نەجمەدین —ی برای (ئەسیری)ی کە وتویەتی لە هەموو لایەك باسی کوردایەتی کردووەو لاوانی وریاکردۆتەوەو بلیمەت بووە. بە هۆی ئەمەوە گەڵێ کوردی ناسیووە کە بە خوێن پاكو جێی باوەڕ ناسراون، وتویەتی کە لاوی سلێمانی وەکو دیاربەکر،خارپوت، ئەرزروم،تفلیس دیار نەبوون. پاش ئەمە کە خوێندنی تەواو کردووەو گەڕاوەتەوە سلێمانی وتویەتی ئیتر وازم لە شیعری غەزەل هێناوەو کەوتۆتە نووسینی شیعری نیشتمانییو خەباتی سیاسی .

دیسان باسی گەڕانی دەکات بە جێگە کۆنانی سەردەمی خوێندنیدا وەك (تەختە قەڵا)، (چەنبەر لی تاش) و (گەدك پاشا) و لەوێ (ئەپارتمانی) ( هاجی بەگ) لێرە دوای داخرانی کۆلیجەکەیان لەگەڵ یەك دوو هاوڕێی عیراقیی کاتیان بەسەربردووە. چۆتە وەزارەتی حەربیەی پێشوو (فاتح،ئایا سۆفیا،بابی عالی،سوڵتان ئەحمەد،غەلەتە،خواجە پاشا،بەی ئۆغلو،تەقسیم) بە سواری پاپۆڕ بۆ (قادی کۆی ، یلدز) سەرای مێژوویی (سوڵتان عەبدولحەمید) تا ئێوارە گەڕاوەو لە دوو لا وەستاوەو بە بیری کۆن دیسان فرمێسکی ڕشتووە (ئەپارتمانی هاجی بەگ)و[*]قیرائەتخانەکەی (جەنبەر لی تاش)

---

[*] بڕوانە باسی تێکەڵ بوونی بە لاوەکانی ئەندامی هێڤی لە تورکیاو هەستی نیشتمانپەروەری لە دیوانی پاش تەموززیو لەم یاداشتەدا ل ١٢٠ و لەو بابەتانەی خۆم لەسەرم نووسیوە لە سەرچاوەکاندا .

[*] تێبینی: تا ئەم کاتە ئێمە هیچ باسێکی کۆنی ڕەفیق حیلمی-مان نەخوێندۆتەوە (کاتی چوونی بۆ ئەستەموول بۆ یەکەم جار بۆ خوێندن) ئایا چۆنو کەی ڕۆیشتووە ئەو کاتە باوکی ماوە، براکەی لە کوێ بووەو چۆن لە ئەستەموول ژیاوە؟ چی کردووە؟ هەرباشە کەبەهۆی ئەم سەفەرەی سەردەمی شێخ مەحمودەوە وەك نوێنەری ئەو بۆ لای مستەفا کەمالو گەورە تورکەکان هیچ نەبێ باسێکی ئەو سەردەمەی منداڵیی کردووە باسی تەنهایی، غەریبی، دووری لە نیشتمانو لە کەسوکاری و چۆن باوکی ئەو کاتە ویستویەتی لە حەربییە بخوێنێت، بەڵام ئەوە ڕێك نەکەوتووە بۆیە چووە بۆ هەندەسەی عالی و ئایا باوکی تا ئەو کاتە ماوە نازانینو باسی شەفیقی برای کردووە کە ئەو بۆتە پیاوی ماڵ کاتێ باوکی لە بانەو لە دەرەوە بووەو ڕەفیق حیلمی لە ئەستەموول بووە، هەروەها چۆن شەفیق کراوە بە بەڕێوەبەری ئەعدادی مولکی ئینجا چۆن بۆتە زابتی تۆپچی لە تورکیاو لەوێ کوژراوە، ئەمانەی هیچ باس نەکردووە. هەر تا لە

ئەپارتمانەکە کراوە بە جێگەی پاککردنەوەی جلوبەرگ ، خێزانی هاجی چونەتەوە یۆنان. ئێوارە فەتاح ئەفەندی بێ ئۆقرە چاوەڕێی کردووە باوکم چۆتە لای (محێدین پاشا)و پێی وتووە دەبێ هەر ئێستا بچن بۆ ئەنقەرە ئەم پیاوە یەکێك لە ژەنەڕاڵەکانی مستەفا کەمال بوو حاکمی ئەستەمووڵ بوو. ئەمری کردووە قەمارەیەکیان لەسەر پاپۆڕی کۆمپانیای خەیرییە بۆ (ئەزمیر) بۆ تەرخان بکات. باوکم زۆری پێ ناخۆش بووە وا زوو ئەستەمووڵ جێگەی یادگاری منداڵیی و لاویەتی بەجێ بهێڵێت. دیسانەوە چۆتەوە دەرێ و بۆ سرکەچی بۆ چاپخانەی بەغدا لەوێ (جەمیل عەلی) ئەفەندی یوزباشی سوپای تورك (برای ئیسماعیل حەقی شاوەیس ) باوکی (نوری شاوەیس) دەبینێت، کە ئەم جەمیل–ەلە لاپەڕەی نیشتمانپەروەریدا ناوێکی بەرزو ناسراوی هەبووە. باسی ئازایی ئەم پیاوە دەکات کە تۆپچی بووە لەو سوپایەدا کە نێردراوەتە سەر شێخ عەبدولسەلام بارزانی بەڵام یاخی بووەو تۆپەکانی تێنەگرتوون بۆیە حوکمدراوە بە ئیعدام بەڵام لەبەر هەندێك هۆ بەریانداوە. ئەو شەوە رەفیق حیلمی لە ئەستەمووڵ لە گەڵ ئەم پیاوە پێکەوە چونەتە ئۆرزدیباك، لەوێ رەفیق حیلمی دەستێ جلی هاوینەو پێڵاوو بۆینباغ دەکرێت لەگەڵ دوو باستۆن. نیوەشەو لە جەمیل ئەفەندی جیا دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ میوانخانەکە.

**ئوزمید**

بەیانی زوو ئینزیباتێکی تورك باوکم و هاوڕێکەی دەبات بۆ سەر پاپۆڕەکە دوای ٥سەعات دەگەنە زەریای مەرمەرە نزیك نیوەڕۆ دەگەنە شارە بچوکەکەی (ئیزمیت – ئوزمید) قائمقامەکەی لە میوانخانەی بەلەدیە میوانداریی کردبوون،چونکە هاوڕێی فەتاح ئەفەندی بووە. لەوێ باوکم دەچێتە دەرەوە ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە گۆڕستان ئەبێ کاتێ سەیری کێلەکان دەکات لەپڕ تورکێکی بالأبەرز بەناوی خۆیەوە بانگی دەکات و دەڵێ قائیمقام چاوەڕێی دەکات بۆ قاوەڵتی لە نادی . (نورەدین پاشا) قائیدی ئۆردووی یەکەم بۆ شەوێ لە نادی زابتان زیافەتیان بۆ دەکات. هەر لەوێ چاوی بە (ئەحمەد

---

پێنجی ئەعدادی بووە؟ بەمە ئومێد ئەکەم هیچ نەبێ بتوانین ئەڵقەیەك لە زنجیرە پچڕپچڕەکەی ژیانی پێکەوە بنێین .

فەخری)[*] کە دەکەوێ کچەزای حاجی سلێمان ئاغایە ئەمەیش یەکێك لەو قوتابیانە بووە کە لە روشدییەی عەسکەریی سلێمانیی خوێندویەتی ئەو کاتەی کەباوکیشم لەوێ بووە. هەر ئەو شەوە لەگەڵ فەتاح ئەفەندی دەچنە ئیستگە، ئەحمەد فخری بەڕێیان دەکات، تاسواری شەمەندۆفێردەبن و بە ئیستگەکانی (ئەسکی شەهر)و (پۆلا دلی)دا دەچنە ئەنقەرە.

## ئەنقەرە پایتەختی تازەی تورك

هەفتەی چوارەمی نیسان دەگەنە ئەنقەرە،کە دەیبینێ سەری سوڕ دەمێنێ وادەزانێ لە گشت شارەکانی تر جوانترو باشترە کەچی باسی لاوازیی حاڵ و ئەحواڵی دەکات؟ من ئەستەمووڵ و زۆر لە شارەکانی تری تورکیام بینیووە بە داخەوە کە باوکیشم لە ئەنقەرە پێش کۆچی دوایی پاش ١٤ی تەمموز کرا بە مولحەقی رۆشنبیریی لەوێ زۆر ئارەزووی کرد بچین بۆ لای، هەر دایکمی بردبوو لەگەڵ خۆی، رێکنەکەوت ئێمە بچین. بۆیە نەمدەزانی بەو شێوەیە بووە کەباوکم بینیویەتی.

رەفیق حیلمی بەمشێوەیە باسی ئەو شارە دەکات کاتێ چووە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مستەفا کەمال بە نوێنەرایەتی شێخ مەحمود بۆ دامەزرانی حکومەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد لە عیراقدا وتوویەتی" گەرما ،جموجوڵ (نشاط) جووڵە ،هاتوچۆ نەبووە، نیشانەی (ئینقلاب) گۆڕان هیچ دیار نەبووە، شار کش ومات، نەخەڵك نە هۆی گواستنەوە، عارەبانە ،ئۆتۆمبێل، پۆلیسی سەرجادە بەدەرەوە نەبوون. خەلیفە لە ئەستەمووڵ دانیشتووە ئێرە لە ناوچەی حکومەت نەچووە، مستەفا کەمال و وەزارەت لێرە بوون. هیچ دیاردەی شارستانییەتی تێدانەبووە، نەیزانیوە بچێتە کوێ و لە کوێ کات بەسەربەرێت. پاش نیوەڕۆی ٢٥ نیسان ١٩٢٢ گەیشتونەتە میوانخانەیەکی بچوکی بێ ئەهمیەت گوایە ئەمە لەهەرە باشەکانیش بووە، لە گەراجی بەغدا چووە نە پانکە نە سندوقی بەفر نە تەلەفۆن، تەنانەت جێگەیەکی بۆ ئاو بەخۆدا کردنیش تێدا نەبووە. [*]ئێوارە تۆفیق بەگ

---

[*] وا بزانم ئەمە باوکی نەسرین فخریە چونکە دیومەو باسی کردووە کە لەگەڵ باوکم و مامە شەفیق لە روشدییەی عەسکەریی بوون.

[*] ل ١٢٣-١٢٥ یاداشتی حەوت بۆ درێژەی ئەم باسەی ئەنقەرە

یاوەری رەئیسی وزەرا دەچێتە لایان بەناوی رەئیسی وزەرا (حسێن رەئووف بەگ)ەوە بەخێر هاتنیان دەکاتو بڕیار بووە سبەینێ یاوەرەکە بچێتەوە بەشوێنیاندا تا بچن بۆ لای رەئیسی وزەرا لە دائیرەی ریئاسەت. شێخ مەحمود فەروەیەکی زۆر نایابو هەندێ دیاریی بۆ ئەم پیاوە بەوەفدەکەدا ناردووە. ئەمە بە یاوەرەکەدا دەنێرن بۆی ئێوارە لە لۆقەنتە خانەیەك چاکترین خواردنی (مومبار) دەبینن بەڵام ئیشی هەویری نایابی کەم بەڵام پاك دەخۆنو زۆر هەرزانیش دەبێ. ئینجا باسی ئەوچایخانەیە دەکات کەئێوارە چووە چای لێ بخواتەوە (*) سەرت سوڕ دەمێنێ چۆن ئەمە لە پایتەختی مستەفا کەمال داهەبووە.

## چونەلای سەرۆك وەزیرانی تورکیا

بەیانی ٢٨ی نیسانی ١٩٢٢ تۆفیق بەگ دەیانبات بۆ وەزارەتی دەرەوە، سەبارەت بەمەیش دەڵێ هەر لە دائیرەیەکی مودیریەتی خۆمان چووەو کەمتریش،کەچی ئەمە جێی رەئیسی وزەرای تورکیا بووە. عیسمەت پاشا وەزیری دەرەوە لە لۆزان بووە محێدین بەگ-ی ئەرکانی حەرب چاوەڕێی رەفیق حیلمیو فەتاح ئەفەندی کردووە. ئەم پیاوە کەوتۆتە قسەکردنو زۆر دەمی لە دینەوە داوە وایزانیوە کورد موسڵمانی ساویلکەو کەم عەقڵو تەفرە خۆرن. گوایە شێخ غەزای ئینگلیز بکات دژی گاورو تورك ئەوا تورکو کورد بران لە ژێر باڵی حکومەتی خاوەن عەدالەتی مستەفا کەمال دا ئەحەسێنەوە.

رەفیق حیلمی لەمە پەست بووەو (*) ویستویەتی بڵێ سنووری ئەنقەرە جیاوازە لە سنوری رواندز ئەوەی رواندز منالٚ هەڵخەڵەتێنەیە. لە ئەنقەرە ئەمە نیە و خۆی پێ

---

(*) ل ١٢٥ بۆ درێژەی باسی چایخانەکە .
رەفیق حیلمی باسی ئەو چایخانەیە دەکات لە ئەنقەرە.
ئەمە گوایە چایخانەی گەورەکان بووە وتویەتی تەسكو بچووك لە حەمامی ژنانی خۆمانی کردووە. (١٠دەقیقە) بەپێوە وەستاوە تا کورسیەکیان بۆ هێناوە بەزۆر خنیویەتیە نێوان کورسیەکانی تر کە بە تەنیشت یەکەوە ریز کراون. چایچی کە چاکەی هێناوە ناچار لەبەر بێ مێزیی باوکم پیاڵەکەی بە دەستەوە گرتووە. داوای پارەکەی کردووە لە پێشەوە ناچار پیاڵەکەی داوەتەوە دەستی تا بتوانێت دەست بکات بە گیرفانیا، تا ئەمەی کردووە چاکە سارد بۆتەوە بە هەناسە بڕکێ چۆتە دەرێ تەنگە نەفەس بووە تیایدا، چاکە بە (٥)قروش بووە.
(*) بڕوانە ل ١٢٧ یاداشت (٧)

ناگیرێت دەیەوێ ئاراستەی قسە بگۆڕێ محێدین بەگ رووی گرژ دەکاتو دەڵێ ئەچم بە رەئیسی وزەرا دەڵێم کە ئامادەن بیبینن. دەگەڕێتەوە دەڵێ فەرموون.. بەڵام زۆر تکات لێ ئەکەم نەزاکەتی وەزع بێتە بەر چاوت بە پێی ئەوە قسە بکە با رەئیس دڵی لێت کرمێ نەبێ، نابێ بە ئینگلیز تەفرە بخۆین لەناو خۆماندا لە رێی برایەتی لادەین. دەچنە ژووری رەئیسی وزەرا بە پێوە بووە چاوەڕێی کردوون. ئەمری کردووە دانیشن ئینجا خۆی دانیشتووە، بە گەرمیی بەخێرهاتنی کردوونو باسی سلێمانیو شێخی لێ پرسیون، وتویانە ئەوان ئەوە دوو مانگە لەوێ دوورنو بەرێوەن بۆیە ئەمان ئەیانەوێ هەواڵیان لەوانەوە بزانن.ئەویش دەڵێ دوای دەرچوونی ئێوە لە سلێمانی ، ئینگلیزەکان داوایان لە شێخ کردووە بچێتە بەغدا. لەگەڵ ئۆزدەمیردا لە رواندز بۆ خۆپاراستن تەرتیبی لەگەڵ کردووە. ئینگلیز سلێمانی بۆردومانکردووەو خۆی واتا رەئیسی وزەرا راستەوخۆ (عیصمەت پاشای) لە لۆزان ئاگادار کردۆتەوەو پێی وتووە لەلای (موئتەمەر) بە شیدەت لە ئینگلیزەکان (پروتۆستۆ) بکاو بڵێ ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە ئەنجامی موئتەمەر لە لایەن راگرتنی (ستاتۆکۆ) وە بڕیاری لەسەر دراوە. تا ئەنجامی موئتەمەر نەزانرێ ئیتر رەنگە جارێکی تر بۆردومانی سلێمانی نەکەن. رەفیق حیلمیو هەیئەت سوپاسی دەکەنو جانتا لۆکەکەی دەدەنێ وتویەتی شەو لەماڵەوە دەیخوێنێتەوە. ئینجا پێشکەشی دەکات بە (غازی پاشا) واتا مستەفا کەمالو ئێستا مەجلسی گەورەی میللی تەعتیلەو عیصمەت پاشا داوای موسڵ دەکات لە موئتەمەر لە لۆزان ئومێد وایە وەریبگرنەوە، ئەوکاتە کوردیش بە ئامانجی خۆیان ئەگەن لەگەڵ برای ئاینییان یەکئەگرنەوەو لە چنگی ئیستیعماری ئینگلیز دەرئەچنو شێخیش جگە لە سەوابی رۆژی قیامەت لە دونیاش بگا بە بەری غەزای قارەمانی خۆی ئێستا ناتوانین هیچ بڵێین.

رەفیق حیلمی تێدەگات کە ئەرکی سەرشانیان ئیتر تەواو تا تورك داوای شتێکیان لێ نەکات ئیتر دەبێ باسی مەسەلەی کورد نەکەن . دوای قاوەو جگەرەو گفتوگۆ، رەئیس هەڵدەستێتە سەرپێ بەڵام پێش دەست گوشین دەڵێت ئەمرۆ هەواڵی گەیشتنیان ئەدا بە ئۆزدەمیرو ئەویش دەیدات بە شێخو پێی رادەگەیەنێت زۆرمان پێ خۆش بووە بۆ ناردنتانو بڕیاری غەزای ئینگلیز بۆ رزگاریی کورد لە چنگیان، ئەم فیداکاریە ئەکاتو سەلامی حەزرەتی غازیو ئیحتراماتی خۆشی پێشکەش دەکات ئینجا روو دەکاتە

باوکم‌و دەڵێ تۆیش بە تایبەتی بۆ شێخ مەحمود بنووسە کە ئێمە چۆن بە هاتنتان‌و کردەوەی خودا پەسەندانەی شێخ بەرامبەر بە ئینگلیز خۆشنوود بووین‌و بەهەموو هێزێکمانەوە ئامادەین بۆ یارمەتی‌و سەرکەوتنی لە غەزاداو لە بیرمان ناچێتەوە کە لە سەرمانە ئەجری غەزاکەی بدەینەوە. وەڵامی لەسەر کۆبوونەوەی مەجلسی میللی‌و ئەنجامی لۆزان دەوەستێت.

ئینجا رەئووف بەگی رەئیسی وزەرای تورکیا دەستی باوکم‌و هاوڕێکانی دەگوشێ‌و داوای عەرەبانەیان بۆ دەکەن‌و دەچنەوە میوانخانەکەیان. باوکم سەبارەت بەمە دەڵێ سەری لە فەتاح سوڕ دەمێنێ کە چۆن لەم هەموو بگرەو بەردەو گفتوگۆیەدا کەماوەی دوو سەعاتی خایاند یەك قسەی نەکرد. بۆیە تا دوو سەعات ماتەم دەیگرێ‌و هیچ قسەی لەگەڵ ناکات ئەویش نەیویستووە بڵێت لە بیرو باوەڕیدا لەگەڵ من نییە. گوایە "فەتاح دوو ڕوو بووە لەپاش ملەی تورکەکان لە گەڵ من بوو لە پاش ملەی منیش لە گەڵ تورکەکان" بەڵام کە هەموو پێکەوە بوون قسەی بۆ رەفیق حیلمی‌و ئەوانی تر بەجێ هێشتووە. خۆی تێکەڵ بەقسە نەکردووە.

رەفیق حیلمی لە ئەنقەرە کەسی نەناسیووە چەند کەسێکی ناسیاوی فەتاح ئەفەندی نەبێت لە چەند زیافەتێکی تایبەتیدا هەندێ دۆستی باشی پەیدا کردووە. هەرە باشەکەیان (حاجی شکری بەگی مەبعوس)بوو کە کوردێکی تورکیابوو بەرامبەر بە فەرنسا شەڕی کردبوو لە شەڕی ئیستیقلالی تورکیادا بۆیە لە مستەفا کەمال نزیك بوو کردبووی بە مەبعوس (نوێنەر)لە مەجلیسی گەورەی میللەت. یەکەمجار ئەم پیاوە لە گەڵ یەك دوو مەبعوسی تری کوردا زیافەتی بۆ کردوون دوای ئەوە ئیتر لە باوکم نەبۆتەوە. زۆربەی ڕۆژ یا بۆ قاوەڵتی یان نانی ئێوارە بردویەتییەماڵی خۆیان، باسی رق‌و کینەی مستەفا کەماڵی کردووە لەم مەبعوسانەو لەناو چوونی یەکێکیان‌و ترسی ئەوانیترو باسی ئەوەشی کردووە کە گوایە سەرۆك وەزیران خۆی هەرە گرنگترین موخالفینی مستەفا کەمال بووە. دوایی کە رەفیق حیلمی گەڕاوەتەوە زانیویەتی ئەم دووانەی سەرەوەنێوانیان تێکچووە. حسێن رەئووف لایەنگری خەلیفەو ئینگلیز بووە بڕوانە ل ١٣٢-١٣٣ بۆ تەواوی ئەم باسە.

## چوونە لای غازی

باوکم پاش دوو رۆژ لە سەردانەکەی بۆ لای سەرۆك وەزیران یاوەری سەرۆك دەچێتە میوانخانەکە بۆ لای و پێی دەڵێ سبەینێ ئێوارە دەبێت بچنە (جان قایا) بۆ خزمەت غازی واتا مستەفا کەمال، سەرۆك وەزیران سەعات پێنجی پاشنیوەڕۆ لە دائیرەی ریئاسەت چاوەڕێتان دەکات لەوێوە دەتان بات بۆ لای غازی، رەفیق حیلمی دەڵێ" فەتاح لە خۆشییاندا نەیدەزانی چی بکات؟ بەلام ئەم بۆخۆی بڕیاری داوە نەچێت بیانوو بدۆزێتەوە دواتر لێکیداوەتەوە چاوپێکەوتنی پیاوێکی وا گەورەی وەك مستەفا کەمال کەم نەبووە! زانیویەتی لە ژیانی تاکێکدا ئەمجۆرە کاتانە کەم هەڵئەکەون و لاپەڕەیەکی مێژووی ژیانی داگیر ئەکات. لەبەر ئەوە ئەکەوێتە دنیای خەیالاتەوە.دەڵێت" خۆم لە دونیایەکی ترا ئەهاتە بەرچاو خەریکی ئامادە کردنبووم، قسەم لێکئەدایەوەو شتم بە بیرا ئەهات . چۆن بدوێم چۆن قسەی لەگەڵ بکەم ئەو چۆن قسەم لەگەڵ ئەکات؟ دیسان بڕیارم ئەدایەوە کە نەچم ئایا بە بیانووەکەم بڕوا ئەکەن؟ ئایا وا ئەکەن پەشیمان ببمەوە یاگوێم نادەنێ؟" تا سبەینێ نیوەڕۆ زۆر شتی لێکداوەتەوە هەرچەندی کردووە لەسەر بیرێك رانەوەستاوە بچێت یا نەچێت بەلام خودا ئەم کێشەیەی بە ئاسانی بۆ چارەسەرکردووە کاتێ هاتوون بیانبەنەلای، سەرۆك وەزیران ئینجا بۆلای غازی، رەفیق حیلمی نەخۆش بووەو مەلاریاو لەرزوتای بووە نەیتوانیووە لەگەڵیان بچێت.(*)

## سەرئەنجامی ئەم تەقەلایە

پاش چەند مانگێك لە هاتوچۆ بەو رێگەوبانە سەختەدا بەو باران و زوقم و بەفرو قوڕو چڵپاو و ئەو هەموو مەترسی و ماندویەتییەو رۆشتنە بەسواری کەرو ولاخ و بە پێی و بە بریچقەو پانتۆن و شەمەندۆفێرو ئۆتۆمبێل و پاپۆڕە هەر لە سلێمانییەوە بۆ رواندزو بۆ زینووی شێخ و دەربەندو لەوێوە بۆ ناو کوردستانی ئێران و ناو قەفقاسیاو ئەرمینیاو گورجستان، ئەو هەموو شارانەی باسیکردوون ئەو هەموو کارەسات و بەسەرهاتە کۆن و تازەیە،ئەو پیاوە هەرە گەورانەی تورك و روسیاش ئەوەتا تا سەرۆك وەزیرانیش

---

پێشوازیی لێکردوون و ئەو هەموو خزمەت و حورمەت و زیافەت و گەڕانە ئەو هەموو قسەو باس و گفتوگۆیە لەگەڵیاندا.

کە فەتاح ئەفەندی گەڕاوەتەوە لای مستەفا کەمال باوکم لێی پرسیووە غازی چی وتووە؟ ئەویش لەوەڵامدا وتوویەتی غازیی سەلامت لێ ئەکات و داوای چاکبوونەوەت بۆ ئەکات پێی ناخۆش بووە کە تۆی نەبینیووە،ئینجا پرسیویەتی ئەی گفتوگۆی چی کرد؟ فەتاح وتوویەتی هەر ئەوانەی دووبارە کردەوە کەسەرۆك وەزیران پێی وتین. جگە لەوەیش ئەمری کرد بەهۆی هێزەکەی ئۆزدەمیرەوە لە رواندز هەندێ دیاریی بۆ شێخ و چەند رەشاشێکی تازەی بۆ بنێرن و ئەمە هەموو سەرئەنجامی ئەم هەوڵەش بووە.

## رێگەی گەڕانەوە بۆ سلێمانی

مەسەلەی کۆبوونەوەی مەجلیس یەکەم هەنجەتی تورك بووکە لە ئەمڕۆ و سبەینێدا نەبوو کۆنگرەی لۆزان-یش دوومین بیانووی بوو کە هەرخوا خۆی دەیزانی کەی ئەبڕێتەوە؟ بۆ ئەوەی مستەفا کەمال لەگەڵ رووس رێکەوێت سوێندخۆرەکان باسی سێڤریان نەدەکردو بەلای تورکدا دەچوون. رەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا پرسیویەتی ئایا مەبەست لە ناردنی ئەم هەیئەتە کە تورك داوایکردووە چی بووە؟

ئۆزدەمیر بە راسپێریی ئەنقەرە ویستویەتی کورد لە ئینگلیز دووربخاتەوەو بە ناوی کوردو کوردستانەوە لە ولایەتی موسڵ بزووتنەوە نەبێت، بۆیە دوور خستنەوەی کورد تاکو لەگەڵ ئینگلیز رێکنەکەون و حکومەتی کوردیی دابمەزرێنن و ئۆزدەمیر لە رواندز بکەنە دەرێ و خزمەتی مەسەلەی موسڵ بکەن لەسەر حیسابی ئینگلیز.بەلام مەسەلەکە بە پێچەوانەی ئەمەوە بوو ئەم هەیئەتە چوو بۆ ئەنقەرەو شێخ یاخی بوو لە ئینگلیزو ئیتر بیانووی مەسەلەی کوردستان بەدەست ئینگلیزەوە نەما، قسەی عیصمەت پاشا لە لۆزان لە بابەت موسڵەوە لەسەرەوە بوو. کەوابێ شێخ مەحمود ئەمەی بۆچی کرد؟ هەموو کوردێکی دڵسۆزێکی کورد ئەم پرسیارە دەکات. رەفیق حیلمی بە پێی تێگەیشتنی خۆی دەڵێت ئێمە بۆ پشکنینی راستی و ناڕاستی ئەو پەیمانەی ئۆزدەمیر دابووی چووین بۆ تورکیا کە ئەگەر شێخ هێرشی کردەسەر ئینگلیزو تورکەکان موسڵیان دەستکەوت ئەوا حکومەتی کوردیی بەسەرۆکایەتی شێخ دادەمەزرێنن.

بۆیە باوکم دوای ئەوەی لە ئەنقەرە لەبارو دۆخەکە تێدەگات بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی،چونکە لە ئەنقەرە زۆر دڵی تەنگ دەبێتو تەنانەت ماوەیەك لە کتێبخانە بە خوێندنەوەو نووسین یان بە پیاسەوە کات بەسەردەبات، یان لە ماڵی حاجی شوکر بەگ ،ئیتر نە لە حکومەت نەلە هیچ کەسێکی تر شتێکی وا نابینن کەنیشانەی دۆستیو بایەخ بێت لەرێگەی غەزەتەیشەوە دەزانێت ئینگلیز بە فڕۆکە سلێمانیی بۆردومانکردووەو ژنو منداڵی کورد ڕایان کردۆتە شاخەکان. بۆیە ڕەفیق حیلمی نامە دەنێرێت بۆ سەرۆك وەزیران تا چارەیەك بۆ کوردەکان بدۆزێتەوە،بۆئەوەی بەمجۆرە سەرگەردان نەبن. بۆ خۆی دەڵێ کەمێکیش لەسەر ئەم مەسەلەیە زیاد ڕۆیشتمو لەزمانو دەربڕینی دیپلۆماسیی دوور کەوتمەوە. هەرلەبەرئەمە پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ سەرۆك وەزیران دەچێتە ئەو میوانخانەیەی کەرەفیق حیلمی لێیە،لەبەر دەرگا دەوەستێتو دەنێرێت بەشوێنیدا،باوکم دەڵێ کە چۆتە دەرێ بینیویەتی سەرۆك وەزیرانی تورکیا بە پێو بە بێ ئۆتۆمبێل یان عەرەبانە لایەوە وەستاوەو کابرایەکی لەگەڵ بووە، دەستی باوکمی گوشیووەو چۆنیو چاکیی لەگەڵ کردووەو وتویەتی" دیارە خەبەری غەزەتەکە تەئسیری لێ کردوویت ،بۆیە ویستومە خۆم چاوم پێت بکەوێت تەسکینیت بدەم ،وا نیە وەزعی شێخو سلێمانی باشە هۆی مەراق نیە خەبەرمدا بە عیصمەت پاشا لە موئتەمەر شکات لە ئینگلیز بکات، ئەگەر دەست لە شێخو سلێمانیی هەڵنەگرێت هێزی (الجزیرە)مان دەنێرین موسڵ بگرن" بەدەم پیاسەکردنەوە لە گەڵ باوکمدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا لەگەڵ ئەم گەنجە تازە پێگەیشتووەی کوردا کەهێشتا تەمەنی ٢٤ساڵ نەبووە ئەمجۆرە گفتوگۆیەی لەگەڵ کردووە. باوکم سەبارەت بەم هەڵوێستە دەڵێ"ئەمە نیشانەی ڕۆحێکی دیموکراتیی بەرزە" بەدەم پیاسەوە ڕەفیق حیلمی بەسەرۆك وەزیران دەڵێ: ئیتر پێویست بە مانەوەی ئەو ناکات لەئەنقەرە ،ئەویش دەڵێ ئەی چاوەڕێی لۆزانو کۆبوونەوەی مەجلیس ناکەی؟ باوکیشم وتویەتی تا کەی،تا چەند مانگی تر بمێنمەوە؟ بچمەوە باشترە شێخ ئاگاداربکەم نەوەك نەزانێ ئێوە چی ئەکەنو تەفرە بخوات. ئیتر ئەویش وتویەتی کەواتە باشتر وایە بڕۆی...

# ڕێی گەڕانەوەی ڕەفیق حیلمی لە ئەنقەرەوە بۆ سلێمانی

ڕۆژی ١٥ی مایسی (٣٣٩)ی ڕومی (١٩٢٢ )ز لە میوانخانەکەوە،

ئەحمەد فەخری پیاوی ڕەشید پاشا بە ناوی بەڕێخستنەوە لەگەڵیان چۆتە ئیستگەی شەمەندۆفێری ئەنقەرە. باوکم دەڵێ تورکەکان زۆر خۆیان بە سیاسیو ئێمەیان بەکەر زانیوە چونکە نەنامەی ڕەسمیو نە تایبەتیشیان نەداونەتێ. ئیتر ئەم خۆی چۆتە لای سەرۆك وەزیرانو داوای نامەیەکی لێکردووە کە لە ڕێگەوبان بە دەستیەوە بێ بۆ ئەوەی مەئموورەکانی تورك بیناسنو یارمەتی بدەن. باوکم دەڵێ هەر بەسەر پێوە لەسەر کاغەزێکی نارەسمیی سێ دێڕی نووسیوەو ئیمزای کردووە، حاجی شوکری ئەو شەوەش زیافەتی بۆ کردووەو بەدوورو درێژی باسی بەسەرهاتی کوردیان کردووەو نامەیەكو وێنەیەکی خۆشی بۆ شێخ ناردووە و فەتاح ئەفەندی-یش یەك دوو نامەی نووسیوە تکای کردووە کە باوەڕ بە من بکاتو لە ئامۆژگاریم دەرنەچێو یەکێ لە نامەکانی بە مەرەکەبی سڕی نووسیوە باوکم دەڵێ ویستم هەر وا بزانێ پێی هەڵخەڵەتاوم.

## قۆنیە

لەسەر بانگهێشتی عەبدوڵڵا حیلمی پاشا، یەکەم قۆناغی سەفەرەکەی لە ئەنقەرەوە بۆ (قۆنیە) دەبێ. عەبدوڵڵاحیلمی خزمی ڕەفیق حیلمیو خێزانەکەیو لەوێ بیگباشیی بووە، نامەی بۆ ناردووە بۆ ئەنقەرە تا سەردانی بکات. عەبدوڵڵا لە مەکتەبی عەسکەریی مامۆستای باوکم بووەو ئەویش نازناوی (حیلمی) بە ڕەفیق حیلمی بەخشیووە. حسێن ڕەئووف ئەم نامەیە دەخوێنێتەوە لە ئەنقەرەو بە باوکم دەڵێ باشە بڕۆ بۆ خۆت هێندێك کات بەرەسەر لەگەڵ خزمەکەت بۆئەوەی بێزاریی داتنەگرێ،باوکم هەفتەیەك لە قۆنیە دەمێنێتەوە، گەلێك ناسیاوی سلێمانی لێ دەبێت وەك برای سەلمە خانی ژنی عەبدوڵڵا حیلمی کە ئەویش خزمی باوکم بووەو هەندێك کەسی تر کەئەمانە هەر ڕۆژە یەکێکیان زیافەتیان بۆ کردووە. بۆ شەوی دوایی عەبدوڵڵا حیلمی زیافەتێکی گەورەی بۆ دەکات، هەموو ئەوانە دێن بۆ وێستگەی شەمەندۆفێر بۆ بەڕێکردنی .لەم باسەدا باوکم نوسیوویەتی ئەمجارە هەرچی پێویست نەبێت نایەنووسم.

## ئەدەنە

لەرێگە لە ئەدەنە لادەدات، دنیا گەرم بووە بەڵام دڵگیرو خۆش بووە، رەفیق حیلمی باسی مەحمود ئاغای موڕافقی دەکات کە هەر فێری تورکی نەبووە چووەتە دەرەوە پۆلیسی سریی گرتوویانە کاغەزێکی کۆنی پێ بووە کە تێیدا نووسراوە موڕاسلی رەفیق حیلمی‌یە،پۆلیسەکە لەگەڵی دەچێتە میوانخانەکە، باوکم کاغەزەکەی حسین رەئووفی سەرۆك وەزیرانی پیشان دەدات کابرا زۆر بە رێزەوە وازیان لێ دەهێنێ و دەڕوات،باوکم زانیویەتی ئەو چەند دێرە بەو ئیمزایەوە وا بە نرخە ! بۆیە هەڵی گرتووە تا کاتی نووسینی یاداشتەکانی (ئەم نامەیە بەتورکیە بۆیە من نازانم کامەیانە؟ بەداخەوە ئیمزاکانیش باش دیار نین).

یەکێ لەنامەکان نامەیەکی فەتاح ئەفەندییە بۆ هاوڕێیەکی بووە لە عوسمانییە ئەم پیاوە کە زۆر خزمەتی باوکمی کردووە لەوێ، کەشیدەو فێستو جبەی لەبەر کردووەو نامەیەکیشی داوەتێ بۆ هاوڕێیەکی بازرگانی تورکی لە عەنتاب ئەمیش زۆر خزمەتی کردووە.تا چۆتە عەنتابیش هێشتا نەیزانیوە بەکام رێگەدا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی بێ مەترسیترە. لە ئەنقەرە لەسەرۆك وەزیرانی پرسیووە بەڵام ئەو وتویەتی ئێمە هەر تا سنوور دەتوانین یارمەتیت بدەین. لە موسڵەوە لەبەر ئینگلیز ناکرێ. رەفیق حیلمی دەیەوێ بە تورکیادا راستەو راست بۆ رواندز بەبێ ئەوەی بەموسڵدا بڕوات، لەوێشەوە بچێتە دیاربەکر سەبارەت بەمە وتوویەتی رەئووف ناوی رواندزی نەبردووە، سنووری عیراق لەوێوە نزیکە بۆیە ویستویەتی بەناو عەشایەردا بچێتەوە سلێمانی یان بۆلای شێخ لە دیاربەکرەوە بۆ بەتلیس‌ووان، بە ولایەتەکانی خۆرهەڵاتی تورکیادا کە نیشتمانی کوردە گەشتێك بکاتو چاوی بە هەندێ برای کورد بکەوێ. بۆیە لە (عوسمانیە)وە شەمەندۆفێر بەجێ دەهێڵێتو بە سواری وڵاخ دەچێتە (جەبەل بەرەکە) لەسەر سنووری سوریا، کە لەژێر حوکمی تورکدا بووە.سەبارەت بەم شوێنە وتویەتی شاخاوی‌و وشکبووەو خەڵکەکەی شەڕانی بوون. لەوێ چۆتە لای پارێزگار کە پیاوێکی باش‌و بەرەوشتبووە. نامەیەکی لێ وەرگرتووە بۆ عەلی صائب بەگ قایمقامی (باخچە)، ئەم پیاوەی لە ئەنقەرە ناسیووە کاتێ کەمەبعوس بووە لە (ئۆرفە) زۆر نزیك بووە لە مستەفا کەمال‌و ئەندامی مەجلیس وتویانە کوردە، رواندزی یان کەرکووکییە..

چووە بۆ سەرپەرشتیی هەڵبژاردنی مەبعوسان تا بە ئارەزووی حکومەت مەبعوسان هەڵبژێرن، رەفیق حیلمی لە (جەبەل بەرەکە) لەگەڵ کارواندا لە ٢٩ مایس ١٩٢٢ دەڕوات بۆ (باخچە) نامە دەنێرێت بۆ قایمقام ٢٩/٣٠ ی مایسی ١٩٢٢ وەڵامی بۆ دێتەوە کە عەلی صائیب دەڕوات بۆ (ئۆلۆجق) دەتوانێت لەگەڵ ئەو بڕوات چونکە جەندرمەیان نیە بینێرن بۆ رەفیق حیلمی وەك داوایکردووە. ئەگەرچی باوکم ئارەزوو ناکات لەگەڵ (عەلی صائیب) بڕوات بەڵام ئەم دەعوەتی دەکات بۆ ماڵی خۆی باوکم ناچێت بۆ سبەینێ دەکەوێتە رێ لە چایخانەیەك لادەدات عەلی صائیب-یش دەگاتە ئەوێ بانگی دەکاتە لای خۆی و چاو ئاوی ساردو قاوەی بۆ داوا دەکات. لێرەدا [*]رەفیق حیلمی زۆر بە توندیی و حەماسەتەوە دەکەوێتە گفتوگۆو وتووێژ لە گەڵیدا گوایە خوێندەواریی لە ڕاستی لابدات خوێندەوار نیەو لاوێکی وەك خۆی بە جەرگ و فیداکارو خوێن گەرم دەبێ چاویان بکاتەوە بچنە سەر رێی ڕاست و هتد.. عەلی صائیب زۆر تورە دەبێ بە تایبەتی کاتێ باسی مەبەستی عەلی صائب لەو سەفەرە بۆ هەڵبژاردنی مەبعوسان بە ئارەزووی حکومەت دەکات. رەفیق حیلمی دەڵێ" کەواتە بۆ دەڵێن هەڵبژاردن ئەویش دەڵێ ئەی چی ناو بنێین؟ ... بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە ل ١٤٧-١٤٨ی یاداشتی (٧) ئینجا عەلی صائیب باسی کوردی لێ دەپرسێ و لەوەڵامی رەفیق حیلمی زۆر پەست دەبێت کەپێی دەڵێ هەوڵ ئەدەین سەربەخۆیی بدرێ بە کوردستان.بۆیە وتویەتی واتا لە ژێر حوکمی ئینگلیزدا بمێننەوە، رەفیق حیلمی وتویەتی ئیستا لە ژێر دەستی ئەواندایین ...ئەویش پرسیویەتی تۆ لە دڵا لە گەڵ شێخی؟ باوکم وتویەتی وا ئەزانم،ئینجا پرسیویەتی ئەویش چاوی لەسەربەخۆیی کوردستانە؟ باوکیشم وتویەتی لەمن زیاتر . پاش چەندین پرسیارو وەڵامی لەمجۆرەو گاڵتە کردن بەعەقڵی کورد وتویەتی بە ئینگلیز تەفرە بخۆن زەرەر دەکەن، ئەوان مەبەستیان موسڵ و نەوتەکەیەتی و هەر تورك بەرژەوەندیی کوردی دەوێ پاشان بەتوورەییەوە وتوویەتی "تۆ چۆن بەم بیرە ژەهراوییەوە بەم وڵاتەدا ئەسووڕێیتەوە؟ کێ ئیزنی داوی ئیتر نایەڵم لێرە بەولاوە پێ بەرێدا بنێی، غەریب نەبویتایە دەمانچەیەکم ئەنا بە تەپڵی سەرتەوە" رەفیق حیلمی بە ساردیەوەو بێ ترس

---

[*] ل ١٤٦ درێژەی باسی گفتوگۆی عەلی صائیب و رەفیق حیلمی سەبارەت بە راستکردنەوەی بیرو باوەڕی ئەوانەی لە ڕاستی لادەدەن هتد...

وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ "ناتوانیت چونکە من بە دزیەوە نەهاتوومو نامەی یەکێکم پێنیە هیچ پیاوێکی حکومەت بتوانێت لە یارمەتیدانمو ڕێپیشاندانم سەرپێچی بکاتو نامەکەی سەرۆك وەزیرانی پیشاندەدات". ئەوکاتە عەلی صائیب بە زەردەخەنەوە پێی دەڵی کەم ئەزموونو ساویلکەیە بۆیە لێی دەبوورێ بەڵام ئامۆژگاریی دەکاتو دەڵێ دوژمنیان زۆرە هێشتا لە مەترسیدان رزگاریان نەبووە بەتەواویی لە بیانی پەرستیی نابێ لەژێر کاریگەریی لاوێتی چی بە بیرا هات دەریبخات. ویستویەتی دڵی بداتەوەو ئاشتی بکاتەوەو لە گەڵیدا ئەو سەفەرە تەواو بکاتو بە باوکمی وتووە ڕاستە بۆ خۆیشی کوردەو کوردی خۆشدەوێو کورد هەریەك برای هەیە ئەویش تورکەو ئایا ئینگلیز چی کرد بۆ کورد حکومەتی بۆ شێخ دامەزراندو هتد... لەوێدا کاغەزی مستەفا کەمال پیشانیباوکم دەدات کە وتویەتی ئەمری عەلی صائیب وەك ئەمری خۆیەتیو نابێ لە ئەمری دەربچن... دوای ئەم قسانە ئیتر لەیەکتر جیا دەبنەوە.

رەفیق حیلمی پاش جیابوونەوەی لە عەلی صائیب بەرێی (مەرعەش)دا رۆیشتووە بۆ (عینتاب) کە ناوچەی قایمقامێکی بچوكو خۆشو کۆڵانی جوانو خانووی مەرمەڕ بووە...لێرەیش بازرگانەکەی ئاشنای محەمەد ئەفەندی زۆر خزمەتی دەکاتو لەماڵی خۆی میوانداریی دەکات. بە جۆرێکی زۆر جوان وەسفی ئەدەبو خزمەتی ماڵو منداڵی کابراو خزمەتکارەکانیشیان دەکات . دوو رۆژ لایان دەمێنێتەوە باوکم دەڵێ وێنەیان نەبووە لە پاكو خاوێنییو بێ دەنگییو خزمەتی بێ هاوتادا تەنانەت جلیشیان بۆ شتووەو ئوتوشیان داوەو حەمامو ئاوی گەرمو تاقمی ریشتاشینیان خستۆتە بەردەستی "ماڵێکی سیحراوی"بووە ئینجا باسی دیوەخانو چاو قاوەو نێرگەلەو کۆبوونەوەو باسی شەڕی تورکو فەرەنسا لە عینتابو قارەمانێتی عەلی صائیبو ئۆزدەمیرو فیداکاریی خەڵکی عینتاب دەکات.

## دیاربەکر

لە عینتاب خۆیو مەحمودی خاڵی دوو جێگە لە ئۆتۆمبێلێکدا دەگرنو دوو لاوی دیاربەکریشیان لەگەڵ دەبێ کەکورد دەبنو باسی گۆرانی دەکەن بە زازاو تورکیو کە دەگەنە دیاربەکر زیافەتی رەفیق حیلمی دەکەنو بە لاوی تریشی دەناسێنن. یەکێکیان دەڕوات بۆ مەرعەش باوکم دەزانێ هاوڕێیەکی کۆنی کە لە کەرکوك لە قۆناغی

سەرەتایدا پێکەوە بوون لە مەرعەشە بەو کوڕەدا نامەیەکی بۆ دەنێرێت .ئەو هاوڕێیەی ناوی عەلی حەسەن بووەو باوکم حەزیکردووە خۆی سەردانی بکات بەڵام کاروانەکە بەوێدا نەڕۆیشتووە، باوکی فایەق بێکەس –یش لەوکاتەدا لە مەرعەش بووە.

## ئورفە

نزیکی نیوەڕۆ دەگەنە ئورفە بەتەمابوون هەر نانبخۆن‌و بڕۆن،بەڵام ڕەفیق حیلمی دەچێتە لای سەرتاشێکی هاوڕێی زۆر خۆشەویستی کەناوی مستەفا بەهجەت دەبێت لەوێ کەدەیبینێت ناهێڵێت بڕوات ئەم هاوڕێیەی لە ئامادەیی سەربازیی بەغدا لەگەڵی بووە . لە خۆشیاندا نەیزانیوە چی بکات؟ دەنێرێت بە شوێن گەلێ هاوڕێی تریاندا وەك مەحمود سامی‌و هتد... لەوێ لە چایخانەی سەر ئاوی ئورفە کاتێکی خۆش بەسەردەبەن ، گوایە ئەمە ئاوی پاشماوەی ئەوەیە کە ئاگرەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی کوژاندۆتەوەو پیرۆزە بۆیە دەست لە ماسی‌یەکانی نادەن.بۆ شەوێش لە ماڵی مستەفا بەهجەت دەبێ.

لە ئورفەوە بە ئۆتۆمبیل بۆ دیاربەکر دەچن‌و لە چایخانەیەکی سەر ڕێگە لە (سیورەك) عەلی یاوەری کوڕی عەزیز ئەفەندی وەسمان ئاغا زابتی تۆپچی دەبینن بەزۆر نان‌و کەباب‌و چاو ماستاویان دەرخوارد دەدات. ئینجا دەکەونەوە ڕێ بەناو بەردەلانێکی شك‌و تاریك‌و هەوای گەرم، نزیك ئێوارە دەگەنە دیاربەکر لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٢٣ ز و٣٣٩ ڕۆمی‌دا [*] ئەو هاوڕێ کوردانەی لە گەڵیان دەیانەوێ میوانداریيان بکەن ئەمان قایل نابن دەچنە یانەی سەربازیی کەژوورو نان‌و حەسانەوەی باشە. لە شارە گەورەکانی کوردستانە ناوچەیەکی مێژوویی کوردە ئاوی دیجلە بە تەنیشتیدا تێدەپەڕێ شارەکە شورە دراوەو ناوچەیەکی حکومەتی دۆستەکی بووە[*] ساڵی ١٥١٤لە شەڕی تورك‌و

---

[*] ١٩٢٣ ئەمە ڕەنگە هەڵە بێت ١٩٢٢ڕاستە چونکە ١٩٢٢ (٣٠ مایس) لە باخچە دەبێ چۆن بوو بە ١٩٢٣؟

[*] بۆ درێژەی باسی ئەم حکومەتەو میرەکانی بڕوانە ل ٦٨ی یاداشتی (٧) هەروەها شەرەفنامەی بەدلیسی‌و کتێبی ئەمین زەکی بەگ( کوردو کوردستان).

عەجەمدا بێشەڕ دیاربەکر کەوتۆتە ژێر دەستی تورکەوە بەلاّم هەر بە شارێکی کوردیی ماوەتەوە. زۆر ناوداروو نیشتمانپەروەری کوردی لێ بووە.

رەفیق حیلمی لەیانەی سەربازیی ژورێك دەگرێ کە زابتێکی تیادا دەبێت ئەویش کورد دەبێ و بە رۆژ لەدەرەوە دەبێت. باوکم زۆر ماندوو دەبێت شەوان ناچێتە دەرەوە بۆ بەیانیی بەرێوەبەری ئیستیخبارات سالم بەگ دەنێرێت بە شوێنیدلو پێی دەڵێ زۆری پێ خۆشبووە کە لە خۆیەوە چۆتە ئەو جێیی حەسانەوەیە و نامەکەی حسین رەئووف دەبینێت و لە ژێریدا دەنووسێت کەبینیوویەتی. باسی رێگەی گەڕانەوەی لێ دەپرسێ دەڵێ جارێ.. بەلاّم پێشنیازی بۆدەکات بچێتە لای جوالد پاشا. رەفیق حیلمی پەشیمان دەبێتەوە لەم چوونەی بۆ لای. (*)

باوکم تا ئەو رۆژەی لە دیاربەکر دەرچووە دوو کەس لێی جیا نەبوونەتەوە یەکێکیان مامۆستای عەرەبیی بووە کە لە قوتابخانە بووە لە سلێمانیی و ئەویتریان هاوڕێی بووە یەکێکیان ناوی (عوسمان نوری)و ئەویتریان (خلوسی یەتلیسی)بووە. دەڵێ کاتێ قوتابی بوون بەیەکەوە خلوسی هاوڕێی شیعر نووسینی بووەو پێکەوە شیعرەکانیان ناردووە بۆ رۆژنامەی (حوادث) لە کەرکووك و شیعرەکانیان بە تورکی بووە چونکە رۆژنامەکە تورکی بووەو هیچ رۆژنامەیەکی کوردیی نەبووە لەو سەردەمەدا. هەروەها شیعریشیان ناردووە بۆ گۆڤاری (کەوکەبی معاریف) ئەویش لە کەرکووك دەرچووە. ئەم دووانەی لە دیاربەکر پاش ئەو چەند ساڵە بینیوەتەوەو دەڵێ مامۆستا عوسمان زۆر دڵنەوایی و خزمەتی کردووەو عورفی بەگیش هەر عەونی کوڕی ماوە لە مەحکەمەی دیاربەکر کاتب بووە. (خلوسی) هەروا لە دوورەوە ناسماندویەتی بە (دکتۆر فوئاد) کەلاوێکی بالاّ کورتی سوورو سپی و لاوازو نیشتمانپەروەرێکی سەرڕاستبووە ،خلوسی خۆیشی پیاوێکی زۆر باشبوو ئاشنا پەروەر بووەو شاعیرێکی قەڵەندەرو خۆش مەشرەب بووە میللەتی خۆی خۆش ویستووەو خۆی لە تالووکە دوور خستۆتەوە بۆیە هەر لە دوورەوە سەلامیان لە دکتۆر فوئاد کردووە چونکە خەفیەی بەسەرەوە بووەو لە رەفیق حیلمی -یش پارلوەتەوە خۆی

(*) بڕوانە ل ١٥٧-١٥٨ باسی خوێندنی رەفیق حیلمی لە سەرەتاییەوە تا هەندەسەی عالی لەسەرزمانی خۆی.

له قەرەی نەدات.[*] لەویٚ رەفیق حیلمی مەلاریاو لەرزوتا دەیگریٚت دکتۆری عەسکەریی بۆ دیٚنن، بەلاّم کە دەنیٚریٚ بۆ دەرمانەکان لە دەرمانخانەی بەلەدیە مەحمودی خالّی ئەم دکتۆر فوئادە دەبینیٚتو دەزانیٚ رەفیق حیلمی نەخۆشە بۆیە پاش یەك سەعات دەچیٚت بۆ لای دەرزی لیٚدەدات.

باوکم لە دیاربەکر ئەم مەلاریایەی پیٚ فیٚر ئەبیٚ، زووزوو لەرزوتا دەیگریٚت کە چاك ئەبیٚ ئەچیٚتە دەریٚو(مستەفا شەوقی) دەبینیٚت. کە دەیەویٚ لە گەلّیدا بە موسلّدا بچنەوە بۆ عیراق، بەلاّم دەلّیٚ کابرایەکی فیشالّکەرو قسەزل بووە بۆیە لەوە پەشیمان دەبیٚتەوەو دوای ئەم بەرۆژیٚك لەریٚی کاروانەوە بەرەو باکووری رۆژهەلاّت دەرِوات پاش پیٚنج رۆژ دەگاتە بەتلیس.

**بەتلیس**

باوکم لە بەتلیس لە مالّی (ئەورەحمان بەگی رەشید پاشا) دائەبەزیٚ. بەتلیس شاریٚکی بچووکی شاخاویی کوردستانی تورکیایە لە نیٚوان دوو شاخدایە بەسەر تەپۆلّکەیەکەوەیە، دیمەنیٚکی سروشتیی جوانی هەیە. ئاوو هەواکەی سازگارە ئەو رۆژە ناوچەی ولایەتیٚك بووە بە هەمان ناوی (بەتلیس) ماوەیەکیش ناوچەی ئیمارەتیٚکی بەناوبانگی کورد بووە. ئەمیر (شەرەفخان)ی بەتلیسی کورِی ئەمیر شەمسەدین (رۆژکی)[*]لە (١٠٠٥)ی کۆچی ١٥٩٦ز کتیٚبی میٚژوویی ئیمارەتەکانو حکومەتەکانی کوردی بە فارسیی نووسیوە. خۆیشی لەسەردەمی سولّتان موردای، سیٚهەمین سولّتانی عوسمانیدا ئەمیری ولایەتی (بەتلیس) بووە .

**تەتوان**

رەفیق حیلمی هەر یەك شەو لە بەتلیس دەمیٚنیٚتەوە لەویٚ هیٚستریٚك دەکرِیٚ بە (٨٠) مەجیدیی تورکی ودەلّیٚ ئەمەی لەکیس چووە چونکە هیٚسترەکە زۆر لاوازو پەککەوتە بووە. یەکەم مەنزل پاش بەتلیس (تەتوان) بووە. رۆژی دەیەمین گەیشتۆتە (ئەخلات)

---

(*) بروانە ل ١٦٠ یاداشتی ٧ بۆ دریٚژەی باسی دکتۆر فوئاد.

(*) بۆ دریٚژەی ئەم باسە بروانەنە کتیٚبی شەرەفنامە بە کوردیو کتیٚبی یاداشتی رەفیق حیلمی بەرگی (٧) ل ١٦٢ ماوەی حوکمیان لە ١٠٠٥-١٥٩٦ز میٚژووی شەرەفنامە کە ٧٦٠ سالّ حوکمیان کردووە. (١٨) ئەمیریان ناویان هاتووەو ٤٥٠ سالّ سەربەخۆبوون .

لەوێ دیسان ناسیاوی کۆنی بینیووە، ئەمجارە (ئیبراهیمی گودرون)دەبینێ کە خۆیو کچو ژنی لەزووەوە دەناسێ سەبارەت بەمان دەڵێ کچە قۆشمەکەی وێنەی خۆی بە شەپقەوەداوە بە رەفیق حیلمی تا بیباتەوە بۆ خزمو کەسی.باوکم لە (ئەخلات) لەماڵی ئەم ئیبراهیمە قاوەڵتی دەکات. ئینجا باسی مێژووی ئەخلاتمان بۆ دەکات. (مەجیدەدین) حاکمی ئەخلات (برای شەرەفخان) بووەو هاو سەردەمی (تیموری لەنگ) و (مەلیك ئەشرەفی حاکمی ئۆرفە)و (حەرانی کوری سەلاحەدینی ئەیوبی) بووە بۆ درێژەی باسی مێژووی ئەخلات بڕوانە ل ١٦٣ی یاداشتی (٧).

## ئارجیش

رۆژی سێیەم رەفیق حیلمی دەگاتە ئارجیشو دیسان خەیاڵ دەیگێڕێ بەناو لاپەڕەکانی حوکمدارانی کوردو قارەمانو سەڵتەنەتیاندا گوزەر دەکات لێرەدا بیری (باز أبو الشجاع)ی دەکەوێتەوە چۆن لە شوانیەوە (حکومەتی دۆستەکی) دامەزراندووەو بۆتە (شا)و لە ئارجیش لەشکری پێکەوەناوە بۆ گرتنی دیاربەکر. ئینجا میافارقینو نەسیبینو جنوبی وان تا موسڵ دەچێولە ١٩٨٣ز داگیری دەکاتوبەرەو بەغداد دەڕوات. بەڵام لەشەڕی حەمدانی لە وڵاخەکەی دەکەوێتە خوارەوەو دەمرێ، خوشکەزاکەی جێی دەگرێتەوە ئەو حکومەتی دۆستەکی دەکات بە (مەریوانی)ی بەناوی باوکیەوە.

## وان

دوای ئارجیش باوکم دەچێتە (کۆی)و دوای ئەمە بە رۆژێك لە (٦)ی تەمموزی (٣٣٩) رۆمیی دەگاتە وان، نزیکی ئێوارە بەتەمابوون بچنە میوانخانەیەك تەنانەت ژورێکیشیان لە هیچ شوێنێك دەستنەکەوتووە. ئەم ناوچەیە بە تایبەتی (بەتلیس، وان، گەورە،شەمدینانو رواندز )تەختو تاراجیان نەمابوو بەهۆی شەڕی کوردو ئەرمەنو داگیرکردنی روسیەوە.

وان ناوچەی ویلایەتێکی گەورە بوو بە هۆی ئەرمەنی زیرەكو سەنعەتکاریی زیوو زێڕو میناکارییەوە.. رەفیق حیلمی تا هەرێمی وان زۆر لاواز دەبێ بە هۆی مەلاریاو ماندوێتیەوە پێی دەڵێن بەهەوای سازگاری وانو مەلەکردن لە دەریاچەی وان دا چاکدەبێتەوە باوکم دەربارەی ئەمە دەڵێ راستیانکرد لەوێ نەمگرتەوە، بەڵام بەبێ مەلەکردن چونکە مەلەکردنم نەدەزانی.

نزیك خۆرئاوا بوون لەبەردەمی دوكانێكدا عەوالی جێگەبوون، تیابجەسێنەوە، لەپڕ ناسیاوێكی كۆنی كەركووكی لێ پەیدا دەبێ بەناوی (مەجید ئەمین). پاش سلاوی گەرمو گوڕ پێی وتووە بۆ خۆیشی هیچ جێگەیەكی نییەو ژنو مالی نیە لە دائیرەی ژەندرمە دەخەوێت، لەبەرئەوەی كوماندانی ژەندرمەیش كەركوكیەو رەنگە پێی ناخۆش نەبێت رەفیق حیلمی-یش ئەو شەوە لەوێ بنوێت تا سبەینێش خوا كەریمە. باوكم دەلێ سەد شوكر لەو حالە رزگارمان بوو. كە دەیشچێت ئەم مەجیدە زۆر خزمەتیان دەكاتو دەحەسێنەوە. ئەو كاتەی باوكم لە كەركووك مامۆستا بووە ئەم مەجیدە موغازەی هەبووەو كاسبی كردووە. دوایی رایكردووە بۆ لای ئۆزدەمیر ئەوكاتە ئەم لە ئەنقەرە بووە ئینگلیز ئۆزدەمیری لە رواندز دەركردووەو سەربازەكانی بە شەمدینانو باش قەلادا بلاوبوونەتەوەو هەندێكیان وەك ئەم دەچن بۆ وان . (ئەسعەد نیازی) كەباوكی ژنێكی خزممان بووە) كوماندانی ژەندرمە بووە لەوێ زۆر لەمانە لە ئالای خۆی دادەمەزرێنێتو ئەم مەجیدە دەبێت بە كاتب لە دائیرەی جەندرمە. ئەسعەد نیازی لەوێ زیافەتی باوكم دەكات.

رەفیق حیلمی بۆ بەیانی دەچێتە ناوچەی فیرقەی وان (عەلی رەزا) بەلام لەو رۆژەدا دێیەكی وێران بووەو تالانكراوە دوو سەد مالی ئاوایی تیا نەبووە، دیمەنی سروشتی دەریاچەی جوانو شاخو كێوی دەورو پشتی. شەقامی پانو درەختو ئاوی بلوورو ساردو هەوای سازگار! بەلام شەقامەكانی چۆلو بێدەنگ بوون .لێرەدا رەفیق حیلمی دەلێ ئەو مەلاریایەی دیاربەكر لێی نەگەڕاوە بێ وچان گرتویەتیو توانای لەبەر بڕیووە بۆیە تا ئەوێ ئەو جێگایانەی پیایاندا ڕۆیشتووە هەر وەك نەیبینی بێتن وایە ئەوەندەی زانیوە بەلای (سعرد)دا رۆیشتوونو لەوێ هیچی نەنووسیوەو لە بیریشینەماوە، لەو پێنج رۆژەی نێوان بەتلیسو دیاربەكردا هەریەك رۆژی نووسیوەو لەبیری ماوە. بەلای (وەیس القرەنی) یەوە بوون كاروانەكەیان كەژاوەیەكی لەگەل بووە. ژنێكی نەخۆش كە ژنی مەئمورێكی دیاربەكربووە تێیدا بووە.مەئمورەكە ناردوویەتیەوە بۆ مالی باوكیو كوڕێك لەگەل كەژاوەكە بووە برای ژنەكە بووە كچێكی گەنجی جوانو شیرین بووە لەپڕ كوڕە هاواری كردووە ئیتر زانیویانە ئەو ژنە مردووە رەفیق حیلمی دەلێ دوعایكردووە ئەو رۆژە لەرزو تاكە نەیگرێو خودا دوعاكەی قبولكردووەو توانیویەتی لەگەل ئەوانی تر

ئـەو ژنـە بنێـژن. دەڵـێ سـێ سـەعات لەومەراسـیمی ناشـتنەدا بـەپێوە بـووەو بـەخۆی نـەزانیووە. گەڕاونەتـەوە مەرقەدەکـەی وەیـس و لەسـەر سـەکۆیەك جێـی داخسـتووەو ڕاکشاوە سەعاتێك ڕاکشاوە لەشی سووك و بێ لەرزوتا بووە داوای شیرو ماستی کردووە لە مەحمودی خاڵی و داوایکردووە چێشتی برنجی بۆ لێنێ دواتریش چێشتەکە سەقەت بووە.

بۆ بەیانی لەرزوتاکە داویەتـەوە بەعـەرزدا، کەسوکاری ژنـە مردووەکە هاتوون ببینن ئینجا زانیویانـە مـردووە.بۆیـە ڕەفیـق حیلمـی ئەمجارەشـیان لـەناو جێگـادا فرمێسکی ڕشتووە. بیگباشـی ئـەرکانی حـەربی فیرقە زۆر بە جوانیی بـەڕێی کـردووەو تـا لـە (وان) بـووە زۆر خزمـەتی کـردووە سـەبارەت بـەڕێی گەڕانـەوەی ڕەفیـق حیلمـی وتویـەتی: بـۆ کوماندانی قۆڵ ئۆردووی خۆرهەڵات ئەنووسم تابەئەمری ئەو چی پێویست بێت بیکەین. (٧)ی تەمموز بۆ ئۆردوویان نووسیوە لە (١٤)ی تەممووزدا دووبارە نووسیویانەتەوە.

لـە هەیئەتەکـە (ئەحمـەد تـەقی) لای سمکـۆ بـووە لـە قـەفقاس واتـا هـەر ڕەفیـق حیلمی ماوە لەم گێرمەو کێشەیەدا چونکە فەتاح ئەفەندیش نەگەڕاوەتەوە لە گەڵی. هـەر خۆی و مـەحمودی کـوڕی خـاڵی ئـەم ڕێگـە دوورو درێـژو سـەختەیان بڕیـووەو ئـەم هـەموو بەسەرهات و شارو خەڵکی ناسیاوو تازە ئاشناو پیاوە گەورانەیان بینیووە.

ئەسـعەد نیـازی وەك وتمـان نامـەی بۆ ڕەفیـق حیلمـی ناردووە کە لای عـەلی ڕەزا بـووە بەخێر هاتنی کردووەو زیافـەتی کـردووە (وابـزانم بـاوکم نەچووە بۆ زیافەتەکـە) ئەسـعەد نیازی وتوشیەتی تالە (وان) بێ فەرمانگەکەی لە ژێر فەرمانیدا دەبێت و ناحەوێتەوە دەنا دەیبردە ماڵی خۆی. ڕەفیق حیلمی دەڵێ بەڕاسـتی ئینسـانێکی تـەواو بـوو. لـەرزو تاکـەی باوکم لە تفلیسەوە کەم دەبێتەوە بەڵام وەك وتمان لە وان بەجارێ لە کۆڵی دەبێتەوە.

(سمکـۆ)لـە سەرای لـە ناوچـەی وان بـووە ڕەشـید جـەودەتی لابـووە، ڕەشـید جـەودەت لـەوێوە کەوتۆتـە پەیوەنـدیکردن لەگـەڵ ڕەفیـق حیلمـیدا وتویەتی سمکۆ هـەر چاوەڕێی سـەرئەنجامی تەقـەلای (ئەحمـەد تـەقی) بـووە لای سـەعید پاشـا کـە کوڕەکـەی سمکـۆی لابووە خستویەتیە قوتابخانـەی کۆلێـژی سـەربازیی و بەتـەمابووە بینێرنـەوە لای سمکـۆ . بەڵام ئەم ویستویەتی سمکۆ بچێتە (وان)و بچێتە ژێر دەستیان بۆیـە سمکـۆ نـەیوێراوە، مەسەلەی شێخ و ئۆزدەمیریش سەری نەگرتووە. ئۆزدەمیر بەخۆی و لەشکرە چەتەکەیەوە

له رواندز دوور خراوه‌ته‌وه بۆیه سمکۆ زانیویه‌تی بچێته وان ئه‌بێ به ته‌ڵه‌وه. له‌نێوان فیرقه‌و سمکۆدا پێش گه‌یشتنی ره‌فیق حیلمی بۆ وان په‌یوه‌ندییه‌کی زۆر هه‌بووه به‌ڵام بێ سوودو بێ ئه‌نجام بووه.باوکم ده‌ڵێ هه‌رچه‌ند له (عه‌لی ره‌زا) و (که‌نعان به‌گ)ی کوماندانی فیرقه زۆر نه‌وازشی بینیووه به‌ڵام نه‌یویستووه خۆی له مه‌سه‌له‌ی سمکۆ بدات ترساوه ببێ به هۆی کرده‌وه‌یه‌ك په‌شیمانیی له‌دوا بێت. جه‌ژنی قوربانی به‌سه‌را دێت‌و ره‌فیق حیلمی بروسکه‌ی جه‌ژنه پیرۆزه‌ی له( جه‌وده‌ت‌و سمکۆو عه‌لی سه‌عید پاشا)وه بۆ ده‌چێ، سمکۆ داوای کردووه باوکم بچێت بۆ لای. پێش له فیرقه چه‌ند جار ئه‌وه‌یانداوه به گوێیدا ، که بچێته لای سمکۆو هێمنی بکاته‌وه‌و پێی بڵێ دڵنیابێته‌وه‌و بچێته وان به‌ڵام هه‌نجه‌تی هێناوه‌ته‌وه. که نامه‌که‌ی سمکۆی پێ گه‌یشتووه فیرقه ئه‌مه‌ی به‌هه‌ل زانیووه‌و ناردوویه‌تی به شوێن ره‌فیق حیلمی داو هه‌موو په‌یوه‌ندییه‌کانی نێوان فیرقه‌و قوڵی ئۆردویان خستۆته به‌رده‌می که له‌لایه‌ن سمکۆوه نووسراوه، به‌رواڵه‌ت فیرقه له‌گه‌ڵ سمکۆ بووه. ره‌فیق حیلمی ده‌ڵێ چونکه خۆیشی نزیکه‌ی مانگێك بووه چاوه‌ڕوانبووه یارمه‌تی بده‌ن به رێگه‌یه‌کی بێ مه‌ترسیدا بینێرنه‌وه‌و بۆ (عه‌لی پاشا)یشی نووسیوه وتویه‌تی سه‌ر له فیرقه بدات که‌چی فیرقه هیچی بۆ نه‌چووه ئینجا موراجه‌عه‌ی لای والی ده‌کات و ئه‌و په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ده‌کات و وه‌ڵامی بۆ دێته‌وه که به رێگه‌ی (شه‌مدینان)دا بڕوات باشتره. (فه‌وزی به‌گ)ی ئاشنای که له سه‌ره‌تاوه له‌گه‌ڵ هه‌یئه‌ته‌که بووه له‌وێ یارمه‌تی ئه‌دات، به‌ڵام هه‌ر ئه‌مڕۆ تا سبه‌ینێیان پێ کردووه تا باوکم ته‌واو بێزاربووه. بۆیه خێرا بڕیار ده‌دات بچێته لای سمکۆ. زانیویه‌تی سمکۆ له‌ناو عه‌شایه‌ری عیراق‌و عه‌جه‌مدا نفوزیه‌کی گه‌وره‌ی هه‌یه‌و ده‌توانن بیگه‌یه‌ننه سنووری رواندز. له وان جلی کوردیی له‌به‌رده‌کات‌و ریشێکی بچوك ده‌هێڵێته‌وه. جه‌ژن له ماڵی شێخێکی کوردی خه‌ڵکی کوردستانی باشوور ده‌مێنێته‌وه‌و به‌کوردیی قسه‌ده‌که‌ن له‌وێ هه‌ندێك ساحێب ماڵ ده‌روێش‌و موریدی هه‌بووه ئه‌م گومانیشی لێ کردوون، به‌ڵام ئه‌م شێخه زۆری خزمه‌ت ده‌کات‌وله ماڵه‌که‌یدا سه‌بووریی دێت. وه‌ك له‌ناو که‌س‌و کاری خۆیدا بێ به‌خۆشی ده‌ژی دوای جه‌ژن له فیرقه‌وه سێ سواری تورکی له‌گه‌ڵ ده‌نێرن‌و ده‌چێته لای سمکۆ.

رەفیق حیلمی دەڵێ کە پاش ئەو شەوەی شێخ و سمکۆ بڕیاریانداوە ئەم بچێ بۆ ئەنقەرە تابزانێ ڕاستن لە سەر بڕیاری نۆزدەمیر حکومەتی کوردیی دادەمەزرێت و شێخ دەکرێت بە حاکمی کوردستان بۆ تاقی کردنەوەی ئینگلیزیش شێخ مەحمود لە ڕواندزەوە نامەیان بۆ دەنێرێ و دەنووسێ کە بەرامبەر بە هەڕەشەی ئینگلیزەکان خۆی و سمکۆ ئامادە باشییان کردووە بەڵام دوای سەفەری رەفیق حیلمی بۆ ئەنقەرە نازانێ سمکۆ چۆن گەیشتۆتە ئەو ناوچەیەو (رەشید جەودەت) لای سمکۆ لەوێ چی دەکات. بۆ تێگەیشتنی ئەمە باسی ئەو نامانە دەکات کە رەشید جەودەت بە تورکی نووسیونی و بۆینـاردووە دەڵـێ" زۆر بـە وردی و بـە قەڵـەمی قۆپیـە نووسـیویەتی و هەنـدێك جێـی چۆتەوەو سواوە تا ئیستاش گوایە هەڵی گرتوون" رەفیق حیلمی دەڵێ" وا ئیستا بە زەڕەبین ئەیخوێنمەوەو ئەم قسانەی خوارەوەتان لەو نامەیە بۆ دەگۆڕمە سەر کوردیی" شایانی باسە نامەکە لە ٣٣٩/٧/١٥ی ڕۆمیدا نووسراوە.

## نامەکەی رەشید جەودەت ، رەفیق حیلمی لە تورکیەوە کردویەتی بە کوردی

برای زۆر خۆشەویست..... ٣٣٩/٧/١٥ ی ڕۆمی

زۆر بەخێر بێیتەوە، ئینشاء الله بە خۆشی ئەگەڕێیەتەوە وڵاتی خۆشەویست، وەکو لە جەنابتانەوە مەعلومە ئێمە دوای جیابوونەوەتان لە سلێمانی بە پێنج ڕۆژ لە سلێمانیەوە چووینە پشدەر. بەقەبری باوکم و بەشەرەفم خۆیشم ئاگام لە وەختی حەرەکەتمان نەبووە ئەو شەوەی کە بۆ بەیانی حەرەکەتمان تیا کرد لەسەعات دووی نیوەشەودا ئاگادار کرام، لەبەر ئەوە، ئەو شتانەی کە پێویست بوون بۆ سەفەرێکی وا زۆریم بۆ ئامادە نەکرا، لەبەر ئەوە نابێ لێم بگری کە ئەوەی لە ڕواندز بۆتنووسیبووم لە پەشۆکاویا بیرم چوو. ئەوەتا بەیانی هەوڵی ئەوە ئەدەم کە ئەسپێکی باش پەیدابکەم و بەیانی زوو لە لایەکەوە بۆ (سمایل ئاغا) سمکۆو لە لایەکەوە بۆ خۆم بە کۆکردنەوەی هەندێ شتەوە خەریك بووم، لەبەر ئەوە لەو جلانەی کە ئیستاش لەبەرمایەو لە دەستێك کراس و دەرپێ بەولاوە شتێکم بۆ هەڵنەگیراوە. هەتا نەمتوانی بچم و بزانم منداڵەکانی تۆ لەچیدان، بەراستی ئەبێ لێم ببوری... لێرەدا چەند دێڕێك بە سپێتی بەجێ دێڵێ لە نامەکەدا، ئینجا ئەچێتەوە سەری .

واقیعەن ئینگلیزەکان یەك دووجار سلێمانیان بۆردومانکرد، بەڵام زەرەرو زیانێکی زۆری نەدا،ماڵی ئێوە شوکر سەلامەتن. لەوەختی بۆمبارانەکەدا هەندێ لە ئەهالی کشانە دێهاتەکان[*] بەڵام ئینگلیزەکان بە مەنشور بڵاویانکردەوە کە زەرەر بە ئەهالی و بێ گوناهان ناگەیەنن، لەبەر ئەوە زۆریان گەڕانەوەو لە بۆمبارانەکەدا لە فەقیرەکان بە ژن و پیاوو منداڵ نزیکەی دە کەسێك شەهید کران، ئەو خانوانەش کە وێرانکران لە دیارەکان خانووی حاجی ئەمینی کاکە حەمەو خانووی بەگی خانزادە جوانی و بەشێکی تەویلەکەی ماڵی حاجی مەلا سەعید بوو دڵنیابن کە لە لای ماڵی ئێوە شتێکی وانیە کە جێگەی غائیلەو مەراق بێ. لەلایەن شێخ مەحمودەوە مەعلوماتێکی ...

لێرەدا ئەو دەفتەرەی کە یاداشتی(٧)ی تیا نووسیوەتەوە تەواو بووە. وەك لەو دەفتەرەدا کە لەسەری نووسیوە "دەستکردن بە خاطراتەکەم" واتا یاداشتەکانی و لە دەفتەری باسی سەفەرەکەیدا بۆ سوریاو لوبنان دەردەکەوێت ئیتر هیچی تری نەنووسیوە. چونکە وتویەتی: لە نووسینەوەی خاطراتەکەم گەیشتمە نامەکەی رەشید جەودەت. ئیتر چەند گەڕاوم هیچم نەدۆزیوەتەوە کە بڵێم تەواوکراوی یاداشتەکانیەتی جگە لە چەند لاپەڕەیەك سەبارەت بە شەڕی بەردەرکی سەرا (٦)ی ئەیلولی رەش و بەندکردنی لە سلێمانی، ئینجا ناردنی بۆ هەولێرو لەپڕ نەفیکردنی لەوێوە بۆ ناسرییە. ئەمەیش دەنووسمەوەو دەینێمە پاڵ ئەم یاداشتانە لەگەڵ هەموو ئەو باسانەی دەستم کەوتوون تا ئێستاو هیچیان لە نووسینی باوکم نین سەبارەت بە (سەرۆکایەتی پارتی هیوا) بە ئومێدی ئەوەی ببێتە ئەڵقەیەکی تر لە زنجیرەی یاداشتەکانی هەرچەندە هێشتا کەلێن هەیەو جیاوازیی نێوانیان زۆرەو بە هیچ جۆرێك وەك شاکارە پەخشانەکەی خۆی

---

[*] لەم کاتەدا بووە کە دایکم و پوورم واتا ژن و خوشکی رەفیق حیلمی لەگەڵ خەزووری چوونەتە سورداش و لەوێ لە ئەشکەوتەکەیدا خۆیان شاردۆتەوە. لەوێش رەفیق حیلمی دەبێت بەباوك و یەکەم منداڵی لەدایك دەبێت پاش (٥) ساڵ چاوەڕوانکردن. سورداش دێی باپیرمان بووە لەوێ ژیاوە وباخ و بێستان و زەوی زۆری هەبووە خۆشی (مودیری مالیە) بووە ئێستاش ئەو باخاتانە هەر ماون. ئەمەیش یەکێکە لە ناسۆریەکانی دووریی رەفیق حیلمی لە وڵاتی‌خۆی لەپێناوی خەباتی نەتەوایەتیدا. من (٤٢) ساڵە بەناو شتەکانی باوکمدا دەگەڕێم بۆ دۆزینەوەی ئەم یاداشتانە. دوا لاپەڕەی یاداشتی بەرگی حەوت. ئەوەی دەفتەرەکەی‌باوکم خۆی ئامادەی کردبوو بۆ لە چاپدان و نەگەیشت لە چاپی بدا پاش کۆچی دوایی ئەوپاکیزەی خوشکم خستیە ژێر چاپەوە دەشڵێت دیارە بەشەکانی تری ئەو یاداشتە (ئەهریمەن) دەستی پیاگرتوون

نیە. بەڵام هەر شتێك لە هیچ باشترەو ئەمە بۆ ئەوانە دەنووسم کە پرسیویانە ئایا ئیتر رەفیق حیلمی هیچی تری نەنووسیوە. ئومێد ئەکەم ئەمە ببێتە یاداشتی (٨)ی رەفیق حیلمی ئەگەر چی بەتەمابووە (١٨) بەرگ بێت.

## لیستەی ئەو شارانەی لەسەر رێگەی سەفەرەکەی بوون بۆ ئەنقەرە

### ١-لە رێگەی چوونی بۆ ئەنقەرە:

لەسلێمانی یەوە بۆ رانیەو لەوێوە بۆ رواندن، بەتەما بوون لە رێگەی (دەربەندو) (زینووی شێخ)ەوە بڕۆن بۆ ئێران و لە رێی (ورمێ)و(تەورێزە)وە بڕۆن. لە زینووی شێخەوە بۆ (شنۆ) پاش حەوت رۆژ لە رواندزەوە دەگەنە (ورمێ)لە نزیك دەریاچەی (ورمێ).رەفیق حیلمی نوسیویەتی کوردستان پارچەیەکە لەبەهەشت.

بە پاپۆڕی (ئازادستان) بۆ (شەرەفخانە)، لەوێوە بۆ (شیستەر) بە پێ (١١) سەعات بووە بە بریچقە بۆ میان دواب واتە (میانەی دوو ئاو) لەوێشەوە بۆ (تەورێز)، تا (میان دواب) بێ پاسپۆرت رۆیشتوون تا پاسپۆرت وەربگرن و ڤیزەی رووسی و تورکی بۆ تەواوکردنی سەفەرەکە ناوی خواستراویان بەکارهێناوە رەفیق حیلمی بە ناوی (عەلی فایەق بەگ)و مورافیقەکەی مەحمود ئاغا بەناوی (حەسەن ئەفەندی)یەوەبوون لێرەدا وێنەی پاسپۆرتەی مورافیقەکە دادەنێین.

ئەم پاسپۆرتە پێویست بووە تاکو بتوانن بە خاکی (ئێران)و (ئەرمەنستان )و(گورجستان )و (ئازربایجان)و (قەفقاس)دا بڕۆن بۆ (تورکیا). لە (شیستەر)ەوە بە بریچقە کە بۆ بار بووەو خۆیان بە (پایتۆن) چوون بۆ (تەورێز)، گەڕەکی ئەرمەنستان خۆشترین جێگە بووە لەوێ و زیافەتی سەر شابەندری رووسیان بۆ کراوە. لە تەورێزەوە بۆ ئەستەمبووڵ دەبوو بەرێی قەفقاس و لە زەریای رەشەوە بچن، ئەریوان پایتەختی ئەرمەن و تفلیس گورجی یا گورجستان لەژێر چاودێریی حکومەتی رووسیادا بوون، بۆیە پێویستیان بە ڤیزەی رووسیایی بووە،تا لە (مۆسکۆ) وە بێت بۆیان رۆژی نەورۆز لە تەورێزبوون.

٣٠ مارتی ١٩٢٢ بە ئۆتۆمبیلی سەر شابەندەرخانەی رووس (٣ کوردو دوو تورك و ٣ رووس) دەبن، لەنێوان تەورێزو جولفا بۆ شاری (جولفا) چوون لەسەر سنووری ئێران و

ئەرمینیا، سەر رۆخی ئاوی ئاراس کە پێیان وتووە (ئاراسی خوێناوی) لەبەر شەڕی تورکیاو ئەرمینیا لەوێدا لە جولفا رەفیق حیلمی ئەچێتە سەر رۆخی ئەم ئاوەو دەموو چاوی لێدەشوات، جولفای ئێران لەو پەڕی پردەکەی (جولفای روسیا) دەبێت. لە جولفای روسیاوە بە شەمەندۆفێر دەچن بۆ (تەفلیس)بە (نەخچەوانا) تێ دەپەڕن، دەگەنە (ئەریوان). لە ئیستگەی (گومری) لە (ئەحمەد تەقیوفەوزیو رەمزی بەگ)ی تورك جیا دەبنەوە، بۆ مەسەلەی بەربوونی کوڕی سمکۆ، بەنیازدەبن لە (تەرابزون) بەیەك بگەنەوە. ئەوان دەچن بۆ (ساری قامیش) لە سنووری تورکیا.

لە جولفاوە بە سێ رۆژ بەشەمەندۆڤێر دەگەنە (تەفلیس) پایتەختی گورجستان ئینجا دەگەنە(باتووم) لە تفلیسەوە بە شەمەندۆفێر بۆ باتوم ئەسکەلەی کۆماری (جورجیا) لەسەر رۆخی زەریای رەش نێوان تەفلیسو باتوم (٢٤) سەعاتە.

لە باتوومەوە بە پاپۆڕ بە زەریای رەشدا بۆ (ئەستەمبووڵ) چوونو ژمارەی پاسپۆرتی رەفیق حیلمی (٣٥) بووە مێژووەکەشی (١٥)ی نیسان (١٩٢٢)کە لەورێکەوتەدا بە پاپۆڕ چوون بۆ ئەستەمبوول، پاپۆڕەکە ناوی (شیفیلد) بووە.رەفیق حیلمی تووشی نەخۆشیی دەریا دەبێ واتە (ڕشانەوەو ژانەسەر) پاپۆڕەکەش هێندەی نەماوە نوقم ببێت. رۆژی چوارەم گەشتوونەتە (قەواق) ئەسکەلەی ئەستەمبووڵ رەمەزان بووە لەم کاتەدا ئەو دەفتەرەی تا ئەو کاتە باسی ئەو سەفەرەی تیا نووسیوە فڕێیداوەتە ئاوەکەوە و لەوێدا بیری یەکەم سەفەری کەوتۆتەوە بۆ ئەستەمبووڵ لەکاتی منداڵییو لاوێتیدا کە بۆ خوێندنی بالا چوو بوو. کەئەکاتە بە سواری کەرو وڵاخ دواتر بە پاپۆروعارەبانەو بریچقە لە سلیمانیەوە تا حەڵەبو لەوێوە بە شەمەندۆفێر تا بیروتو ئینجا بە پاپۆڕ لە زەریای سپیەوە تا ئەستەمبووڵ رۆیشتبوو.

چوار پێنج سەعات بە پاپۆڕی کۆمپانیای (خیریە) بە دەریای (مەرمەرە)دا گەیشتۆتە شاری ئوزمید– ئیزمیت. لە ئوتێلێکی بەلەدیە دابەزیون ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە گۆڕستان بووە بە شەمەندۆفێر بۆ ئیستگەی (ئەسکی شهر)و (پولادڵی) بۆ ئەنقەرە چوون (*)

---

٢. باسی برسێتیو هەژاری ئەرمەنی لە لۆکنتەکانی ئەریواندا کردووە

## ئەو شارانەی لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بینوونی

١٥ مایس ٣٢٩ رومی ١٩٢٢ی ز لە ئەنقەرەوە:-

لە ئۆتێلەکەوە لەگەڵ ئەحمەد فەخریی پیاوی رەشید پاشا بۆ ئیستگەی شەمەندۆفێری (ئەنقەرە) بۆ (قۆنیە) چوون بۆ لای عەبدڵلا حیلمی پاشا، لە قۆنیەوە بەشەمەندۆفێر بۆ (ئەدەنە) چوون کە لەسەر ئاوی (جیحون)ە ئەوئاوەی کە ئەڕژێتە دەریای سپییەوە بۆ ڕێگەی گەڕانەوە بۆ سلێمانی بڕیار دەدات بە (دیاربەکر)دا بچێ بۆ (تەبلیس)و(وان) تا بە کوردستانی تورکیادا بڕوات.

لە (عوسمانی)یەوە شەمەندۆفێر بەجێ دێڵێت و بەسواری ولاخ دەچێتە (جەبەل بەرەکە) لەسەر سنووری سوریاکە ئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتی تورکدا بووە. لەوێ پارێزگار نامە بۆ (عەلی صائیب)ی قایمقامی باخچە دەنێرێت،

رەفیق حیلمی ٢٩/٣٠ مایس ١٩٢٢ بە کاروان دەڕوا لە مەرعەشەوە دەچێ بۆ عینتاب لە عینتابەوە بۆ دیاربەکر بە ئۆتۆمبیل دەڕوات و ئۆرفە لەسەر ڕێگەکەی بووە

لە (ئۆرفە ) دەمێنێتەوە دواتر بە ئۆتۆمبیل بۆ (دیاربەکر) دەچێت لە، ١٨حوزەیرانی ٣٢٩ی رۆمیدا ئیوارە دەگەنە دیاربەکر (عوسمان نوری و خەلوسی بەتلیسی) دەبینێ (ل١٦١/١٦٣) یاداشتی(٧). لە دیار بەکرەوە بۆ (بەتلیس) لەبەر مەلاریا شارەکانی تری بیر نامێنێت و باسیان نانووسێتەوە. لە بەتلیسەوە بۆ (تەتوان) ئینجا بۆ (ئەخلات) دەڕوات ل ١٦٣/١٦٤ باسی ئەخلات و مێژووی ماڵی ئیبراهیم ئەفەنی دەکات دواتر دەڕوات بۆ ئارجیش ل ١٦٤/١٦٥ یاداشت (٧) لە ئارجیشەوە بۆ کۆی دەچێ دواتر رۆژی ٦ی تەممووزی ٣٢٩ رومی دەگەنە (وان) لەوان نامەی رەشید جەودەتی پێ دەگات باسی سمکۆو شێخ و بۆمبارانی سلێمانی بۆ دەکات و بەم نامەیە یاداشتی (٧) تەواو دەبێ.

ماوەی گەڕانەوەی رەفیق حیلمی بۆ سلێمانی لە هیچ شوێنێکدا نەنووسراوەو کەس نایزانێ. ئەوە نەبێت کە پاش بڕینی ئومێدی دایکمان و پورمان لەوەی باوکم مابێت و بگەڕێتەوە، لەپڕ پاش چەند مانگێك سەر دەکات بە حەوشەی ماڵی خەزووریدا چونکە

٣. باسی ئۆتێل ئۆریانت و رەیمەکان و باخچەی گشتی باتووم و ژنە گورجیە جوانەکان و حەمامی گشتی کردووە.

دایکمو پوورمی لەوێ بەجێ هێشتووە. بەجلی کوردیەوەو بەڕیشی درێژەوە، هەر بەو جۆرە لەو دالانەدا وێنەیەك دەگرێ ئەو وێنەیە تائێستایش ماوە.

## چەند دێڕێکی تر سەبارەت بە سەفەرەکەی رەفیق حیلمی لەنامەیەکمدا

لەدەربەندی هەولێر١٣ی تەمموزی ١٩٥٦ئەم چەند دێڕەم لە نامەیەکمدا بۆ خوشکێکم نووسی کاتێ لەگەڵ باوکمو دایکم چووین بۆ (خەلان)و (دەربەندو رواندن)، چونکە پەیوەندیی بەو شارانەوە هەیە کەباوکم پیایاندا چووبوو بۆ ئەنقەرە وەك نوێنەری شێخ مەحمود، بۆ چارەی کێشەی کورد لەگەڵ تورکەکان "پاش وەستان لەرێگەی دەربەندو رواندزو لە چەند جێگەیە نانخواردن لە گەلی عەلی بەگ پاش سەردانی تاڤگەکانی بێخاڵ چووین بۆ دێیەك لەسەر قاراغی دەربەندەکە. خزمێکی دایکم لەناو باغو بێستانی سێوی خۆمانەو قەیسی بەسەر بەرزاییەکەوە کەپری بۆ ئامادە کردبووین بە فەرمانی خوالێخۆشبوو عوسمان فایەق کە بەڕێوەبەری (تەسویە) بوو لەو ناوچەیەدا. ئەو خزمەمان ناوی (مستەفا) بوو برای هونەرمەندی بەناوبانگ رەشۆل بوو لەو نامەیەدا نووسیومە" ئێستا لە ژێر کەپرێکی گەورەداین لەناو باخێکی میوەدا لە دەربەند، نزیك سەیرانگەی حاجی (هۆمەران) لە پارێزگەی هەولێر ئەمە پێنج رۆژە ئێمە منو باوکمو دایکمو... برا بچوکەکەم، لێرەین، رۆژی هەینی لە بەغداوە کەوتینەرێ بۆ کەرکوك ، ئەو رۆژە لەوێ بووین، ئێوارە چووین بۆ هەولێر، شەوێ لەماڵی (مودیری مەعاریف) بەڕێوەبەری پەروەردەی هەولێر دەعوەت بووینو لە داخلی نوستین. بۆ رۆژی دواتر لەبەیانیەوە تا ئێوارە لە ماڵی (گیوموکریانی) بووین، بۆ دوو سبەی بەیانیەکەی بە جێبی مودیری (تەسویە) چووین بۆ رواندز بۆ ماڵی هاوڕێیەکیدێرینی باوکم ناوی (شاکر مجرم)ە(*) ئەمەیش زەمانی خۆی مودیری پۆستەی دەوڵەتی کوردستان بووە، ئیستا هەر لە حاجی تۆفیق (پیرەمێرد) دەچێت، ریشێکی سپی درێژی هێشتۆتەوە، بیست ساڵ لەمەو پێش وازی لە وەزیفە هێناوەو باخێکی میوەی بەقەد شاخێکەوە کڕیوە، بینای تیا کردووە، جۆرەها دار میوەو گوڵی چاندووە، لەوبەر

---

(*) رەفیق حیلمی باسی ئەمەی کردووە لە یاداشتەکانیدا.

شاخەکەشەوە دەغڵو دانو ئاژەڵی هەیە، ئەو شەوە لەوێ بووین. لەسەر شێوازی کۆن گیسکە مەرمەزەیکی بۆ سەربڕین. بووکەکانی بۆیان لێنایین لەگەڵ پلاو، ژنەکەی خەڵکی تورکیایە زۆر ئێسك سووكو پاكوخاوێنە،بیهێنەرە بەرچاوت بووکی لادێییو خەسووی تورکییو پیاوێکی پیری وەك شاکر مجرم، کە باوکی شاعیر بووەو خۆی هەموو شیعرەکانی لەبەر کردووە. بە دیشداشەیەکەوە بە چیچکانەوە لەبەر دەممانا دائەنیشت، شیعری بۆ ئەخوێندینەوە. ژنەکەشی رەسمی براکانیو ژنەکانیانی پیشان ئەداین، هەموویان نۆشدارو دادوەر و باشاواتن. رۆژێکی زۆر بەلەزەتمان لەوێ رابوارد[*] و عەسر چووین بۆ سەر تاڤگەکانی بێخاڵ کە دووهەمە لە دوای نیاگارا بەبۆچوونی من بڕواناکەم چەند تاڤگەیەکی تری وەها هەبن لە جیهاندا. لەسەر تاڤگەکە هەوا ساردو شێدار بوو خەریك بوو لەرزمان لێ بێت! لەو تەممووزەدا، هەر پەتوویەکمان بردبوو بۆ دانیشتن ئەویش دایکم دای بەکۆڵیدا ڕێگەکەی زۆر سەخت بوو بەسەر شاخێکی بەرزدا چووینە خوارەوە، دایکم بە هەزار حاڵ گەیشت، رۆحمان چوبوو لەبەر ئەوەی پەستانی خوێنی هەبوو بەڵام سەلامەت بوو، بەڕاستی دایکم زۆر سەیرە لە بەغدا هەنگاوێك نەدەڕۆیشت کەچی لەکوردستان وەك لە ئەشکەوتەکەی (قادیشیا) لە لوبنان ماوەیەکی زۆر دور رۆی سەرباقی ئەوەیش بەسەر ئەو شاخە بەرزەدا هاتە خوارێو سەرکەوتەوە. ئەمە سەبارەت بەلا خۆشەکەی سەفەرەکە. بێینە سەر ناخۆشییەکەی، ئەو شەوە لە ڕووی تۆ بە دوور بێت سکم کەوتە ئێشو ئازاروسکچوون ، وەخت بوو بمرم! کاری شاکر مجرم راست بێت حەبێکی دامێ تۆزێك چاك بووم ، شەوێ لەسەر بانیژەیەك نووستین. قەروێڵەو جێگایەکی پاكو جوان بە ئۆرتی سپی وئتووکراو.. شاکر مجرم ئێوارە بانگی کردمە خوارێ "وەرە بزانم لە ئەمەریکا (ئعجوبەی) وات دیوە! لەبەر هەیوانەکەدا لە خوارەوە دانیشتبوو لەگەڵ باوکم، کە چووم وتی سەیری ئەو خونچە زەردەبکە، تۆزێك دیقەتم دا دووجار خونچەکە شنەشنی کرد لەپڕ وەك پەرەشووت کرایەوە هەرچوار پەلی کردەوە بووبە گوڵێکی چوار پەل، هەروەها خونچە بە خونچە لەپڕ ئەکرانەوە. ئەم زیارەتە زۆر بە سوود بوو،چونکە یەکێکمان ناسی لە برنادشۆ دەچوو، هەروەها باوکم تۆزێك

---

[*] من ئەم نامەیەم سالی ١٩٥٦ نووسیوە وەك باوکمو ئامۆژگارییەکانی وردەکاری سەفەرەکەم نووسیوەتەوە

چاویکرایەوە، چونکە لە سەرەتادا دایکم خۆی لە عەباوە پێچابوو، ئەویش ئیشارەتێکی کردین وتی بچینە ئەو پەنایە، بەڵام ژنەکەی شاکر مجرم گوێی نەدایە کەوتە هاتووچۆ بە ناویاناو خواوراستانیش کوڕەکانیشی ماوەیان نەدایە، بە تایبەتی گەورەکەیان هەروەها کەوتە هاتووچۆو چای بۆ دەهێناینو بەسەربەستی گفتوگۆی لەگەڵ دەکردین. ناچار باوکم پەتی پچڕی وردە وردە تێکەڵاو دانیشتین. سێیەم سوود میوەیەکی زۆری بەتامماں خوارد لەو باخە خۆشەیان بەیانی بەرەو دەربەندی حاجی هۆمەران. کەوتینەڕێ وا ئیستا لێرەین وەك وتم، هاژە هاژی ئاوی چەمەکە مێشکی پڕ کردووین، چەمێکی گەورەیە بەسەر بەردەکاندا دێتە خوڕێ. بنی سەوزو سەری کەفی سپی ئەکات، بەنێوان دار چنارو هەنارو توو و گوێژدا، هاژە هاژ ئەڕوات. دەربەند خۆی سێ شاخە، دوو (مەفرەقی) هەیە یەکێکیان بەسەعاتێ ئەتبات بۆ حاجی هۆمەران ئەوی تری ڕێگەی باشی نیە وا بزانم ئەچێت بۆ هەندێ لە گوندەکان.

لەم دەربەندەدا چەند ماڵێکی قوڕی لادێیی هەیە لەسەر ئاوەکە بەسەر گردێکەوە. لەسەر ڕێگاکەش چایخانەو چێشتخانەو ئوتێلێکی (لا باسبە) هەیە ئەمەیش هەمووی لەگەڵ زۆرتر باخ و باخاتو کێڵگەی ئەم هەرێمە موڵکی مستەفای برای ڕەشۆڵی گۆرانیبێژن کە کوڕی دولبەرخانە. تەنانەت ئەم باخەش موڵکی ئەوە، ئەم ساباتو خێوەتانەی بۆ ماڵی ڕەئیسی تەسویە تیا هەڵداوە، کە پاش جەژن بەتەمایە بێت، دوو سێ ڕۆژ بوو هاتبووین لەپڕ نیوەڕۆیەك ماڵی دکتۆر ئەورەحمان کە ئیستا بەرپرسی تەندروستیە لە هەولێر سەریانکرد بە ژوورا . ئەوانیش خواو ڕاستان دیسان ڕێگەی باوکمیاننەدا منو دایکم بخاتە شوێنی پەناو شاردراوەوە. لوتفیە خانی خێزانی یەکسەر بێ عەبا بەرامبەر بە باوکم دانیشتو کەوتە گفتوگۆ، باوکم چاری نەما ئامارەی کرد دانیشم..ئەوان بە ئۆتۆمبێلی خۆیان چوون بۆ حاجی هۆمەران. لەوەشدا باوکم قایل بوو منو برا بچووکەکەشم لە گەڵیان بچین. حاجی هۆمەران زۆر ساردە، تەنها دووسێ ماڵێكو دوو چایخانەی ساکارو میوانخانەیەکی تازەی لێیە کە لێرە لە عەزرەتا پێی دەڵێن (قەسر)، لەوێ هەندێك نوکتەی بۆ گێڕاینەوەو کۆکاو شتمان خواردەوەو گەڕاینەوە، ژێر ساباتەکەمان، شەوێ لەوێ نووستین بەیانی وەك ئێوارە پێکەوە

نانمانخوارد، دایکم لە دوورەوە هاواری کرد کوڕە بە مستەفا بڵێ پارەیان لێ وەرنەگرێ. تومەز گوێی لێ نەبووبوو پارەی خۆشیان و ئێمەیشیان دابوویە دەعوەتی ئەو شەوەش.

ڕەنگە ئیستا کە ئەمە دەخوێنیتەوە بەغیلیمان پێ بەریت! بەراستی ئەگەر وا تەصور بکەیت پێش ئەوەی پاشماوەی ئەمەت بۆبنووسم و باوکمان لەگەڵە، ڕەنگە مەرەکەبی قەڵەمەکەم ببڕێتەوەو شەنگترین ڕووداوت بۆ نەگێڕمەوە. باوکم مەرەکەبی لەسەر مێزەکەی داناوە (مذکرات)(یاداشتی) کۆنی ئەنووسێتەوە.

پێرێ بەیانی کە ماڵی دکتۆر ڕۆیشتنەوە پاش زۆر چەندو چوون و سەوداو موعامەلە بە پاسێکی شکاوی لەق ولۆق لە گەڵ چەند گوندنشینێك و بارێ شووتی کەوتینەڕێ حەرەکەتمان کرد بۆ حاجی هۆمەران تومەز لەگەڵ ماڵی دکتۆردا هیچمان نەبینیوو، مستەفا بردینی بۆ سەر ئاوێك بەچوار بۆریی ئەستووردا وەك تەرزە ئەهاتە خوارێ. حەوزێکی گەورەی خۆش لە ژێر دار گوێزو تودا هەر وەك باخچەو حەوزو ئاوی کۆشکی خەلیفەکان، لەوێ هەندێك دانیشتین بە ئۆتیلەکەشدا گەڕاین هاتینەوە سەر ڕێگەکەی خۆمان و لەدێی (خەلان) لاماندا. باوکم لە تەکیەی شێخی دێکە (شێخ عەبدڵلا)[*] دابەزیو ئێمە بەرەوە حەریم تەشریفمان برد. لەو دێ بچووکەدا تاقمی مۆبیلیاو کەلوپەلی تازەباو لە ژووری میواندا دەبینران کابرا گەورەترین شێخ بوو لەو هەرێمەدا، تەنانەت لە ئێرانیشەوە دەروێش و موریدی هەبوون و دەهاتنە لای بۆ پێشکەش کردنی ڕێزو تاعەت هەر ئێمە لە ڕێگەکە دوو سێ ژن و پیاومان بە قافڵەی ولاخ پێ گەیشت، تەنانەت وینەشم گرتن، لە دوای ئێمە هاتن بۆ حەرەمسەرای شێخ. یەك وێنە بوو زۆر پێکەنین هێن ئەم ژنە سەیرو سەمەرانە بە گویزو گوڵنکەو بەبەرگی جۆراو جۆرەوە ئەهاتن و ئەم لاو ئەو لای ئەو کچە فەقیرانەیان ماچ ئەکرد. چاوم لێبوو لە ژێرەوە لاجانیان بە فەقیانەکانیان دەسڕی. هەرچەند لە لادێدا گەورە بوون بەڵام زۆر بەزەوق بوون شێوازی پێشوازییان دەزانی ماڵەکەیان وەك مۆزەخانە وابوو هەرچی بیانیش هەبوو دەهاتن بۆ سەیرو سەردانیان لەبەر ئەوەی زانیاریان هەبوو بەغداشیان بینیبوو خەڵکیشیان دەناسی. بەناو باخەکاندا گەڕاندمیان پڕبوو لە میوە دواتر

---

[*] وا بزانم ئەم شێخ عەبدوڵلا یە ئەوە بوو کە ڕەفیق حیلمی باسی میوانداریی بە وێڵ و پیاوچاکی کردووە لە سەفەرەکەیدا بۆ ئەنقەرە (یاداشتی ٧).

قاوەڵتیمانکردو لە هەمووی سەیرتر ژنێکی قەڵەوی دان زێڕین هات لەگەڵ منداڵێکی (١١)ساڵدا کەکوڕێکی سپی بوو سەبەتەیەك مشکیی ریشوداریی بەسەرەوە جگەرەی بە دارجگەرە دەکێشا ژنە وتی ئەمە کوڕمەو شوکر تازە ژنیشم بۆ مارە کردووە، بە جارێك هەموو دامانە قاقای پێکەنین. وامانزانی گاڵتە دەکات کەچی بەڕاستی بوو، دایکم زۆر لەگەڵی خەریك بوو وتی ئەمە باش نیە وا زوو ژنی بۆبهێنیت وتی چی بکەم کە مردم با یەکێك هەبێت لەگەڵی بنوێت!

لەوێ دانیشتین دەستە دەستە نموونەی سەیرو سەمەرە دەهاتن، پاش کەوش داکەنن و لا ڕومەت ماچ کردن ،لەبەر دەمی کورسییەکان لەسەر زەوی بە ترسێکەوە دادەنیشتن. سەیری ئەو کچە جوان و گەنج و ئێسك سوکانەیاندەکرد! وایاندەزانی ئەمانە پەرین، نەیاندەزانی ئەمانە کەمێك لەمەوپێش بەسەرسوڕمانەوە باسی ئەمانەیان بۆ دەکردین و ئەیان وت باوکیان خەریکە لە بەغدا خانوویان بۆ بگرێت یان بکڕێت تا لەوێ بژین. دەستە دەستەش ئیشکەر دەهاتن و دەچوون، خۆ چا هەر لە پیاڵەی زیودا دەگێڕدراو هەر پیاڵەیە بەجیا لەسەر سینیەکی زیوی بە مینای ئێرانی دەگەڕا. دایکی چوار کچەکە ژنێکی قەڵەوی خڕو خەپان بوو، بەقۆچکەی سپی و کۆڵوانەی ئاوریشمی سپی و کراسی نازنازو کەوای توێکڵە پیازەوە دەدوانزە جار لەسەر یەك وتی یاخوا بەخێربێن. قۆچکەکەی هەموو قۆزاخەو گوڵ و گوڵوانکەکەی لە زێڕبوو، ئینجا چوو نان تێبکات. هەر دیار نەبوو وتمان ئەرێ دایکتان چی لێهات؟ وتیان تا ئێوارە لێنابێتەوە. پرسیمان بۆچی؟ وتیان دەبێت شیوی چەند سەد کەسێك بدات! پیاوان و میوانی ناو باغ و میوانی ئێرانیی و دەروێشانی مزگەوت و میوانی سابڵاغ و سنەو لادێکان، ئیتر دایکەمان نەبینیەوە. هەروەها سەیری ئەم سینەمایەم دەکرد کە لەپڕ کوڕێکی شێخ هات وتی فەرموون لەگەڵما وتی: باوکت بانگتان ئەکات تا بچن بۆ ناوباخ بەناو تەکیەداو بەبەردەمی شێخ و هەموو ئەو پیاوانەدا ئێمەی برد بۆ لای باوکم، لەوبەر لەسەر ئاوێك لەژێر دار گوێزێکدا دۆشەك و کورسیان دانابوو. ئەمە بە تایبەتی بۆ ئێمە ڕێکخرابوو باوکم پاڵی دابۆوەو جارجارێك سەری بۆ لای دایکم وەردەگێڕا. وابزانم بیری کاتی گەنجێتی دەکردەوە کە ئاوا ژیاوە، بە شۆفێرەکەی وت تۆ بڕۆرەوە. قەمەرەیەکیش هەبوو بەویشمان وت تۆش بچۆ بۆ دێیەکە. یەك دوانێکی تری تێبخەو سەرمان لێبدەرەوە نەك بڕۆین، شێخ و کوڕەکانی وتیانە هەر ئەبێ بمێننەوە. باوکیشم دوو دڵ بوو، عەجەبا شەوێ لەوێ ئیسراحەتی لێ تێك ناچێت؟ ئێمەیش وتمان چاکترە بگەڕێینەوە، منیش لەو باخە بێ هاوتایەدا چی بکەم؟ دار قەیسی بەتەن هێشووە قەیسی گەورەی نایابی

پیاداهاتبووه خوارەوه لەگەڵ سێودا کەوتمە پیاسە لە ناویدا باخەکە کۆتایی نەبوو، لەپڕ گـوێم لـەدەنگی ئۆتۆمبێـل بـوو. قەمەرەکـە بـوو، بـەرەو حەوزەکـە گەڕامـەوە، بەسـەر گردەکەدا، بەناو دارەکاندا، لەپڕ لەپشت دارێکەوە گوێم لێبوو باوکم بە دەنگێکی ئێجگار بەرز بانگم دەکات. سەرم سوڕما بۆ وا توڕەیە ؟! ئیستایش نەمزانی باوکم ئەو کاتە بۆچی وا توڕەو پەست بوو؟! دوا بەدوای ڕۆیشتم، دەیبۆڵاند . تەنانەت باخەوانەکەش حەپەسابوو هاواریدەکرد لەکوێ بووی؟ دیارە لە دوورەوە بانگی کردووم گوێم لێنەبووە ترساوە شتێکم لێ بەسەرهاتبێ ،وتی چیت لێهات بۆ ئەوەندەت پێچوو؟ وتم پیاسەم دەکرد بەناو دارەکاندا لەبەر چاوی خۆت ڕۆیشتمو باخەکە ئەوەتا چۆڵە کەسی لێ نیە. برا بچوکەکەشم لەوێ نەبوو ئەویش بەستەزمانە هەروەك من بەناو دارەکاندا گەڕابوو، باوکم ترسابوو شتێکمان بەسەر بێت ئەو خەڵکەی بە ناویانا ڕۆیشتین حەپەسابوون لە تووڕەیی باوکم.

کوڕەکانی شێخ بە ئومێدی ئەوەی باوکم قایل بێت بمێنێتەوە ئوتۆمبیلەکەیان ئیزن دابوو، ناچار معاونێك لەوێ جیبەکەی خۆی بۆ ئامادە کردین. شێخ لە غەڵبە غەڵبەکە لەخەو هەستاو بە نەزاکەتەوە وتی ئەوە عاجزبوویت؟ حەزم دەکرد چەند شەوێك لامان بمێنیتەوە. لەداخی خۆمان هۆشمان نەبووماڵئاوایی لە کەس بکەین، تا گەیشتین باوکم هەر توڕەبوو، تا شوفێرەکە وتی با تووشی موقەدەرێك نەبین، بێ دەنگ بوو کەچی بەیانی دەیویست هەستین بەپێکەنینو خۆشی نانی لەگەڵ بخۆین!

دایکم لەژێر دار سێوەکاندا چای بۆ لێناینو خواردمان ئینجا میوانمان هات. تا نیوەڕۆ لە گەڵیاندا بووین لەو دیمەنە جوانەدا باوکیشم هەر خەریکی نووسینەوەی یاداشتەکانی بوو ئەمەیش چەند لاپەڕەیەکی ترە لە ژیانو هەڵسوکەوتی ڕەفیق حیلمی. کاتێ توڕە دەبوو، دەبوو بە ئاگرو کاتی ئارامییش لە خۆی چاکترو بەهەستو میهرەبانتر هەر نەبوو. بێگومان شتێك هەبوو کە باوکمی لەو کاتەدا وا شپرزە کردبوو. ئەو شتە چی بوو ئەوە ئێمە تائێستاش هەر نەمانزانی چییە !

پێداچوونەوەی کەژاڵ ئەحمەد

وێنەی هاوکاریکردنی لێقەوماوانی لافاوی سلێمانی

ئەحمەد موراد- کامەران موکری- مستەفا ساڵح کەریم- مستەفا فەقێ رەشید- رەفیق حلمی

بەشیر موشیر – ڕەفیق حلمی
لەدوکانی بەشیر موشیر

رەفیق حلمی- شەفیق سالّح برای

رەفیق حلمی لەگەڵ نجێبیدا بەجلی کوردییەوە

رەفیق حلمی و یەکێك لەهاوڕێکانی بەناوی محمود

## ناوەڕۆک


| بەشی یەکەم | ژیانی تایبەتی ڕەفیق حیلمی<br><br>١-سوودی نووسینەوەی یاداشت<br><br>٢-درەختی هەمزە ئاغای مسرەف و ڕەفیق حیلمی و خێزانەکەی.<br>٣-ڕەفیق حیلمی و خێزانەکەی بە پێی درەختی خێزانیی.<br><br>٤-کەسوکاری ڕەفیق حیلمی<br>٥-ژیانی تایبەتی ڕەفیق حیلمی بەپێی ساڵ و تەمەن.<br>٦-خوێندنی،مامۆستاکانی،هاوپۆلەکانی، هاوڕێکانی.<br>٧- لەدەفتەری یادنامەی منداڵیدا.<br>٨- وێنەیەکی ساکار لەژیانی تایبەتی لە سلێمانی.<br>٩- ژیانی خۆی و خێزانی لە کەرکوک.<br>١٠- لەهەولێر<br>١١- لەناسرییە<br>١٢- لەموسڵ<br>١٣- لەبەسرە<br>١٤- بەسەرهاتێکی سەیر لەسلێمانی.<br>١٥- لەناسۆرییەکانی گواستنەوەی لەم شار بۆ ئەو شار. |
|---|---|

## ناوەرۆك


١٦- چۆن خانوومان كرد تا لە كرێچێتی دەربچین.

١٧- لەبەغدا

١٨-جەنگی (رشيد عالی الگیلانی)

١٩- دەفتەری سێهەم.

٢٠- بوو بەموفەتیشی مەعاریفی کەرکوك‌و سلێمانی.

٢١- چۆنێتی گواستنەوەی لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر

٢٢- بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردە لە دیالە.

٢٣- لەعەممارە(میسان)

٢٤- سەرگوزشتەی هەڵبژاردنی.

٢٥-نموونەی یادنامەکانی رۆژانەی.

٢٦- بەغدا پێش شۆڕشی تموز ١٩٥٢-١٩٥٨

٢٧- هێرشی‌سێ قۆڵیی بۆسەر میسر.

٢٨- لە کوێت لەگەڵ وەفدی یەکێتی ئەدیبانی عیراق.

٢٩- پاش شۆڕشی تەممووزو پێش کۆچی دوایی.

٣٠- جمیلەخانی هاوسەری رەفیق حیلمی.

٣١- دایکم‌و باوکم ئێمەیان بەجێ هێشت.

٣٢- چالاکییەکانی رەفیق حیلمی لەکاری میریدا.

| | |
|---|---|
| بەشی دووەم | ٣٣- ژیانی سیاسی رەفیق حیلمی<br>٣٤- قۆناغی یەکەم<br>لاوێتی و شیعری دڵداریی.<br><br>٣٥- قۆناغی دووەم<br>خەباتی و شیعری سیاسی.<br>٣٦-قۆناغی سێیەم<br>سەردەمی شێخی نەمرو خەباتی نەتەوەیی.<br>٣٧- ژیانی سیاسی رەفیق حیلمی.<br>٣٨- ئاشنابوونی بە شێخ مەحمودی نەمر.<br>٣٩-شێخ مەحمود پێش حوکمدارێتی.<br><br>٤٠- چۆنێتی دامەزراندنی حوکمدارێتی یەکەمی شێخ.<br>٤١- پەیوەندیی رەفیق حیلمی بەئینگلیزەوە.<br>٤٢- سەرەتای شۆڕشی شێخ.<br>٤٣-گیرانی رەفیق حیلمی.<br>٤٤- بەربوونی لەبەندینخانە.<br>٤٥- سلێمانی پێش شکانی شێخ.<br>٤٦- مەجلیسی ئیدارەی هەرێمی سلێمانی.<br>٤٧- بەرەو بەغدا.<br>٤٨- رەفیق حیلمی و حەمدی بەگی بابان و کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد.<br>٤٩- ویستویەتی قیرائەتخانە بکاتەوە.<br>٥٠- مامۆستای قوتابخانەی ظفر لە کەرکوک. |

٥١- كورتـه باسـی هـەرێمی سـلێمانی پـێش گەڕانەوەی شێخ لەهندستان.
٥٢- کۆمەڵەی کوردستان.
٥٣- جەمعیەتی کوردستان.
٥٤- گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی.
٥٥-کارەکانی لەسەردەمی حوکمی دووەمی شێخ دا.
٥٦-ڕۆژی هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی.
٥٧-بەشی دووەم
قۆناغی چوارەم
ڕەفیق حیلمی نوێنەری شێخ محمود لە ئەنقەرە.
٥٨- گفتوگۆی نهێنی پاش نیوە شەو.
٥٩-مەبەستی شێخ و سمکۆ لەگفتوگۆنهێنیەکە.
٦٠-چوونی بۆ ئەنقەرە .
٦١-ڕێگەی سەفەرەکەی بۆ ئەنقەرە.
٦٢-ڕێگەی گەڕانەوە.
٦٣- نامەی ڕەشید جەودەت.
٦٤-چەند دێڕێکی‌تر سەبارەت بەسەفەرەکەی بۆ ئەنقەرە لەنامەیەکمدا.

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٥ی

## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٠١ | بەئاشتی کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٣٠٢ | پیاسەیەك بەکووچەکانی قەدەردا | ئاوێزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٣٠٤ | دەنگی بلووریی دەق | عەبدولخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٠٥ | رۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٠٧ | دوورگەی بێداری | تەها ئەحمەد رەسوڵ | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٠٨ | داستانی خەبات و مڵناوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٠٩ | ماچی گوڵشەنو کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد هیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣١٠ | شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ | عەبدولقادر ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١١ | کورد لەچەند تۆمارێکی مێژوویدا | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣١٢ | فەرهەنگی کورد ناسین | مەلا عەبدولخالق شوانی | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٣١٣ | شیخ محمد خال مفسرا | عمر علی محمد | ماجستێرنامە | چاپکردن |
| ٣١٤ | دیوانی مەزڵوم | ئا/ ئومێد کاکە رەش | دیوانی شیعر | چاپکردن |
| ٣١٥ | دیوانی فۆلکلۆری ناوچەی ئەردەڵان | ئا/ح. موسەنن | فۆلکلۆر | چاپکردن |
| ٣١٦ | ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجییەکان | محەمەد رەئوف ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١٧ | کێشە نەتەوەییەکان و رووداوە سیاسیەکانی کوردستان و جیهان | د. کەمال مەعروف | لێکۆڵینەوەی سیاسی | چاپکردن |
| ٣١٨ | تلۆپەی ئەو شیعرانەی فڕیان رەنگ و چاویان شینە | جەبار سابیر | شیعر | چاپکردن |
| ٣١٩ | ئاخاوتنی هەنووکەیی | هەڵکەوت عەبدوڵڵا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٢٠ | کورد لەزەردەشتییەوە بۆ ئیسلام | سامان عوسمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٢١ | رۆژنامەڤان | فەرەیدون سامان | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٣٢٢ | بیرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی | فوئادی تاهیر سادق | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٢٣ | بیبلۆگرافیای چاپکراوەکانی ب. گ. چاپ و بڵاوکردنەوە | ئا: جەبار سابیر | بیبلۆگرافیای | چاپکردن |
| ٣٢٤ | چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد | کامەران بابان زادە | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٢٥ | سەلیقەی زمانەوانی.. | د.حسین محەمەد عەزیز | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٢٦ | چەپکە گوڵ | کاوە فەقێ زادە | هونەری | چاپکردن |
| ٣٢٧ | مڕو بولبول | ئا: جەلال محەمەد مستەفا کوردی | بەرهەمەکانی محەمەد مستەفا کوردی | چاپکردن |
| ٣٢٨ | ناوچەی پێنجوێن لەناوێنەی رۆژگاردا | ئەحمەد محەمەد عەلی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٢٩ | فردەوسی ئەمتومان | دڵشاد مستەفا | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٣٠ | غوربەتی فڕین | ئاسۆ جەبار | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٣١ | سەربردەی بانەو بەر بناری سوورکێو | محەمەد خوسرەوی | مێژوویی | چاپکردن |

| ٣٣٢ | بەشێك لەبیرەوەرییە تاڵو شیرینەكانی ژیانم | سەید عەلی رەحمانی | بیرەوەری | چاپكردن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٣٣٣ | عصیەتو تیوری دەوڵەت لەبیری ئبن خەلدوندا | ئەلیرت عیسا | لێكۆڵینەوە | چاپكردن |
| ٣٣٤ | من طوبخانة الى عرعر | عارف قوربانی | رامیاری | چاپكردن |
| ٣٣٥ | پوختەیەك لەمێژووی گەورە زلێزی جیهانی | لوقمان خەیاڵی | مێژوویی | چاپكردن |
| ٣٣٦ | هەڵوێست | شێخ عەبدول | چیرۆك | چاپكردن |
| ٣٣٧ | شێواز لەكورتە چیرۆكی كوردیدا | سەلیم رەشید | ئەدەبی | چاپكردن |
| ٣٣٨ | دوژمنی گەلو مێگەلیزم | شێرزاد حەسەن | ١٧ وتاری شانۆیی | چاپكردن |
| ٣٣٩ | چلەی داربەڕووەكەی نیشتمان | ئا.ب.گ. چاپو بلاَوكردنەوە | رێزلێنان | چاپكردن |
| ٣٤٠ | شەهید بەتەنیا پیاسە دەكات | قوبادی جەلی زادە | شیعر | چاپكردن |
| ٣٤١ | محاسەبەی نیابەت | ئا: ئەحمەد حسێن | كۆمەلاَیەتی | چاپكردن |

